301

# حەفتاو شەش ساڵ ژیان
# پەنجاو نۆ ساڵ تێکۆشان



## بیرەوەرییەکانی خەبات مەلا حەسەن

فەتاح تۆفیق فەتاح

چاپی یەکەم

هەولێر - ٢٠٠٨

# حەفتاو شەش ساڵ ژیان

# پەنجاو نۆ سال تێکۆشان

# (بیرەوەریەکانی خەباتی مەلا حەسەن)




فەتاح تۆفیق فەتاح

وەزارەتی رۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپکردن و بڵاوکردنەوە

- حەفتاوشەش ساڵ ژیان و پەنجاو نۆساڵ تێکۆشان/ بیرەوەریەکانی خەباتی مەلا حەسەن.

- نووسینی: فەتاح تۆفیق فەتاح

- چاپ: یەکەم ٢٠٠٨

- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٧٣٧) ساڵی (٢٠٠٨)ی پێدراوە.

- نەخشەسازی ناوەرۆك: محەمەد زەنگەنە – نیان جەمال.

- پیت چنین: ئاری ئەحمەد – نەورۆز جەمال – سامی عەلی.

نەخشەسازی بەرگ: شێروان فاروق.

- چاپ: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری – هەولێر.

تیراژ: ٥٠٠ دانە

- نرخ: ٢٠٠٠ دینار

من کەناوم فتاح تۆفیق فتاح عبداللە یە بە مەلاحەسەن ناسراوم باپیرە گەورەم یەکێك لە پیاوە ناسراوەکانی ڕەواندوز بووە. ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی ئەم شارەبووە. هەرچەندە ناوی ئاغابوە، بەلاّم خاوەن موڵکێکی مامناوەندی بوە. هیچ کەس باسی ئەوەی نەکردوە کە وەکو ئاغا ئازاری خەلکی دابێت، یاخەلکی هەژاری چەوساندبێتەوە. بەلکو ژیانی بەزوری لە سەر گواستنەوەی کەل وپەل بووە لە نیوان ڕەواندوز و موسل ومهابات. چەند ئیسترێکی هەبووە، کە ئەو کاتە پیان دەگوت قافلە(کاروان) لە هەمان کات باپیریشم فتاح هەر بەم شێوەیە ژیانی بەسەر بردووە. فەتاحی باپیرم کە تەنیا کوری عەولاّغابووە. لەگەل خوشکیکی ، دوو کوڕو دووکچی بۆماوە. کە باوکم و محمد امینی مامم و دوو پورم بوون کاك سەید مەولود بێخاڵ و تاریق جانباز لە پەرتووکەکەیان لە بارەی میژووی شاری ڕەواندوز ناوی بنەمالەی (عەولاّ غا) ی وەکو بنەمالەیەکی کۆن وناسراوی ڕەواندوزیان تومارکردوە٠ باوکم تۆفیق تاسنوریکی هەست پێکراو کابرایەکی زەحمەت کیش بووە. بەدەستی خوی جووت و سەپانی کردوە. دایکم کچی پیاوێکی زەحمەت کێشی شارەکە بووە. بەناوی سلێمانە خوار. زۆر یارمەتی باوکمی لە ئیش و کارەکاندا دەدا ناوی زلیخا بوو. لە ساڵی /١٩٣٢ لە شاری ڕەواندوز لە دایك بووم. لە کاتێکدا کە بارو دۆخی شارەکە نەختی هێمن ببوەوە. چونکە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە شارەکە بە هەل و مەرجێکی سەختدا تیپەریوە، کە دواتر نەختێ باسی ئەکەم. لە بەر ئەوەی باوکم پیشەی جوتیاری هەلبژاردوو ماوەیەك ماڵمان. لە گوندێکی بچووکی نزیك ڕەواندوز بوو. بەم هویەش یەك دووساڵ لە خویندن دوا کەوتم.

خویندنی سەرەتایم لە ڕەواندوز تەواو کرد، لە بەر ئەوەی باوکم توانای نەبوو لە سەر حیسابی خۆم لە هەولێر بخوێنم ساڵێك بەبێ کاری سوڕامەوە سالی دوایی بە ناچاری داوام کرد کە لە خانەی ماموستایانی لادێی وەربگیرێم. کە ئەوکاتە ماوەی خوێندن لەم خانەیە پێنج ساڵ بوو. لە ساڵی خویندنی ١٩٤٧- ١٩٤٨ لە و خانەیە وەرگیرام. دوای دەرچوونم بە ماموستا دامەزرام یەکەم جار لە ناحیە دیبەگە بوو.

شاری رەواندوز هەرچەندە شاریکی کۆنـە و پـێش دامەزرانـدنی مـیر نـشینی سۆران ئاوەدان بووە. بەلام لەو سەردەمەدا زۆر گەورە بوە، جونکە ماویـەك مەلبەنـدی مـیر نوشینی سۆران بـوو . بـە تایبـەتی لـە سـەردەمی (کـۆر پاشا) پاشـای گـەورە. میـژوو نووسـانی ئـەم میرنـشینە نوسـیویانە کـە ژمـاردی دانیـشتوانی رەوانـدوز (٢٠٠٠) دوو هەزار ماڵ بووە. کە ئەو کات کەم شار ئەوەندە ماڵەی لێی ژیاوە. شایانی باسە کە لـە سـەردەمی پاشـای گـەورە لـە رەوانـدوز کارگـەی دروسـت کردنـی تفـەنگ و دەمانجـەو تەنانەت توپیـشی هـەبووە. بـە سەرپەرشـتی وەسـتا رەجـب کـە پیـاویکی کارامـەبوە. هـەروەها هونـەری بیناسـازی و پـرد دروسـت کـردن زۆر پیـشکەوتووە بـووەو، لـە سەردەسـتی وەسـتای ناسـراو وەسـتا برایمـی مـاویلی هەنـدی پـردی ئـەو سـەردەم تـا ئیستاش هەر ماون لە مانە پردی گوندی بەرسیرین کە دەکەویتە سەر ریگای سۆران – حـاجی ئومـەران.دیـارە لـەو سـەردەمەدا، تەنانـەت دوای داگـیر کردنـەوەی رەواندوزیش لە لایەن دەولەتی عوسمانیەوە، هەر شارێکی ناسـراو مەڵبەنـدی روشـن بیری بووە. د. کمال مظهر دەنووسی لە سـەرزاری رۆژنامـەی (زورا ء) کـە یەکـەمین رۆژنامەی ئیراقی بووە(سالی رابردوو بـە شـدارانی رۆژنامەکـەمان لـە قـەزای رەوانـدز بریتی بوە لە یازدەزات ومال ئیمسالێش هەژدە زاتی تر بەشدا بوون، واتە ئیستا لـەم قەزا یەبیست و نۆ کەس کریاری زەوران. د.مظهر پیوایە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کـە دروست بوونی تویکلی دەستەی روناك بیری نوێی ئەم ناوچەیە دەگەریتەوە ناوەندی سـەدەی نۆزدەیـەم، بـەلاّم دوای روخانـدنی مـیر نـشینی سـۆڕان لـە لایـەن دەوڵـەتی عوسمانی وە رەواندز راستەوخۆ لـە لایـەن ئـەم دەوڵەتـە ستەمکاردا بـەرێوە ئـەبرا. سەرەتا وەکو مەڵبەندی پاریزگا چاوی لێکـرا، دوای کـرا بـە قـەزاو سـەر بـە کـەرکوك بـوو، کـە ئەوسـا هـەولیر وکۆیـەش هـەر قـەزا بـوون سـەر بـەم پاریزگایـە بـوون. بـە داخەوە ئیستا کراوە بە ناحیە لە لایەن حکومەتی دیکتاتوری بە عسەوە. حکومـەتی کوردسـتانیش هـەر بـە ناحیـەی هیـشتۆتەودو هـیچ حیـسابێکی بـو ئـەو شـارە نەکردوە.کە پایتەختی میر نشینیکی هەرە گەورەی کوردستان بووە.

رەوانـدز تا ساڵی/١٩٨٠ ش هەر مەڵبەنـدی قەزا بو بەلاَم رژێمی سەدام بۆ وون کردنـی نـاو بـانگی ئـەم شـارە و سـڕینەوەی مێـژوو شارسـتانیەتی گـەلی کوردسـتان شـارو شارۆچـکەیەکی لـە دەشـتی دیانـا دروسـت کـرد و نـاوی نـا (صـدیق) و کـردی بـە مەڵبەندی قەزاو رەواندوزیشی کرد بە ناحیە. پـێش روخانـدنی مـیر نـشینی سـۆران ناوچەکە لە روی ئابووریەوە وەکو ناووچەیەکی (ئـابوری سروشـتی) وابـوو زۆربـەی هەرە زۆری پیداویستیەکانی ژیان لە ناوچەکە خۆی دەست دەکەوت، جگە لە هەنـدێ پێداویستی پیشەسازی وەکو شەکرو قومـاش و نـەوت نـەبێ کـە لـە دەرەوە دەهینـرا. وەکو پیشتر ئاماژەم بۆ کرد بیجگە لە مەش رەوانـدوز کەوتوتە سەر رێگـای بازرگـانی موسل – مهابات بە شێك لە خەلکی شارەکە، کاریان گواستنەوەی کەل و پەل بـوو لـە نێوان ئەم دوو شارەدا دەتوانین بڵێین کە هەل و مەرجی شارەکە ئاسایی بو تـا بـەرپا بـوونی جـەنگی یەکـەم لـە سـالی ١٩١٤ دا. لـە و جەنگـە وەکـو ئاشـکرایە دەوڵـەتی عوسمانیش بە شداری کـرد ، بـووە لایـەنگری ئـەلمانیا بـەم هویـەوە هـەرجی گـەنجی کوردستان بوو لە ناو یشیان گەنجەکانی رەوانـدوز بـۆ سـەربازی راپـێچ کـران. ئەمـە ویرای تالآن کردنـی زوربـەی دانەویڵـەی کوردسـتان، بـەبیانوی نـاردنی بـۆ بـەرەکانی جەنگ.شایانی باسە کە بە هاری /١٩١٦ هیـزی گـەورەی لـە شـکری روسـیای تـزاری لـە ئیرانـەوە هیرشـیان هینایـە سـەر رەوانـدز و داگیریـان کـردو هـەمو خـان وبـەرەی شاردەکەیان سوتاندو زیانیکی گەورەیان بـە دانیـشتوانی شـارەکە گەیانـد. بـەلام دوای ماوەیـەك دەوڵـەتی عوسمـانی هیزیکـی نـارد بـەهاو کـاری خێڵـەکانی دەوروبـەری رەواندوز توانیان لەشـکری روسـیا دەربکـەن. دوای ئەمـە خـەڵکی شـارەکە گەرانـەوەو شارەکەیان ئاوەدان کردەوە.بە هوی ئەم گرفتانەی باسم کردن ، هەر لە ساڵی کوتـایی هـاتنی جـەنگی جیهـانی یەکەمـەوە سـالی/١٩١٧ – ١٩١٨ قـاتی و قرییـەکی زۆر قـورس ناوچـەی رەوانـدوزی گرتـەوە، تـەنیا مـلا ممـدوح ئامـاژەی پێـی کـردوە. ئـەم گرانیـە کارەساتێکی زۆر گەورەی بـە سـەر دانیـشتوانی شـارەکەو دەوروبـەری داهینـا کـە بـوە هوکاری مـردن و دەربـەدەر بـونی دەیـان خیزانـی ئـەم شـارە. ئـەو بەلایـەی بـە سـەر

شارەكە داهات، هەر بەمە كوتايي نەهات بەلكو سالّی دواى قات و قڕيەكە، نەخۆشی ڕشانەوە (كوليرا) لە ناو دانيشتوانی شارەكەدا بلاو بودوە. وەكو باوكم بوى باسی كردوم خەلكی شارەكەلە ڕۆژانی بلاو بونەوەى ڕشانەوە، دەبوونە دوو بەش بە شێكيان خەريكی گۆر هەلكەندنبوون، بەشەكەى ديكەشيان مردوكانيان ئەگواستەوە بۆ گۆڕستان. ژمارەى مردودكان بە نەخوشی ڕشانەوە زۆر پتر بوون لە وانەى بە هۆى قات و قرى سالّ پيشو گيانی خويان لە دەست دا. ئەنجا لە ئاكامی ئەم دوو كارەساتەو روخانی مير نشينی سۆران و جەنگی يەكەمی جيهانی ويراى مردن و لە ناوچونی سەدان خيزانی شارەكە ژمارەييكی زوريش لە بنەمالەكانی شاری ڕەواندوز شارەكەيان بە جێهێشت و دەربە دەر بوون، جاريكی تر بۆ شارەكە نەگەڕانەوە من بە خوم لە شاری قاميشلی چاوم بە پياويكی دوكاندارکەوت كە زانی من خەلكی ڕەواندوزم گوتی ئيمەش خەلكی ئەو شارە بووين. بەلأم باپيرە گەورەم كە بەرپرسيكی گەورەى لە شكری مير نشينی سۆران بوو, دواى گوشتنی محمد پاشا لە لايەن كار بەدەستە زۆردارەكانی عوسمانی.باپيرم هەلأتوە بۆ كوردستانی باكور دواى ماوەيەكی دريژيش هاتوين بۆ شاری قاميشلی. لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كە چۆن ژمارەيكی هەست پيكراوى بنەمالّەكانی ڕەواندوز بە هوى ئەو كارەساتانەى بە سەرى داهاتوە شارەكەيان جێهێشتوە ونەگەرانەتەوە.

لە كۆتايی هاتنی جەنگی دودەم دا و لە مانگی ئەيلولی /١٩١٨ هيزێك لە سوپاى بەريتانيا بە سەر كردايەتی(نويل) ڕەواندوزى داگير كردوە بەلام ئينگليزەكان نەيان توانيوە ئەوەندە لە ڕەواندوزدا جێگير بن. جونكە بە شيك لە خەلكی ڕەواندوز و دەوروبەرى نورى , باويل ئاغا و شيخ كاكەمين بەهاوكارى خيلی سورچی. ياخی بوون لەم ناوچەيە سەرى هەلدا دژى داگير كەرانی نوێ لەم ياخی بوونەشدا هۆكارى ئايينی ڕۆلی كاريگەرى گيراوە. بەراددیەك كەستەم و چەوسانەوەى دەولەتی عوسمانی كە لە ڕاستی دا دەولەتی تورك بوولەبير چودوە. هەرچەندە خۆيان بە خەلافەتی ئيسلامەوە ئەناساند بويە دواى دەرپەڕاندنی سوپاى داگيركەرى بەريتانيا

لە رەوانـدوز هانایـان بـۆ حکومـەتی کمـاڵ ئـەتا تـورکی کـورد کـوژ بـرد کـە هیـزیکی بگێڕیتەوە رەواندوز، حوکم و دەسەڵەت بگرێ بـە دەسـتەوە بـەم شـیوەیە لـە کوتـای ساڵی /١٩٢٠. هیزیکـی تـورك بـە سـەرۆکایەتی ئەفـسەری تـورك (ئـوزدەمیر) گەیـشتە ردوانـدوز. ئەم پیاوە سێ ساڵ کاروباری ناوچەکەی گرتە دەسـت، ئینگلیزەکـان نـەیان توانی بگەڕێنەوە ردوانـدوز. بەلام بە فڕۆکە ناوە ناوە شاردکەیان بومبا بـاران دەکـرد و خەلکەکـەیان هەراسـان کـرد بـوو. چـونکە کـە فڕۆکـە جەنگیـەکانی ئینگلیـز بەدەردەکەوتن خەلکی شاردکە بۆ خۆ پاراستن رایان دەکرد بو ئەو ئەشکەوتانەی لـە دەورو بەری شارکە هەبوون بەپی گێرانەوەی باوکم ئەم بومبا بارانانە هیچ زیانیکی گیـانی بـەدواوە نـەبوو. بـەلام زیـانیکی زوری بـە خانوبـەری خـەلکی گەیانـد، لـەو ماوەیـەدا کۆتـایی بـە چـەنگ هـات و بـەپێ بریـاری کۆمەلـەی گـەلان عـیراق بـە کوردستانیـشەوە بەبـەر ئینگلیـز کـەوت. بۆیـە ئـوزدەمیر و هیزەکـەی لـە رەوانـدوز پاشەکشە پێ کرد و بەرەو تورکیا گەرانەوە. لە شکری کوردیش کەتەمایان بـە تـورك بـوو بگەڕێتـەوە، دوچـاری نـا ئومیـد بـوون بلاوەیـان لێ کـرد بـە شـێوەیەك رێگـای رەوانـدوز لەبـەر دەمـی سوپای ئینگلیـز کرایـەوە و دانیـشتوانی رەوانـدوزیش بـەرەو ناوچەی روست و سیدەکان رایان کرد. سوپای ئینگلیزکە دیانی ئاشوریـشیان لـە گـەڵ دابوو بەبی شەر هاتنەوە ناو رەوانـدوز. دانیشتوانی رەواندوزیش کە بۆیان دەرکـەوت ئینگلیزەکان دەست لە خەڵك نادەن گەڕانەوە شوینی خۆیان.

دوای ماوەیەك لە گەرانەوەدی هێزی ئینگلیـز بـو ردوانـدز. سـەید تـەها لـە بنەمالـەی شیخانی نەهریە کە ریزیکی زوریان لە نـاو خـەلکی کوردسـتان هەیـە. خوشـی دیـارە پیـاوێکی رۆشـن بـیر بـوەو لـە بـواری نەتەوایـەتی دا ویـستوتی کـوردیش وەکـو نەتـەوەکانی دیکـە کیـانیکی سیاسـی سـەر بـە خـۆی هـەبی، لـە رەوانـدوز هەنـدی چاکسازی کردودو کرمی ئاوریشمی هیناوە و زۆر بایەخی بە بلاوکردنـەوەی زانـستی داوە قوتابخانـــەی ســـەرەتایی ردوانـــدوز و گەلالـــە و رایـــات لـــە ســـەردەمی ئـــەو کراونەتەوە.بەم شێوەیە لـە سـەردەمی سـەید تـەها نـەختی هێمنـی و ئاسـودەیی بـو

ڕەواندز گەڕاوەتەوە. ئەو ڕیگایەی نیوان هەولێرو حاجی ئومەران کە بە ڕیگای (هاملتون) ناسراوە کاریگەرییەکی ئەرێنی لە سەر شاری ڕەواندوز هەبووە.
بەلام ئەو دوژمنایەتیەی لە نێوان بنەماڵەی باویل اغا و اسماعیل بگ هەلگیرساوەو ماوەیەکی دریژی خایاندوە کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر بەرەوپێشچوونی ڕەواندوز هەبوە. وێرای ئەوەی کە حکومەتی پاشایی زۆر کەم بایەخی بە ئاوەدان کردنەوەی شارەکە داوە بۆیە تا سالآنی پەنجاکانەوە قوتابخانەی ناوەندی لێ نەبوە. لە تەمەنی مندا ڕەواندوز شاریکی بچوکولانەبوو زۆر بەی هەرە زوری دانیشتوانی ڕەواندوز لە سەر ئایینی ئیسلام بوون، بەلام نزیکەی (٢٠) مالی جوولەکەی لێی بوو، پیشەی سەرەکیان جۆلایی بوو، هەندێکیشیان بازرگانیان دەکردو، شوینیکیان هەبو بۆ خوا پەرستی پییان دەگوت(کنێشت) بەلام ڕژیمی پاشایەتی لە سەرەتای سالانی پەنجاکانەوە بە زورەملی گواستنیەوە بۆ ناو دەولەتی ئیسرائیل لە فەلەستین. خۆیان زۆر نیگەران بوون بەم گواستنەوەیە، هەرچەندە ٣- ٤ ناحیە گرینگی پیوە بە ستڕابوونەوە. بیگومان ئەو بچوك بونەوەیە شارەکە لە ئاکامی ئەو کارەساتانە بووە کە بەسەر شارەکەدا هاتن. ئەگینا ئەم شارە گەورە بودو ژمارەییکی باش ڕۆشنبیری لێی هەبوە. د. کەماڵ مەزهەر نوسیوتی کەزیاتر لە (٢٩) کەس لە خەلکی ڕەواندوز بەشداریان لە کرینی ڕوژنامەی (زەورا ) کردوە کە لە سەر دەمی عوسمان لە بەغدا بە زمانی عەرەبی و تورکی دەردەچوو.بەبونەی ڕوشن بیری لە ڕەواندوزدا. دەمەوی نەختی باسی گوڤاری زاری کرمانجی بکەم. کە لەسەردەمی سەید تەها لە ڕەواندوزدا چاپ وبلاودەکرایەوە لە لایەن ڕۆژنامە نووسی بە تواناسەید حوسەین حوزنی موکریانی، کە هەر خۆی زوربەی و تارەکانی دەنوسی و هەرخوشی پیت چنی دەکردو لە چاپی دەدا. ڕاستە لە وانەیە بە هۆی بوونی سید طـه وەکو قائمقام لە ڕەواندوز ڕۆلی هەبێ لەوەی کە حوزنی چاپخانەکەی خۆی هینابیتە ئەم شارە. بەلام بونی پیشینەیەکی ڕۆشن بیری لەم شاردا گرینگی هەبووە کە ئەم کە لە پیاوەبێت و گۆڤاری (زاری کرمانجی ) لەم شارە بەکۆلەمەرگی دەربکات.

من له سالی خویندنی/١٩٤٥ — ١٩٤٦ خویندنی سەرەتایم تەواو کرد دوای سالیك لە بێکاری دا. سالی خویندنی /١٩٤٧- ١٩٤٨ لە خانەی ماموستایانی لادیی وەرگیرام، ئەو سالە ماموستا حەیدەر عوسمان دووسێ جار بانگی کردین بۆ مالی خۆی و ، باسی حزبی ئازاد کردنی نیشتمانی (حزبی تحرری وطنی ) بۆ کردین و هانی دەدایین لەو حزبە کاربکەین. لە هەمان لە نەوروزی /١٩٤٧ ریکخراوی حشع مۆلەتی ئاهەنگ گێرانی لە میری. ئاهەنگەکە کە لە گۆرِد پانی قوتابخانەی سەرەتای بەریوەبرا کومەلی وتاری شورش گێری لە ئاهەنگەکە پێشکەش کران. بەلام هیچی لێ تێنەگەیشتم، لەو ئاهەنگە هەر ئەوەندەم بۆ دەرکەوت.کە نەوروز هەرسەرەتای سالیکی تازە نییە، بەلکو جەژنێکی نەتەوەییشە. لەو کاتە کە تازە کۆماری کوردستان لە مەهابات رِوخابوو ئەم خوپیشاندانە بایەخێکی گەورەی هەبوو.لەو کاتەدا لە قوتابخانەش کە لە ژوورێکی ناوەندی و دوا ناوەندی هەولێر بوو هەندی قوتابی قسەیان بۆ کردین. لە سەرەتای سالی/١٩٤٨ لە شاری بە غدادا. قوتابیان چەند خۆپیشاندانیان دژی رژێمی پاشایەتی رێك خست. جونکە وەفدی ئەم رژێمە لە لەندەن بوو، بۆ گفت وگۆ کردن لە بارەی نویکردنەوەی پەیمانی نیوان عیراق و بەریتانیادا. هەربویە لە سانەوی هەولێر بریاردرا کە خۆپیشادان بکری، بۆ پشتگیری قوتابیانی بەغدا. لەو سالەشدا لە هەولێر جم و جوولێکی فراوانی قوتابیان هەبوو، کە رِۆلی سەرەکی هی حزبی تحریر بوو.بویە بەیانی ١٩٤٨/١/٥ قوتابیان لە قوتابخانە دەرچون و خوپیشاندانیان رێك خست و، بەرەدو بازارِی هەولێر بەرِێ کەوتین. منیش بۆ یەکەم جار بەشداریم کرد لەو خوپیشان دانەدا. لە سەرەتای بازار شیخ خالص کە ئەوکاتە لە پولی پینج دابوو، چووە سەربەرزاییەك و تاریکی شورشگیری دەخویندەوە لەو کاتە هیزیکی زۆری پولیس هاتن ویستیان کاغەزەکە لە دەستی شیخ خالص دەربهینیت. ئەویش کاغەزەکەی نەدەدا پولیس وئیتر بود مشت و مریان و. لە و کاتەدا سەرپەرشتکاری خوپیشان دان هاواری کرد کە بلاوەی لێێ بکەین بویە هەرکە

سەبەلایەدا رای کرد. نیوەڕۆ کە هاتینەوە بۆ بازار زانیمان کە پولیس پینج قوتابی دەست گیر کردوە.

لە شاری بەغدا قوتابیان دریژەیان بە خوپیشاندانەکان داو رۆژ لە دوای رۆژ خۆپیشاندانەکان فراوان ترو گەورەتردەبون. هەرچەند پولیس دریغی نەکرد لە راونان وتەقەکردن لە قوتابیان و چەند قوتابیکیش شەهید بوون لە وانە جەعفەر برای شاعری گەورەی عەرەب جواهری وقیسی ئالوسی کە لە تەمەنی ۱۷ سالان دا بوو. بەلام صالح جبر کە سەروکی وەزیران بو لە جیاتی ئەوەی ریز بۆرای قوتابیان و جەماوەر دابنێ هەر خەریکی هەرەشە کردن بوو. بەم گیانە کۆنەپەرستیە پەیمانەکەی ئیمزا کرد کە پەیمانی جبر – بیڤن یا پەیمانی پورتسموت ناوبانگی دەرکرد. بۆیە لە رۆژی ۱۹٤۹/۱/۲۷دا خۆپیشاندانەکان هەموو بەغدای گرتەوەو پولیسی رژێم هەرچەند بەخەستی تەقەی لە جەماوەری راپەریو کرد. کە لەوراپەرینەدا هەر قوتابیانی نەگرتەوە بەلکو کریکاران و کاسبکارانشی گرتەوە وێرای ئافرەتان کە ئەو رۆژە رۆڵێکی زۆر کاریگەریان گیراو کچەکەی پردی ئەمین کە دوای ناوی لێنرا(پردی راپەرین) لە ژیر گوللەی پۆلیس لە پردەکە پەریەوە هەرچەند شەهید کرا. بەم کارەشی خۆپیشاندەرانی رصافە و کەرخ خۆیان لێك دایەوە و جەماوەر سەرکەوت وپولیس نەیتوانی چیتر خۆ راگری و راپەرین سەرکەوتنی بەدەست هینا. بۆیە لە ئێوارەی ئەو روژەدا (عەبدو ئیلاه و وەس) نا چار بۆ پاراستنی حوکمەکەی. پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە و صالح جبر لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لابدا.

بە هۆی سەرکەوتنی راپەرینی جەماوەری عیراق بە سەر نەخشەو پیلانەکانی ئیمپریالیزم و رژیمی پاشایەتی نوکەر. ئازادیە دیموکراتیەکان لە لایەن جەماوەر سەپیندرا. خۆپیشان دان و مان گرتن وکۆ بونەوەی فراوانی جەماوەری. رژیم نەیدەتوانی قەدەغەیان بکات. هەروەها روژنامەی حزبەکان بەبی ترس بیروبۆ چوونی خۆیان بلاو دەکردەوە لەم بوارەشدا حزبی شیوعی ئیجازەی دەرکردنی

رۆژنامەیەکی بەناوی ئەساس(بناغە) وەرگرت و هەمووکەس و رژیمیش دەیزانی ئەمە رۆژ نامەی حزبی شیوعیە.
لە هەولێریش ناوە ناوە خۆپیشاندانی گەورە رێك دەخران کەبە مەزەندی من زیاتر لە دەهەزار کەس لەم خوپیشاندانانە بە شداریان دەکرد. لە هەمو ئەم خۆپیشاندانانە شیوعی هەمیشە زیندو شیخ محمد (شیخە شەلە) وتاری پرجۆش و خرۆشی دەخویندەوە هەندێ جاریش کچێك وتاری دەخویندەوە.دوایی بۆم دەرکەوت کە ئەم کچە تێکۆشەرە فەریدەی خوشکی شەهید نافع یونس بوو لەم بارودۆخە شورشگێرییەدا، لە هەولیر ئاهەنگی نەورۆز بە هاوبەشی شیوعی و پارتی مۆڵەتی بو وەرگیرا، لە محافظ کە ئەوکات موتەسەریفیان پی دەگوت هەرچەندە(اخوان المسلمین) هەوڵی زۆریان دابۆ ئەوەی رێگایان پێ نەدری لە بەرئەوەی (نەورۆز)مانای ئاگر پەرستیە لە ناو بازاری هەولیر خەلکیان هاندەدا بومان گرتن. بەلام ئەو هەولانە بەفیرو جوون،جونکە جەماوەری هەولیر ئامادەو لە سەرپێی بوو.ئەو ساڵە جەژنی نەورۆز لە قەزاکانیش ئاهەنگی بۆ ریکخرا وەکو کویی و رەواندوزو شەقلاوە.هەل و مەرجەکە بەم شیوەیە بە دریژی هەبو تا ١٩٤٨/٥/١٥ کەرژیم حوکمی عرفی راگەیاند. گوایا بۆ پاراستنی ولات لە کاتی چونە دەرەوەی بە شێك لە سوپای عیراق بۆ فەلەستین . بەبیانو ئەوەی کە دەولەتی ئیسرائیل بروخینن و هەمو خاکی فەلەستین لە جوولەکە پاك بکەنەوە بەلام حەوت لە شکرەکەی عەرب هیچیان پینەکرا، چونکە حکومەتە عەرەبیەکانی ئەو سەردەم نوکەری ئیمپرالیزم بوون. ولە عیراقدا راگەیاندنی حوکمی عورفی بۆ ئەوە بوو کە پەلاماری ئەندامە چالاکەکانی حزبی شیوعی و پارتی و گشت هیزە دیموکراتیەکان بدەن. لە هەولیر و قەزایەکان وەکو کۆیە و رەواندوزو مەخمور ژمارەیەکی زوریان لەلاوە شورشگێرەکان دەست گیر کرد. کە هاورێ ی نەمر- جمال حیدری- یەکێك بو لەوان لە سەرتای ساڵی خویندنی نوی /١٩٤٨ – ١٩٤٩ هەردو خانەی ماموستایانی هەولیر و سلیمانی کران بەیەك و خانەکەیان بۆ دهوك گواستەوە دوای دەست کردن بە خویندن چەند هاوریکی

هەولیرو سلیمانی کۆ بونەوە وبریاریان دا کە د. حمە سعید عبدالله لە سلیمانی ومن لە هەولیر ریکخراوەکە ریك بخەینەوە وهاورێیەکی دهوکیش سەرپەرشتیمان بکات. ئیتر (د.حەمە) و مـن خـیرا پەیوەنـدیمان کـردەوە بـە هاوریـانی سـاڵی پێـشو کـە ژمارەیـەکی زۆر بـوون. هـەر لـە بـەر ئـەوەش بـو ئـەم دوخانەیـەکران بەیـەك و دوو خراینەوە بۆ دهوك . جونکە کارگیری پەروەردەی هەر دوو لیوایەکە ئەم داوایـەیان لە وەزارەتی پەروەردە کرد بو وکـە دوور بخرینـەوە جونکـە نوسیبویان کـە زوربـەی قوتابیـانی ئـەم دوو خانەیـە شـیوعین.بـەم شـیوەیە کۆمـەڵی شـانە لـەلای مـن بـو وکۆمـەڵکیش لـەلای (د.حمـە سـعید) بـوون بـە هـەمووومان یـەك کتیبـی سـتالینمان هەبوو، بەناوی القضیة الوطنیة (کێشەی نیشتمانی) کە باسی مەسەلەی نەتەوایەتی و مەرجـەکانی بـوون بەنەتـەوە(الامـە)ی دیـاری کـرد بـوو ئـەو کێـشەیەش لـەو سەردەمەدا، مشت و مڕێکی زۆری لە سەربوو، لە نیوان ریکخراوەکانی شیوعی لە کوردستان و ریکخراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. ئێمەوامان لێك دەدایەوە کە کورد هیشتا نەبووە بە نەتەوە(امە) هەرچی برادەرانـی پـارتی بـوو رایـان وابـوو کـە کورد ئێستا نەتەوەیەو هەموو مەرجەکانی نەتەوەی هەیە .

هەل و مەرجەکە بـەم شـێوەیە دریـژەی کێـشا ئێمـە شـانەکانمان بـەرێوە دەبـردو بـە کتیبـەی سـتالین گۆشمـان دەکـردن و کتیبەکـەشمان لـە گـەلی دهـوك دەشـاردەوە. لـە سەرەتای دوامـان لـە دهـوك جێگـا و ڕێگـاو خواردنمـان زور خـراپ بـوو بۆیـە، دوای هاتنی سەرپەرشتی کـە تنظیم ئاگـای لی نـەبوو.بریـاردرا نـانی ئیـوارە نـەخوین. لـە سەرئەمە بـوو روژی دوایـی ئەنجومـەنی خانـەکوبوە و چـەند بریـاریکی نـارەوای بـو دەرکردنی هەشت قوتابی دا چواریان بـەدەرکردن تـا کوتـایی سـالی خوینـدن داهـاتوو چواری تریش بۆ ماوەی مانگیك. بـەلام بـە (تـەدەخولی) دیـوانی أغـا لـەلای کـارگیری خویندنی موسل مانگەکان کران بە یەك هەفتەو،یەك سالیکانیش کـران بـە مـانگیـك تـەنیا- عزالـدین علـی جـراح نـەبی کـە هـی ئـەو کـەم نەکرایـەوە. چـونکە بـەوە تاوانبارکرابوو ئەم قوتابیەکانی هانداوە بۆ مانگرتن. ئێمە ئەو ساڵە هیچ ئاگامان لە

رووداوەکانی ناو عیراق و حزب نەبوو. ئەو هاوڕێ دهۆکییەش کە بەرپرسی دهۆك بووە دەیگوت پەیوەندیم بە ڕێکخراوەی موسل بچراوە. هەرخوی ڕێکخراوەی موسل نەختی لاواز بوو. بەلاّم کە گەڕاینەوە شارەکانمان هەولی ئەو کارەساتەمان بیست کە بەسەر حزبدا هاتوە وچۆن مالك سیف و یهودا صدیق گیراون ؟ هەموو رێکخراودکانی حزبیان تسلیم بە جیهازی ئەمنی عیراق کردوە بەتایبەتی مالك سیف هەروەها جون کاربەدەستانی رژیم بریاریان لەبەر روناکی دانپیانەکانی مالك سیف دا داوە جاریکی تر هاوری فەهد وصارم و حازم سەر لە نوی محاکمە بکرینەوە ئەم جارە حوکمی لە سیدارە دانیان بە سەردا سەپاندن بەشیوەیەکی قەرەقوشیانە. و خیرا حوکمەکەیان لە رۆژانی ١٤،١٥ شوباتی /١٩٤٩ جێبەجی کرد.

کە سالی نوی خویندنی/١٩٤٩ – ١٩٥٠ گەڕاینەوە بۆ خانەی ماموستایان سەیرمان کرد کە ئەو هاوریەی دهوکمان بومتە پولیس کە چاومان پیکەوت بە شەرمەوە گوتی من لە بەر هەژاری بومەتە پولیس و ئیوە هیچ مەترسیتان نەبی لە من. ئەمە لەلایەك لە لایەکی تریش هاوریانی سلیمانی پیپانراگەیاندم. کە (د.حەمە سعید) لە گەل یەکی لەو تاقمە کە رەتکارانەدا کە لە سلیمانی پەیدا ببون رویشتوە. بویە ئەمنیش نەهاوری د. حمە سعید تاقەتی ئەوەمان نەبوو ریکخراوەکە پێکەوە بنێنەوە هیچ هاورێیەکی تریش داوای لێی نەکردین. بەلام جورە پەیوەندیکی گیانی – روحی – لە نیوان هاوریەکانمان هەر مابوو – ئەمەش هە لە بوو لەلای ئیمە بەم شیوەیە لە هەل مەرجیکی ناهەموارج لە روی خواردەمەنی وچ لە روی کارگیری قوتابخانە سالی چوارمی خویندمان بردە سەر شایانی باسە کە دوای نیوەی سالی خویندنی /١٩٥٠ – ١٩٥١ چاو دێرێك لە بەغداوە هات ئەم هەل و مەرجەی بە چاوی خوی بینی. زۆربە توندی لە گەل کارگێری خانەکە کە خەلکی موصل بوو، وەبەریوەبەری ناوخویی کە کوردیکی دهوکی بوو قسەی کرد ئەنجا گەرایەوە بۆ بەغداو زوری پێنە چوو کە بریاری دەرکردنی بەریوەبەری بەشی ناوخودەر کراو گواستنەوەی کارگیری خانەکە دەرچوو. لە ئاکامی ئەو چاودێرییە. هەل و مەرجی خانەکەمان بەرەو چاکیك

هەست پیكراو گۆرا لەو ساڵەدا لە گەل كاپتنی خانەكە بەشەڕهاتم بۆیە ئەنجومەنی خانەیان بۆ كۆ كردمەوە وبریاریان دا كە حەوت رۆژ، لە خانە دەربكریم. بە هاوكاری برادەرانی پارتی و هاوریانی خۆمان. هەر لە دهوك جیگایان بۆ پەیدا كردم و نەگەرامەوە بۆ ماڵەوە.

بۆ سالی خویندنی/١٩٥١ – ١٩٥٢ كە دوا سالمان بوو. بو خانەی ماموستایان لە بەعقوبە گۆزراینەوە. لەوی تەخرجمان كرد لە پایزی هەمان ساڵ لە دیبگەدایان مەزردانـدم، ئەو ساڵەم لەویّ ئەو ساڵەی لە بەعقوبە بوم هەستم نەكرد كە چالاكیكی ریكخراوەی حیزبمان لە خانەی ماموستایانی باقوبە هەبیّ. بۆیە من چەند جاری چومە بەغدا لەویّ چاپەمەنیەكانی حزبیم ومرگرت لەو كومەڵە دوستم لە خەلكی رەواندوز كە قوتابخانەی فرۆكەوانی (طیران) دەیان خویند. لە باقوبەش ئەم چاپەمەنیانەم دەدا، بە هەندی لەو كونە هاوریانەی كاتی خۆی لە حزبدا كاریان دەكرد.

دیارە ئەو ساڵەی خویندن كەمن لە دیبگە بوم، پەیوەندی حزبیم نەبوو تا نزیكەی كوتای سال.بویە نەم زانیبوو ئەوهاوریانەی كە بەبریاری – بهاء الدین نوری – لە سەرەتای سالی ١٩٥٣ دەركران، ناوەندیكی تری حزبیان دامەزراندوەو. بیانەویّ ئەوەی كە حزب لە ڕیكاوە دەربكەن كە تیّی كەوتوە. بەلام كە گەرامەوە بۆ رەواندوز وچاوم بە هاوری عەلی عبدالله ناسراو بە (عەلی مەكتەبە) كەوت.ئەوپیّی راگەیاندم كە ئەم ناوەندە دامەزراوە. و داواشی لیّی كردم لەگەلّ ئەوان ئیش بكەم جونكە سەركردایەتی حزبی ئەو كات كە – بهاء الدین نوری – سكرتیریەتی بەلای چەبدا لایان داوە. چونكە دروشمی – ڕووخاندنی پاشایەتی – دروشمیكی چەپڕەوانەیە هیشتا كاتی بەرزكردنەوەی نەهاتوە. من داوایەكەی كاك عەلیم رەت كردەوە، جونكە ئیمە واگوش كرا بووین هیچ جیابونەوەیەك لە حزب راست نییە، گیرو گرفتە كانیش دەبی لە ناوریزی حزب راست بكرینەوە لە گەل هاوریّ عەلی لە مبارەیەوە زۆر گفت و گۆمان كرد، نەگەیشتنە دەر ئەنجامیك. لە رەواندز ریكخراوەیەكی حزب

هەبوو کە لەچاو ئەوسەردەمە داریکخراوەکی لە رەواندوز دریژە یان بە چالاکیەکانی خویان دا تا سالی/١٩٥٦، کە هاوڕێ ی نەمر سەلام عادل توانی سەرکردایەتی (رایە الشغیلە)- قناعەت پێی بکات بگەرینەوە بوریزی حزب- لەلاپەرەی دوایدا بە دریژی باسی دامەزراندنی ناوەندە تازەیە دەکەم.لە بەهاری سالی /١٩٥٢ کەمن لە دیبگە بوم. راپەرینیکی جوتیاران لە دەشتی هەولیر سەری هەلدا. لە ئاکامی زور داری و ستەمی ئاغایەکانی دەزەیی دا.سەرەتا راپەریتەکە لە گوندی (قازیخانە) بەرپاکرا چونکە لەم گوندە دا جوتیارەکان هوشمەندیکی چینایەتی باشیان هەبو. دوای ئەم راپەرینە زوربەی گوندەکانی دەشتی شەمامك و کەندی ناوە وقەراجی گرتەوە. ئاغاکانی زۆر هەراسان کرد، وپەنایان بو کار بەدەستانی رژیمی پاشایەتی برد. رژیمی پاشایەتیش پیشت و پەنای ئاغاو دەرەبەگان بوو، هیزیکی پولیسی گەروکی – الشرطە السیارة – بو گوندە راپەیوەکان نارد، بوترساندنی جوتیاران. هەروەها ژمارەیەکی لە جوتیارە چالاکەکان دەستگیر کرد، لەگەل مەلای هەندی لە گوندەکان کە یەکیان لەمانە بو ماوەی سێ سال بەبریاری کارگێری موتەسەریفی هەولێر حوکم درا.

شایانی باسە بەهوی زەبرو زەنگی رژیم راپەرینەکە نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی جێبەجێ بکا، بەلأم هۆشیارییەکی چینایەتی قول لە دلی جوتیارەکاندا چاندو. راپەرینەکە لە هەموو ئیراق دەنگی دایەوە و روژنامەی حزبی دیمقراتی نیشتمانی، چەند وتاری لە سەر راپەرینەکە بلأوکردەوە. چونکە وەفدێکی جوتیاران سەردانی بەغدایان کرد، بو روون کردنەوەی داخوازیەکانیان بۆ سەرکردایەتی حزبە مۆلەت پێدراوەکان لە مانیش – کامل جادرجی – سەروکی حزبی دیموکراتی نیشتمانی زور بەگەرمی پیشوازی لێکرن و پشت گیری خۆی بۆ داخوازیە رەواکانیان دەربری.

دەبی ئەو راستیەش بگوتری کە (حشع) بەهەموو توانای خۆی داکوکی لەم راپەرینەی جوتیارانی دەشتی هەولیر دەکرد و کادرەکانی جوتیارەی ئەو سای حزب، رۆلێکی هەست پێکراویان گێرا، لە مەر بڕەودان بەم راپەرینە جەماوەرینەی

جوتیــاران. پــارتی دیمــوکراتی کوردســتانیش پــشت گــیری راپەرینەکــەی کــردو کادرەکانیان هانی جوتیارانیان دەدا بو بەشداری کردن لە راپەرینەکەدا.

لە هاوینی/ ١٩٥٣ کە گەرامەوە بو رەواندوز هاوری (عەلی عبداللـه) ناسـراو بـە (علـی مەکتەبە) گـەرابودوە بـۆ رەوانـدوز، ودیـارە لەگـەل ئـەو هاوریانـەی زینـدان بـوو کـە لایەن – بها الدین نوری - یـەوە لـە حـزب دەر کرابـوون. مـن لـەوم بیـست کـە ئـەم هاورێیانە ناوەندێکی تریان دامەزراندودو هاورێ علی زۆر هـەوڵی کـەمنیش بـۆ لای خۆیان رابکیشێ. بەلام من جونکە وا گوش کرابـووم کـە هەرچـەندە سـەرکردایەتی هەلەشـی کردبـێ، نـابی ناوەنـدی تـر دامەزرینـدرێ. ئـەو هاوریانـەی ناوەنـدی دوەم دادەمەزرینن بەهەل پەرست دادەندرێن. لە بەرئەوەی کە دەبێ گیروگرفتی نـاوەوەی حـزب هـەر لـە نـاوەوە چارەسـەربکرێ. بـەلام هـاورێ – عـەلیش چـەندهاوریکی لـە رەوانــدوز لــە دەوری خــوی کــۆ کــردەوە وریکخراوەیــەکی دامەزرانــد. هەرچــەندە ریکخراوی سـەر بـەحزب بـەهیزترو فـراوان تـر بـوو و چـەند بنکـە لـەدەرەوەی شـار هەبو وەکو دولە مچەر و دەرگەلە و زنیوێ شیخی و چەند چیگایەکی دیکە.

لە پایزی/ ١٩٥٣ لـە سـەر داوای خـۆم بـو گونـدی دەرگەلـە گواسـترامەوە لـەوی ویـرای قوتابخانە، کاری حزبیشم دەکرد، لە رەواندوزیش یارمەتی هاوریانم دەدا بە تایبەتی لەوەلام دانەوەی پروپاگانـدەی جماعـەتی – رایـە الـشغیلە – ئـەو کاتـە لـە رەوانـدوز (حـسین خبـاز) بەرپرسـی ریکخـراوە کـەبوو. لـە دەرگەڵـەش دەنـگ وباسـی پ. د.ك دەبیت بەتایبەتی لە ناوچەی رانیەویشدەر، کە عومەر عـەلی موتەسـەریفی سـلیمانی زور فشاری خستبوە سەرجەماوەر هەتا ئاغانیشی گرتبودوە، بۆیە سالی/ ١٩٥٤ هـەمزە عبدالله ی تێکوشەر لە ناوەوەکاری حزبی بەریوەدەبردو توانیبووی هەندی ئاغاش بو نـاو پ.د.ك رابکیـشی وەکـو عباسـی مامنـد أغـا لـە ئاکـامی راپـەرینی پـایزی /١٩٥٢ ، گیروگرفت لە نیوان ریزەکانی حزب رویدا، هەندی هـاورێ ی پیـشکەوتو لـە زینـدان نارەزاییان دەربری لەو دروشمانە کە لەو ڕاپەرینـەدا بەرزکرابونـەوە. گوایـا هەنـدێ لەم دروشمانە گیانی جەب رەوانەی تیدایە بە تایبەتی، دروشمی روخاندنی پاشایەتی

و دامەزراندنی رژێمی کۆماری. سکرتێری حزب لەو دەمەدا – بهاء الدین نوری – بۆ رەخنەکە زیاتر بەرەو روی ئەو دەبوەوە کە ناوی نهینی – باسم – بوو. ئەم رەخنەیە بوە هۆی ئەوەکە لە زینداندا حزب دوو کەرت بوو لە ئاکامدا بەریز – بهاء الدین – بریاری دا ژمارەییکی زۆری ئەم هاورێیانە لە حزب دەرکرد. ئەوانیش بریاریان دا ژمارەیەکی زۆری ئەم هاوریانە لە حزب دەرکەن. ئەوانیش بریاریان دا کە ناوەندیکی خۆیان دابمەزرینن کە دوایی بە ناوی رۆژ نامەکەیان – رایە الشغلیە ناویان دەرکرد. ئەمە لە سەرەتای سالی/ ١٩٥٣ لەو ماتەشدا هاوری جەمال حەیدەری کەمیەکیك لەوانەی دەرکرا بوون، توانی لە نەخوشخانەدا رابکات، بەرەو بەریکخراوەکە بدات، لە ناوجەماوەردا، بەم شێوەیە ناوەندیکی تری حزبی شیوعی لە عیراقدا پەیدا بوون. ئەمەش زیانیکی زۆری بەحزب گەیاند، بەپێ ی بیرو باوەری لێنینی مەزن نابێ لەیەك ولات دوو حزبی شیوعی هەبی ئەوەی جیگای داخیشە پەنادەبرا، بۆ بلاوکردنەوەی وتاری توندو تیژ هەندیك موهاتەرات. ئەم هەل و مەرجە سێ سالێ دریژەی کێشا. تالە سالی /١٩٥٦ هاورێ سەلام عادل توانی ئەم گرفتە جارە بکات و رێکخراوی (رایە الشغلیە) خۆی هەلۆەشاندەوە وهەمویان گەرانەوە بو ریزی حزب.

لە بەهاری /١٩٥٤ رژێمی پاشایەتی بریاری دا لە حوزمیرانی هەمان سالێ هەلبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمان بەریوەبچی. حزبە عیراقیەکان بریاریان دا بۆ ئەم هەلبژاردنە، بەرەییکی پەرلەمانی پیکەوەبنین وبەرەکەچووە کوری خەبات. دیاربوو رژێمیش ناچاربوو لە ژیر فشاری جەماوەر ریگای هەندی ئازادیە دیموکراتیەکان بدات لەهەل و مەرجیکی ئاوانییمە دیموکراتیدا(١٠) لە نوینەرەکانی بەرە سەرکەوتن و مەسعودی مەلای گەورەش کە لە کویی دەرچوو بوو. هاتەریزی ئەم بەرەیە. بەلام نوری سەعید کە خۆی ئامادە کرد بوو.پەیمانی بە بەغدا لە گەلێ تورکیا و ئیران ببەستی هەلبژاردنەکەی هەلۆەشاندوە بۆ سالی دودەم /١٩٥٣ – ١٩٥٤ ، لە سەرداوی خومدا گوزرامەوە بو گوندی دەرگەلە. کە تا ئەو سالە قوتابخانەی لێی نەکرابوەوە.

هەرچەندە ئەم گوندە ئەو کات ریگای ئوتۆمبێلی نەبو، بەلام بومن لە دیبگە باشتر بوو، لەو گوندەدا زۆر خوم لەگەل قوتابییەکان ماندوکرد، خەلکەکەش زۆر هاوکاریان دەکردم، بەتایبەتی کاك عزەتی سلیمان بگ و خوالێ خوش بوو جەلال بەگی کوری میر حەمەدامین. لەوێ بەنیمچە ئاشکرای کارو باری حزیم بەریوەدەبرد، تائیستاش هیچ یەکیك لە خەلکی ئەو گوندە گوزارشتی لە لایەن حکومەتەوە لەسەر من نەدا. ئەتوانم بلێم کەخەلکی گوندەکە، بەگشتی حزبیان خوش دەویت بۆ پشت راست کردنەوەی ئەم قسەیەم لە کوتایی سالی/١٩٥٦ لە رەواندوزەوە (حمید عوسمان) یان نارد بۆ لامان نزیکەی مانگیك مایەوە بەهاوکاری من وکاك عزەت رەوانەی رۆست وزینوێ شێخمان کرد. چونکە کاك حمید بۆ ئەوە هاتبوو کە بارودوخی ناوچەکە دراسە بکات. کە ئایا دەکرێ شۆرشی چەکداری لە دژی رژیمی پاشایەتی تێدا بەرپا بکرێ. چونکە بەپێی قسەکانی (حمید) حزبی شیوعی و پارتی رێك کەوتتبون لەسەرئەم بیروکەیە و بەقسەی (حمید) بریارە کەوا بوو کە بارزانی نەمریش، بەریگا سوریا بگەرێتەوە بۆ کوردستان. چونکە لە پاییزی/١٩٥٦ دا راپەرینیکی جەماوەری لە عیراق بۆ پیشتگیری گەلی میسرا روی دا کە دوچاری پەلامارێکی سێ قۆلی بوەوە لەلایەن ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیسرائیلەوە سوپای ئەم سێ دەولەتە دەست دریژکارە تا سەرکەنداوی سویس رۆیشت و هەموو بیابانی (سینای) داگیر کرد. ئەگەر هۆشیار کەرەوەی یەکیەتی شورەوی و راپەرینە جەماوەریەکانی گەلانی عەرەبی نەبوایە، لەوانەبوو لە کەنداوی (سویسی) ش بپەریبانەوە وقاهرەی پایتەختیشیان داگیر بکردایە، بەلام هۆشیارکردنەوەی (ئینزار) ی شورەوی ئەوەندە لێبراوانە بوو کە ئەوسێ دەولەتەی ناچار کرد شەرەکە کە رابگرن و لە بیابانی (سینا) ش باشەکشە بکەن. ئەوەی جێگای داخە گەلانی عەرەب ئەم دەست پێشخەریەی یەکیەتی شورەویان لە بیرنەماوە. شایانی باسە رژیمەکەی ئەو سای بەغداش بە نهینی پشتگری دەست دریژیە سێ قۆلەکەی کرد. کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعیمان لە کوبونەوەی خۆی

دراسەی ئەنجامی راپەرینەکەی کرد کە رژیم ئەوپەری توندو تیژی بەکار هێنا دژی خوپیشاندانە ئاشتیەکانی جەماوەر. بۆیە حزبیش بریارێدا شێوەی تێکوشانی خۆی بۆ شیوازی توندو تیژی بگۆری و لەشاری (حەی جەماوەر) راپەرینی چەکداری کرد.بەلام لەبەر ئەوەی رژێمی پاشایەتی گۆربەگۆر هێزێکی زۆری ناردە سەر ئەو شارەو توانی بەسەر راپەرینە چەکداریەکەی (حەی) سەربکەوێ دوو هاورێ ی تیکوشەری حزبی شیوعی لە سیدارە داو بە دەیان هاورێی ولایەنگری حزبی لەم شارەبچووکەدا دەست گیرکردو حوکمی قورسی بەسەرداسەپاندن.بە پیوستی دەزانم ئەو راستیە ئاماژە پێی بکەم کە سەرکردایەتی هەردوو حزبی شیوعی وپارتی هاوکاریکی بەتینیان لە نێواندا هەبوو چونکە سەرکردایەتیە کە لە دەست چەند کەسایەتییەکی شورش گیرابووکە سەرکردایەتی شیوعی لە دەست دوو هاوری نەمر سەلام عادل و جمال حیدری دابوو سەرکردایەتی پارتیش (همزە عبدالله ) تیکوشەری ناسراوێ گەلی کوردستان بوو. بەلام تا ئیستاش نازانم کە هۆکاری جیبەجێ نەکردنی ئەم بریارە دوو قۆلێە چی بوو چونکە لە لەراستیدا جەماوەر لە کوردستانیش ئامادە بوو دژی رژیمی پاشایەتی رابپەرێ وا دەزانم شورشی چەکداری لە کوردستاندا ئەگەرحزبی شیوعی بەلام کاك همزە هەر بەرێزەوە ناوی حزبی شیوعی دەهێنا منیش هەندێ جار بەتوندی بەر پەرچی قسەکانی حەمیدم دەدایەوە. گرینگ ئەوەیە کەنەیانتوانی قەناعەتم پێ بهێنن کەبچمە ناو پارتییەوە.

لەوانەیە ئەو هێرشانەی (حەمید) بۆ ئەوە بگەرێتەوە کەلەسالی / ۱۹۵۵ لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی محاسبە کراو لە سکرتێری حزب لادرا دیارە لەسەر ئەمە بە ئەندامی کۆمیتەی لقی کوردستان داندراوە بەلام دەرنەکرا. بۆ زانیاری زیاتربروانە یاداشتەکانی هـ - کریم ئەحمەد بەناوی ( المسیرة). بەم شێوەیەش چەپ لە سەرکردایەتی پارتی بەهێزبوو. بەلام دوای لادانی کاك هەمزە لە سکرتێری صالح حیدری و حمید عوسمانیش بوونە ئەندامی م.س. ئەم بارە تا سالی / ۱۹۵۹ درێژەی

هەبوو. بەڵام دوای لادانی کاك هەمزە، صالح و حیدریش لادران، صالح بەوە تۆمەت بارکرا، کەلەگەل جمالی برای تەنسیق دەکات، هەر چەندە ئەم قسەیە راست نەبوو. لەناوە ڕاستی ساڵی / ١٩٥٨ جەنگی ناوخۆیی لە لوبنان بەرپاکرا، بەهەوڵ وتەقەلای دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان و کۆنەپەرستی عەرەب . ئەمە بۆ لاواز کردنی جم و جۆلی بزافی ئازادی خوازی عەرەب. کە لەلایەن جمال عبدالناصری سەرۆکی یەکگرتووی عەرەبی سەرکردایەتی دەکرا. ئۆردوگای سۆسیالیزمیش پشتگیری لێدەکرد چونکە دژی ئیمۆیالیزم بوو. هەرچەندە ناوە رۆکە دیموکراتیەکەی زۆر لاواز بوو. ئەمەش لە دوایدا بووە هۆکاری سەرەکی لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی. لەم هەل ومەرجەئالۆزەدا شۆرشی ١٤/تەموز لەلایەن ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکان بە سەرۆکایەتی عبدالکریم و عبدالسلام کە خۆیان و ئەو هێزە سەربازییەی لە ژێر سەرکردایەتییان دابوو، رەوانەی لوبان دەکران. بەڵام ئەوانئەو دەرفەتەیان قۆستەوە، لەو کاتەی کە بەناوبەغدادا تێدەپەرین. پەلاماری وەزارەتی بەرگری و کۆشك و تەلاری پاشایەتی و ئیستگەی رادیۆی بەغدا و چەند شوێنێکی گرنگی حکومیان داو بە هۆی هاوکاری کردنیان لەلایەن هەندێ ئەفسەری گەورەوەتوانیان ئەم جێگایانە بگرن ولە سەعات شەشی بەرەبەیانی ١٤/ تەموزدا بەیاننامەی یەکەمی شۆرش لە ئێستگەی رادیۆی بەغدا دا خوێندرایەوە. جەماوەرلە شاری بەغدای خۆراگر وشارەکانی دیکەی عیراقیش بە خۆپیشاندانی گەورە گەورە پشتگیری خویان بۆ شورش دەربری. بەمەش نوکەرەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستەکان نەیان توانی، هیچ جم و جۆڵێك لە دژی شورش بکەن. بەم شێوەیە شورش لە سەرتاسەری عیراق سەرکەوت.

گەلی کوردستان شان بەشانی گەلانی دیکە عیراق، هەر لە یەکەم رۆژی بەرپابوونی شورش، زۆر بەتوندی پشتگیری شورشی کرد و هەموو توانی خۆی خستە بەر دەست سەرکردایەتی شورش. بەلام گەلی کوردستان وەکو شیوعیەکان، مەترسی زۆریان

هەبوو لەوەی کە یەکێتیەکی کت وپر بکرێ لە گەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتودا.بویە داوایان کرد ئەگەر ئەم یەکیەتیە بکری. کە عبدالسلام و نەتەوە پەروەرەکانی عەرەب لە ریزی سوپاو گەلدا، هەولێکی زۆریان دا کە ئەم یەکگرتنە جێبەجێ بکرێ. بەلأم خۆپیشاندانە مەزنەکەی حزب لە رۆژانی سەرەتای شورش، کەنزیکەی چارەگە ملیونیك بەشداریان تێدا کرد و توانییان بچنە ناو وەزارەتی بەرگری و عبدالکریم، خۆی هاتەدەرەوە و سلأوی لە جەماوەرکرد. تا سنورێکی هەست پێکراو لە تەرازوی هیزەکانی گۆری. عبدالسلام ونەتەوە پەروەرە عەرەبەکان و بەعسیەکان بۆیان دەرکەوت، کە سەپاندنی یەکێتی وچونەووکت و ناو کۆماری عەرەبی ییەکگرتو.نەوەندەکاریکی ئاسان نیە لە بەر ئەوەی هیزیکی زۆر لە دەوری حزبی شیوعی کۆبوەتەوە و ئەم دروشمە لە بەیانی یەکەمی شورش دانەهاتووە.حزبی شیوعی لە بریتی یەکیەتی کت وپر لە خۆ پیشاندانەکەدا داوای یەکیەتی فیدرالی دەکرد. بەلأم لە گەڵ ئەوەش عبدالسلام وازی لە هەولەکەی خۆی نەهیناو، وەدەیویست پەنا بباتە بەر کودەتای سەربازی بۆ سەپاندنی ئەم دروشمە. دیارە لەم بوارەشدا(میشیل عفلق) رۆڵێکی خراپی گێراوە، ئەو بەعسیە عیراقیەکانی هان دا کە لە تەك نەتەوە پەروەرەکان خەبات بوجیبەجی کردنی دروشمەکە بکەن. بێگومان ریکخراوەکانی حشع لە کوردستاندا وپارتی دیموکراتی کوردستانیش، بەگەرمی لە گەل یەکیەتی فیدرالی دابوون. عبد الکریم خوشی دژی یەکیەتی کت و پر بوو. روداوەکادوایش راستی ئەو بۆ جونەیان دەرخست. چ لە بواری دیموکراسی و چ لە بواری ئابوریشەوە. یەکیەتیەکەی میسرو سوریا زوو هەڵوەشایەوە. شایانی باسە کەحشع لە ۱۹۵۸/۷/۱۲ بەیاننامەییکی ناوخۆی بلأوکردەوە بۆ ئاگادار کردنەوەی کادرو ئەندامەکانی حزب کە لەم رۆژانەدا رووداویکی گرینگ روودەدا.بۆ ئەوەی ئاگاداربن و خۆیان ئامادەبکەن بەلأم بە داخەوە ئەم بەیاننامەیە نەگەیشتە دەست هەمو ریکخراوەکان. شورشی ۱٤/ تموز هەر لە رۆژانی هەوەڵیەوە کۆمەڵە داخوازییکی رەوای گەلی جێبەجێ کرد ئەمە ویرای رووخاندنی رژێمی پاشایەتی کە رژیمێکی

نیمچه نوکەری ئیمپریالیزم وپشت گیری دەرەبەگایەتی بوو. گرینگ ترین ئەم داخوازیانە بوو.

١- دەرکردنی یاسای کاتی کۆماری عیراق. لەم یاسایەشدا بۆیەکەم جاردەوڵەتی عیراق دانی بەوەدا کە لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێك هاتوە کە عەرەب و کوردن هەر دووکیان هاوبەشن لەم نیشتمانەدا. ریگای بە بارزانیش دا کە بگەریتەوە بۆ نیشتیمان.

٢- ئازادیە دیموکراتییەکان بۆ حزبەکان و جەماوەر بەرەڵلاکران هەرچەندە ریگانەدرا کە حزبی شیوعی رۆژنامەی خۆی دربکات تا مانگی شوباتی/ ١٩٥٩.

٣- وەزارتیکی نیشتمانی دامەزراند بە سەرۆکاتی عبدالکریم قاسم لە نوینەرەکانی ئەو حزبانەی بەشدار بوون کە لە بەرەی یەکگرتوی نیشتماندا بوون تەنیا حشع لەم وەزارەتەدا بەشداری پی نەکرا. بەڵکویەك دوو کەسایەتی چەپ هینران بۆ وەزرات کە یەکێکیان ئابوری ناسی عیراقی ابراهیم کوبەبوو.

٤- لە ٣٠/ ئەیلولی /١٩٥٨ دا یاسای چاککردنی کشت و کاڵ دەرکرا. کە تا سنورێکی هەست پێکراو دەسەلاتی دەرەبەگەکانی کەم کردەوە، هەرچەند بەریك و پێکی جێبەجێ نەکرا.

٥- زۆربەی پیاوە ناسراوەکانی سەربە رژێمی پاشایەتی دەست گیرکران و درانە دادگای گەل. کە ئەفسەری نیشتمان پەروەری عیراق(مهداوی) لەبەرپەرەسەندنی جموجۆڵی کونە پەرستەکان دژی شورشی ١٤/تموز حکوومەتی شۆرش بریاری بەرگری میللی (المقاومه الشعبیه) دابمەزرێنێ. بەبریاری سەرکردەی پروسە چالاکی عسکری ژمارە — ٩٨٩ — لە ٢٢ / تموزی/ ١٩٥٨ دا. بەلام لە کوردستان ریگانەدرا بە دامەزراندی ئەم ریکخراوەیە بەبریاری سەرکردەی (فرقەی دوەم) ی ئەو کات – ناظم طبقجلی- بوتا

دوای سەرکوت کردنی پیلانی شەواف لە موسل ئەوی من ئاگام لێی بێ بەرگی میللی نە کوردستان هیچ کارێکی خراپی نەکرد دژی پارتی و جەماوەری کوردستان.شایانی باسە لە رەواندوز ئەندامانی پارتی بەشداریان کرد لەم رێکخراوەدا بەلام سالی/١٩٥٩ دوای کارەساتەکەی کەرکوك بەرگری میللی قەدەغەکرد.کرایە سەرکردەی دادگایەکە. دادگەیەکە. بە ئاشکرا بەرێوە دەچووتەنانەت هەر دوای سەرکەوتنی شورش نۆکەرەکانی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستەکانی عیراق دەستیان کرد بە پیلان گیران دژی شۆڕش. وەکو پیلانی عبد السلام تەنانەت ریگا بەتاوانبارەکانیش درا کە داکۆکیان لە خویاندا بە ئاشکرا بخویننەوە هەندیکیان وەکو تاوانبار سعید قەزاز هیرشی بردە سەر حکومەتی کۆماری و سەروکی دادگا. کاك مسعود بە ئەرێنی باسی دادگای گەل دەکات. کە دانشتنەکانی بە ئاشکرا لە رادیۆو تەلەفزیۆن پەخش دەکا بە تاقی کردنەوەیەکی ئازایانە دەداتە قەلەم.کەویستی عبد الکریم لە ژورەکەی خۆی لە وەزارەتی بەرگری بکوژێ بەلام ترسناك ترینی پیلانانە پیلانەکەی – شواف – بوو لە موسل کە حشع و گەلی کوردستان رولێکی کاریگەریان بوو لەسەرکوت کردنی ئەم پیلانەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو عبدالناصر پشتگیری لێی دەکرا. بە تێکشکاندی ئەم پیلانە نەگریسە سەرکەوتنیکی گەورە بەدەست هات وهەستانێکی جەماوەری فراوان (مد جماهیری واسع) هاتەپێشەوە. کە دیارە قاسمی ترساند، بۆیە لەو ئاهەنگەی کەیەکیەتی سەندیکانی عیراق رێکیان خست لە ئیوارەی ٢٠/ نیسانی /١٩٥٩ دا و قاسمیان بو ئەم ئاهەنگە بانگیش کردبوو. لەوتارەکەیدا لەم ئاهەنگە گوتی پشت گیری حزب و ژیانی حیزبایەتی ناکەم لەم کاتەدا. بەلام لە سەرەتا/١٩٦٠ یاسای حزبەکان دا دریژین و بەپێی ئەو یاسایە، بوار بەحزبەکان دەدەین کاری خۆیان بە ئاشکرایی بکەن. دوایش دیارە داوای لە سەرکردایەتی حزبەکان کرد بوو کە خۆیان تجمید بکەن تجمید بکەن تەنیا حشع و پارتی خویان نەکرد ئەم وتارە سەرەتای پاشەکشەی قاسم بوو لە ردوتی دیموکراتی لە عیراقدا. کە دوای ئەمە وردە وردە دەستی کرد. بە دزینەوەی، ئەو دەستکەوتانەی کە گەلی عیراق بە تیکوشانی خۆی

بەدەستی هینا بوون. و بواری دا بەهیزە کونە پەرستەکان و نەتەوە پەروەرە عەرەبەکان بو چالاکی توندن دژی حشع لەم سەروبەندە دا خیلی برادوست باخی بوونی خۆیان لە دژی کۆماری عیراق بە سەروکایەتی شیخ رشید لولان و مەحمود بگ دەست پیکرد. ئەو کات سەرکردەی (فرقەی) دووەم کە بارەگاکەی لە کەرکوك بوو، لە ژێر دەستی ئەفسەری نیشتمان پەروەری پێشکەوتن خواز (داود الجنابی ) بوو ولە بەر ئەوەی کە ناوچەی خێلی برادوست، ناحیەی سیدەکان بوو. سیدەکانیش سەر بە قەزای رەواندوز بوو. شەویك بەرێز جەنابی هات بۆ رەواندوز و داوای کرد کە چاوی بە کومیتەی قەزای رەواندوز بکەوێ. ئێمە وەکو کومیتەی قەزا، کە ئەو کاتە بەندە بەرپرسی کومیتە کە بووم. جوین بۆلای لەوی باسی ئەو یاخی بوونەی خێڵی برادۆستی کرد، گوتی ئەگەر دەتوانن، دووکەسایەتی ناسراوی شارەکە بنیرن بۆ لای مەحمود بگ بۆ ئەوەی، پێی رابگەینن کە سەرکردەی فرقەی دوەم. بەناوی عبدالکریم بە لێنی پێدەدا، کە فروکە یەکی هەلیکوپتری بۆ دەنێرێتە سیدەکان وەدیبا بۆلای زعیم عبدالکریم. بۆ ئەوەی گفت و گۆی خۆی لە گەڵدا بکات ئەگەر ریك کەوتن ئەمە زۆر باشە، ئەگەر ریك نەکەوتن ئەوا بەو فرۆکە دەهینمەوە بۆ سیدەکان ویەك هەفتە مولەتی دەدەمی، بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات، ئینجا هیرشی دەبەمە سەر. ئیمە هەر بەو شەوە دوو کەسەکەمان ئامادە کرد کە حاجی طاهر و مصطفی ئاغابوون. یەکەمیان پەیوەندی بازرگانی لە گەڵیدا هەبوو دەمیشیان خەزوری کریم خانی کوری بوو. بۆ رۆژی دوای بە سواری ولاخ رەوانەی سیدەکانمان کردن. ئەوان لەو ئەرکەی پێیان سپیرا بو سەرکەوتوو بون ومحمود بگ لە سەر بەڵێنی ئەم دوو کەسایەتیە ئامادە بوو، بچیت بۆ لای عبدالکریم. بەلام لەو کاتەدا شێخ رەضا گولانی کە مدیر ئەمن بوو لە کەرکوك، هیرش دەباتە سەر ماڵی محمود بگ و دوو کوری دەست گیر دەکات.بەم کردەومیە کارەکە هەلدەوە شێتەودو. محمود بەگ بە پالیشتی شیخ رشید لولان هیرش دەکەنە سەر مرکزی ناحیەی سیدەکان، کە ئەو کات بیجگە لە وەفدی ئێمە قائیمقامی رەواندوزیش لەوێ بوو.

بەرامبەر بەم گورانکاریە حشع کومەلەکانی جوتیارانی لە هەولیرو رەوانـدوز هان دا بـو بەگژ داچونـەوەی، ناوچـەی سـیدەکان ولـە ماومیـەکی زۆر کـورت دا. لەهـەر دوو ناوچەکە هیزی زۆر ئامـادەکرا، هێـزی دەشـتی هـەولێر، بـە کردایـەتی شـەهید فـاخر میرگـە سـووری بـوو. هیزەکـە ناوچـەی ردوانـدوز و باڵـەکاتی بـە سـەرکردایەتی کـاك عزەتی سلیمان بگ بـوو. ئـەم دوو هێـزە کـە لایـەن بـەتالیون ردوانـدوز بـە فـەرمانی سەرکردەی (فرقە)ی هیـزە کـە لەلایـەن چـەکدار کـران و، هـەر یەکـە لەلایەکـەوە بـە لاماری سیدەکانیان دا. چەگدارەگان خێڵی برادوست کـە دیتیـان ئـەم هیـزە گەورەیـە هات بویان. لەلایەکی تریش لە ناوچەی ( کانیە رەش) کە بنکەی پولیسیان ئابلوقەدا بوو.هێزیکی بارزانیەکان بەسەر کردایـەتی بـارزانی خـۆی هێزیکـی بـەرگری ئەمیللی هەولێر و رەواندوز بەشداری خوالیخوش حمد ئاغا میرگە سوور. ئابلوقەکەیان تیـك شکاند. بـەم شێوەیە چـەکدارەکانی خێڵی برادوست بـە نـا چاری باشەکشیان کـردو ئـاودیوی سـنوری ئـیران بـوون. بـەلآم دوای دووسـێ مـانگ خۆیـان دایـە دەسـتەوەو گەرانەوە بۆ شوێنی خۆیان و، حکومەتی قاسمیش لێخۆش بوونی گشتی بۆ دەرکردن.

بەبونـەی یـاخی بـوونی خێڵی (برادوسـت) زۆر لـە ئەنـدامانی سـەرکردایەتی حـشع وحدك هاتبون بۆ رەوانـدوز – لەوانە هـاوڕێ جمـال حیـدری، عزیـز محمـد وچـەندها وری دیکەش، لە پارتیشدا بەرێز همزە عبداللە . وعمر دەبابە هات بوون.

کە هاوری جەمال بۆ نوسینگەی – اتحاد الشعب هات – ئێمە وینەیەکی زۆر گـەورەی (عبـد الکریمـان) هەلواسـی بـوو. کەچی وینـەیـەکی بچکولەی (مـارکس – ئینگلیـز – لینـنین – مـان لەتـەك وینـەی عبـدالکریم هەلواسـی بـوو. هـاوری جمـال گـوتی ئەمـە چییەبو چ ئەم وینە گەورەیە، ئەمە هەلگرن لە جیگەیدا، وینەیەکی بچوك دابـنین. لـە کـاتی قـسەکردن دا ئامـاژدی دا ، بـە وتارەکـەی قاسـم لـە ئاهـەنگی ئیـوارەی ٣٠/ یەکیەتی کریکاران، گوتی ئەمە سەرتای لادانە لە میتودی دیموکراتی دا.

شایانی باسه له ١/ ئایاری/ ١٩٥٩ دا، خۆپیشاندانێکی زۆر گەورە لە بەغدا رێك خرا. لەم خۆپیشانەدا کە ملیونێك هاونیشتمانی لە کرێکاران وچینەکانی تر بەشداریان تیدا کردبوو. دروشمی (بەشداری حشع له حوکمدا بەرز کرا بووه) له لایەن جەماوەر بەلاّم سەرکردایەتی حزبیش ئەم دروشمەی رانەگرت. لە (اتحاد الشعب) وتاریکی درێژی لە سەرنوسرا،هاوری جمال داوای کرد کوبونەوەیەکی فراوانی هاوریان ریك بیخەین، بۆ رونکردنەوەی ناوەروکی وتارەکە کوبونەوەکەمان لە هۆلی قوتابخانەی دواناوەندی رێك خست.من وام دەزانی کە هاوری جمال خۆی رونکردنەوە پێشکەش دەکا. بەلاّم کە چوینە ژورەوەی هۆلەکە. داوای لەمن کرد بەم کارە هەلبستم، منیش خۆم بۆ رونکردنەوە کە ئامادە نەکردبوو. لە گەلّ ئەوەش ناچار بوم رونکردنەوەکەم پێشکەش کرد، هاوریش هیچ نارەزایی لەسەر ئەم رونکردنەوەیەم دەرنەبری. هاوری جمال چەند رۆژێك لە لامان مایەوە.جاریکیان هەردوو بەدوو بوین. پرسیاری کرد ئەگەر داومان کرد دەتوانی دەلاوی ئازامان بۆ بنیریە بەغداد. منیش لەوە لاّمدا گوتم نەك دە دەتوانم (١٠٠) لاوتان بۆ رەوانەبکەم. لە راستیش دا لاوی وامان هەبوو چاویان لە گوللە نەدەترسا. دیار بوو هاوری جمال بیروکەی ئەوەی هەبو کە بەرامبەر قاسم، حزب کارێك بکات و جلّەوی حوکم بە دەستەوە بگرێ. بەلام تاقمە ٣ — ٤ کە سیەکەی م. س کە بریتی بون لە زەکی خیری عامر عبدالله ، بهاء الدین نوری ویەکییکی تر، لە دژی ئەم بیروکە یە بوون. بەمەش دەرفەتیکی زۆر گەورەیان لە دەست حزبدا و گەلی عیراقیش زیانی زۆر گەورەی لێی کەوت و ژمارەیکی زۆری هاوریانی سەرکردایەتی وکادری حزبمان شەهید کران لە لایەن کودەتا چییەکانی شوباتی /١٩٦٣ دا. لە پێشەوەیان هاوری لیهاتوو وسکرتیری حزب (سلام عادل) هەمیشە زیندو وجمال حیدری شۆرش خوازو قالّ بوەوە لە گورەپانی خەباتدا. ویرای عەلی و نافع یونس و دەیان کادری دیکەی جەماوەری لە راستی دا ئەو هەل و مەرجە لە باردی بۆ حزب رەخسا لە بەهاری/ ١٩٥٩ دا . بۆ هیچ حزبێکی دیکە لە جیهاندا نەرەخسا بوو، ئەو حزبەی لە سالی یەکەمی شورش توانی جەماوەریکی زۆر

له ڕێزی سوپای و گەلدا ڕێك بخات، كه بەشی هەره زۆریان ئاماده بوون گیانی خۆیان له پیناوی حزبدا به خت بكەن. بەلام بـه داخـەوه ئـەو دەرفەتـه زۆر لـه بارەمـان لـه گیس چووبەهەوای كەم تاقی كردنەوەی حزب و رۆلی هەندی هاوری نـا شورشـگێروەكو له پیشەوه ئاملازەم پی كرد.

هەر دوای خۆپیشانی ١٩٥٩/٥/١ عبد الكريم كەوته كار بـۆ كـەم كردنـەوەد جـەماوەریی حزب و پشت گوێ خستنی. وپێش ئـەوه هـەموو رۆژی رۆژنامـەی (اتحـاد الـشعب) لـه ئیستگه به غدا دەخوێندایەوه. ئەمه قەدەغه كرا. ڕێگا درا به كۆمەله رۆژنامەیـەكی كونه پەرستی كەبه ئاشكرا دەربچی كه كارو پیشەیان هەر هێرش بردنـه سـەر حـزب بوو-سەركردەی فرقەی یەكەم له دیوانیه ماوەیەكی زۆر (اتحاد شعب)ی قەدەغه كرد كەبۆ حەوت پارێزگای سـەرجەم ئـەم فرقەیـه بـچێت٠ دام و دەزگـای رژێـم كـه پـاك نەكرابوونەوه له نۆكەركانی پاشایەتی و خەلكی كۆنه پەرست٠ به هـەموو شـێوەیەك گیروگرفتیـان بـۆ هاوڕێیـان و ڕێكخراوەكـانی حـزب و یـەكێتی كرێكـاران و كۆمەڵەی جوتیاران دروست دەكرد٠ یاسـای كۆمەڵەی جوتیارانیـان هەڵوەشـاندەوه كـه لـه كـاتی مەدەجەماوەریەكـه دارێـزرابوو جوتیـارو كرێكـارو مامۆسـتا گورجوگۆڵـەكانیان بـۆ جێگەی دوور دوور دەگواستەوه٠

بۆنموونـه قائمقـامی قـەزای رەوانـدوز بـه هـەموو شـێوەیەك دژایـەتی ڕێكخراوەكـانی حزبی دەكرد و گیرو گرفتی بۆ هاوڕێیـان دروسـت دەكردوهـانی كەسـانی داخ لـه دڵـی دەدا كه دەست درێژی بكەنەسەر هاوڕێیان ئەو قائیقامـه راسـتەوخۆ لـه لایـەن قاسـم پارەمەتی دەدرا له دوایش كردی بـه محـافزی هـەولێر ، و لـه سـاڵ‌ی / ١٩٦١ دا رۆڵێـی گەورەی گێڕا له دژی پـارتی و گـەلی كوردسـتانداو هـانی دەرەبەگـەكانی دا بـۆ ئـەوەی ببنەجاش دژی شۆڕشی گەلی كوردستان. لـه ١٩٥٩/٧/١ دا سـەركردەی پیـشكەوتن خـواز فرقەی دوەمی لادا.چونكه توركمانه تورانیەكان و داخ له دڵەكان رقیان لێـی بـوو. لـه

١٤/تموزی /١٩٥٩ شدا، كه جهماوهری كركوك خوپیشاندانیكی ئاشتیانهیان ریك خست. به پیلانیكی نهخشه بۆ داریژراو.لهلایهن نوكهرهكانی كۆمپیانی نهوتی كهركوك و، چهند شانهیهكی به عسیهكان و بهپالپشتی توركمانهكان به تایبهتی له ههندی بنهمالهی ناوداری توركمان. له چهند جیگایهك تهقه له خۆ پیشاندان كرا، ئهوانیش بهناچاری داكوكیان له خویان كرد. بهم شیوهیهكارهساتهكه دهستی پێ كرد، وهاوریانی حزب رولیكی جوامیرانهیان نواند. ئهگهر نا ئهم كاره زیانیكی زۆر گهورهی لێ دهكهوتهوه. ئهمه له قسهكانی قائد فرقه دوهمدا هاتوه، كه دوای جنابی به قائد فرقه داندرا كه له دادگای پیشكهشی كرد. بهلام و دهستگای رژیمی قاسم بهو پهری داخ له دلیهوه ئهم روداوه یان قوستهوه. به ههزاران له دوست و هاوریانی حزب دهستگیر كران، قاسمیش له كهنیسهی مار یوسف له بهغدادا، رۆژی ١٨/تموز هیرشیكی نارهوای كرده سهر حزبمان بۆ دادگای گیراوهكانی كركوك. به محكمهی عورفی سپیرا كهمنا بطی كونه پهرست ناسرابوو له گیراوهكان ژمارهیهكی زۆریان دادگایی كران و ههندی بریاری دادگایی قورسیان بهسهردا درا. بهلام تاوانی ههره گهوره بهرامبهر حزبمان و جهماوهری كوردستان، ئهوه بۆ كه ١٨ كهسایهتی ناسراوی ئهم شارهوه دهوربهری، حوكمی له سیدارهدانیان به سهردا به نارهوای سهپینراوههرچهنده حزب زۆر ههولی ئازاد كردنیان دان. قاسم ههر له بهندی خانهی هیشتهوه، تاكو دهتای رهشی شباتی /١٩٦٣ سهركهوت. ئهم بیست و ههشت كهسایهتیه زۆریان كورد بوون، بهلام چهند توركمانیكی نیشتمانپهروهرشیان له گهل دابو وهكو مهدی مهردان. كورده ناسراوهكان، شیخ معروف بهرزنجی و شیخ حسینی برای و جهبار پیروز خانی محامی و كومهلیكی تر بوون. كه دوای پیلانیكی/١٩٦٣ هینانیان بۆ كهركوك وئهوی له سیدارهیان دان، بۆ رازی كردنی كۆمپانیای نهوت، ههندێ بنهمالهی توركمانی كۆنهپهرست. ویرای ئهمهش ههیكهلیكی گهورهیان كرد، گهوره بۆ ئهو توركمانانهی له ١٩٥٩/٧/١٤ كوژراون. بهم شیوهیه ههلگهرانهوهی قاسم له ریبازی دیموكراسی دهستی پیكردو، تاكودهتای حوكمهكهی دیكتاتوریه به دریژهی

کیشا ناوه ناوه ئەم هەلگەرانەوەیە توند تردەبوو ئەم پەلامارەی رژێمی قاسم هەر لە چوارچیوەی کرکوك نەمایەوە. بەلکو پەل و پۆی بۆ ناوچەکانی تریش برد، بۆ نمونە لە موسل بە هان دانی دام و دەستگای قاسم دەست کرا بە رەشە کوژەکردنی ئەو رۆلە نیشتمان پەروەرانەی. رۆلێکی کاریگەیان هەبوو، لە تیکشاندی پیلانەی کەی شوان، ئەمە ویرای راوەدو نانی کادرە ناسراوەکانی حشع بەلکو ئەم پەلامار دانە جەماوەریشی گرتەوە. پەلامارەکە گەیشتەرادەی ئەوەی کە بەسەدان خیزانی دیموکرات خوازو کورد. شارەکە چۆلْ بکەن روو بکەنە هەولێر و بەغداد و شارەکانی تر ئەتوانم بلیم ئەم پەلامارە هەموو عیراقی گرتەوە درێژەی کێشاتا کودەتا شباتی ۱۹۶۳/ و روخانی رژیمەکەی قاسم. کە بەعسی و نەتەوە پەروەرەکانی عەرەب هەموو عیراقیان کرد بە گۆمی خۆین هەزاران تیکوشەری راستەقینەیان لە ناو برد. بەمەش گەورەترین خزمەتیان بەنەخشەو پیلانەکانی دەولەتە ئیمپریالیزمو کونە پەرستەکانی کردو. لە راستیدا تولەی بەرپاکردنی شورشی ۱۴/تەموزیان لێی کردنەوە، وعیراقیان زیاتر لە چل سال بەرەو دواوە گەرانەوە. قاسم لە سەرەتای سالّی/۱۹۶۰ دا، یاسای حزبەکانی بریار لە سەردا. بەپێی ئەو یاسایە، مولەت درا بە حزبی وطني دیموکراتی، حزبیکی تر بەسەر کردایەتی(محمد حدید) کە لە کامل چادر چشی هەلگرایەوە بەتاواوی بووە نوکەری قاسم. و پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبیك کە بە ناوی شیوعیەوە دواکرد بە بەرپرسیاری (داود صائغ) کە یەکیك بوو لە کونە شیوعیەکان پەیوەندی لە گەلْ حزبدا نەماو، دیار بوبوە نوکەری قاسم

بەم بیانوە حزب شیوعی لە پێدانی مۆلّەت بێبەش کرا، هەرچەند تاوەکەی خۆی ویەك دووجار دەست کاری بەرنامەو پێرەوی ناوخۆی کرد . لەمە دەردەکەویّ کە قاسم بە پیّ یاساکاری نەدەکرد , بەلکوبە گویرەی ویست و هەلویستی خوی کاری دەکرد . لەگەل ئەوەی قاسم مولەتی دا بەپارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی . بەلام زوری نەبەرد , کە لەگەل پارتیشدا کەوتەملا ملانی . جونکە پارتی داوای مافەکانی

نەتەوەی کوردی دەکـردو , قـاسمیش ئامادەنـەبو دان بـەم مافانـەدابنێ . بـەم شـێوەیە قاسم دوای کەمتر لە ساڵێك لەمۆڵەت پێدانی پارتی کەبە ئاشکرائیش بکات. کەوتە پـەلاماردانی ڕیخکراوەکـانی بۆنمونـە هەرلـە مـانگی ئـەیلول /١٩٦٠ داویـستی چەند ئەندامێکی ناوسراوی لەناوچەی خوشناوەتی لە شقلاوە دەست گیر بکات بەلأم خۆیان نەدا یەوە ستەودو، درێژە یان بە خەباتی خویان دا.

من کە لە سەرەتای/١٩٦٠ دا بۆ سلیمانی بە شێوەیەکی ئیداریـەوە گواسترابومەوە بۆ سلیمانی لە پاییزی هەمال سال دا گوازرامـەوە بـۆ شـەقلاوە. هـەل و مەرجی شەقلاوە نەختێ ئالوز بوو. ولە سەرەتای/١٩٦١ دا. مـەحمود کـاوانی لـە سـەر ڕێگـای هەولێر – شقلاوە لە نزیکی گونـدەکەیان (صدیق میرانی) برای عوسمان میرانی کوشت بەم کارە بـارو دۆخوکـە ئـالوز تـر بـوو. ڕژیمـی قاسـم بـە فـشاری مـاڵی مـیر، پـەلاماری چەند ئەندامیکی دیکەی پارتی دا. بەلأم ئەوانیش زۆریان ڕایان کرد ونەگیران.

دوای چەند ڕۆژێك ماڵ میر ژمارەییکی زۆریان چەکدار هینایە ناو شارەکەو لە سەر ڕێگـای شـەقلاوە – هـەریر حـاجی ناصـری بـاوکی حـسن ناصـریان شەهید کـرد.دانیـشتوانی شـەقلاوە لـە سـەرو مـالی خۆیـان دلنیانـەبوون. ئـەم ئیـوارە هەلومەرجێکی ترسناك باڵی بە سەر شارەکەدا کیشاوبەهۆی ئـەم بارودوخـە نالەبارە پیشنیاریکمان ئاراستەی ڕیکخراوی پارتی کردو، داوامان لێی کردن.

کە یاداشتێك بە ڕێگای قائیمقامی شەقلاوە ئاراستەی محافظ (متصرف) بکەین. کە ئـەو کاتـە یـەکێك لەئەفسەرەکانی شۆڕشـی ١٤ /تـەمووز بـوو. پیـاوێکی لەسـەر خـۆو هێمن بوو –ڕێکخراوی پارتی ئەو پێشنیارەیان قبوڵ کرد. هەر ئـەو دەمەیاداشـتێکی توندیان نووسی دەمانەوەێت وەفدێکە پارتی و شیوعی – کەلە ڕێگای قائیمقـام هـەر ئەو شەوە ڕەوانەی هەولێر کرا. ڕۆژی دوای بەیانی زوو دوو لقـی سـەربازیان ڕەوانـە کرد، ئەم دوو لقە توانیان بارو دۆخـی شـارەکە هێوربکەنـەوە . ڕێکخـراوی پـارتی لـە

شەقلاوە لەم جارە زیاتر ئامادەبوون کە هاوکاری ڕێکخراوی حزب بکەن کە ڕێکخراوێکی فراوان و جەماوەری بوو لە ساڵی / ١٩٦١ دا ڕژێمی قاسم باجی زەوی بەسەر جوتیارانـدا سەپاند ئەم باجە زۆرنـا ڕەوا بوو.بۆیە چەند لیژنەیەکی هاوبەشی ئیمە و پارتی لە پارێزگای هەولێر پێکهێنران. لە پێناو هەڵوەشاندنەوەی ئەم باجە بەڵام قاسم گوێی بەسکاڵای جوتیاران نەدا و باجەکەی هەڵنەوەشاندەوە. دەستیان کرد بەلەشکر کۆکردنەوە دژی قاسم و دژی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ. داواشیان لە سەرکردایەتی پارتی کرد کە سەرکردایەتیان بکات، بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش. دیارە زۆربەی ڕێکخراوەکانی  پارتیش ئەو کات بە هۆی لە خۆبایی بوونیان لەگەڵ بەرپاکردنی شۆڕش لەدژی ڕژێمی قاسم دابوون کە هیچ مافێکی بۆ نەتەوەی کورددابین نەکردبوو.تا لەو هەل و مەرجە ناسك وئاڵۆزە دا ، لە ١٩٦١/٩/١١ دا تەقە لە کاروانێکی سوپای عێراقی کرا ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژران. لەو وەرچەرخانەدا قاسم فەرمانی دا \کە فڕۆکە جەنگیەکانی ڕژێم هێرش ببنە سەر دەربەندی بازیان و دەربەندی ڕانیە و بارزان بۆیە لە سەرەتا حزب نەیتوانی لەم دیاردە ئاڵۆزەدا هەڵوێستێکی زانستیانەی هەبێ. بەڵام بەیاننامەکەی لقی کوردستان و ناوەندیش زۆر داکۆکیان لە خێڵی بارزان و پارتی کرد. قاسمیش لەبەر ئەوەی کەسایەتیەکی توندو تیژی هەبوو بیروباوەڕی نەتەوەپەروەری تەسکی هەبوو. هیچ بایەخی بە بەیاننامە دڵسۆزانەکانی حشع نەداو، بە سوپاو فڕۆکە جەنگیەکانی پەلاماری هەموو ناوچەکانی کوردستانی داو زیانێکی زۆر گەورەی لە خەڵکی بێ تاوانی کوردستان گەیاند. دوای چەند ڕۆژێك کە ئەو یاخی بوونەچەکداریە کۆتایی هات. ڕەنگە لەشکرکێشیەکەی دەرەبەگەکان کۆتایی هاتبێ. بەڵام بەرانگاریە جوتیاریەکە بە هاندان و ئاراستەی ڕێکخراوەکانی پارتی درێژەی هەبوو٠٠٠٠ ئەو کاتە سەلام عادل لەدەرەوەی وڵات بوو ، م٠س٠ لە ژێر دەستە تاقمە ڕاست ڕەوەکەدا بوو. کە نەیان دەویست بە هیچ شێوەیەك قاسم لە خۆیان نا ڕازی بکەن. هەر بۆیەش نەیانتوانی هەڵوێستی زانستیانە لەبارەی ئەم دیاردەیە وەر بگرن . سەپاندنی جەنگ بەسەر

گەلی کوردستان پێگەی کۆنەپەرست و دەرەبەگەکانی لە کوردستان بەهێزتر کرد، بوە هۆکاری لێکدابڕانی هێزە نیشتمانی و دیموکراتییەکان.

هەر دوای تێکچوونی بارودۆخی کوردستان لە ساڵی/١٩٦١ دا رژێمی قاسم پەلاماری فراوانی گواستنەوەی مامۆستاو و پۆلیس و کارمەندانی کوردستان دەست پێکرد.بۆ باشووری عێراق منیش بەر ئەم پەلاماردکەوتم.چونکە (بدرالدين على) متصرف هەولێر راپۆرتێکی زۆر خراپی لەسەر نووسی بووم،کورتکراوەکەی ئەوەیە کە وێرای بوونی لە جماعەتی (اتحاد الشعب) بە کوردییەکی جیاوازخوازیشی تاوەنبار کردم. بێجگە لەمەش شەوێك هاتن منیان گرت رەوانەی هەلێریان کردم. لەگەڵ کۆمەڵێك لەگەڵ کادیرەکانی پارتی، دوایش ئێمەیان بردە لای(متصرف) ئەویش زۆر هەڕەشەی لێکردین لێمان تووڕە بوو. سەرەڕای ئەمەش بەبەندکراوی رەوانەی بەغدایان کردم، وزیاتر لە مانگێ منیان هێشتەوە، ئەو جارە ئازادیان کردم بەمەرجێ یەکسەربڕۆم بۆ پارێزگای ناصریە. بەم شێوە دڕندانە گواسترامەوە بۆ پەروەردەی ناصریە، لەوێشەوە لە قوتابخانەیەکیان دانام لە ناو زۆنگاوەکاندا بوو.

زۆربەی مامۆستاکانی قوتابخانەکەم بەعسی و نەتەوەچی عەرەب بوون بۆیە هەر زوودەستیان کرد بە دژایەتی کردنم هەوەڵ جار لەبەر ئەوەی کە کوردبووم.

دوایش بۆیان دەرکەوت کو شیوعیم بۆیە هەموو رۆژێ لەلای بەڕێوەبەری ناحیە کە مفەوەزی پۆلیس راپۆرتیان لەسەر دەدام، کە لە فلان دوکان یان چایخانە کۆبوونەوەم بە خەڵك کردووە. بەڵام دیاربوو ئەم دووانە پیاوی باش بوون گوێیان بە راپۆرتەکەی ئەوان نەدەدا. لە هەڵبژاردنی مامۆستایانیش لەسەرەتای ساڵی / ١٩٦٢ دا بە هەموویان مامۆستایانی قوتابخانەکەم دەست درێژیان لێکردم و زۆریان لێدام.

ـوی گواستنەوەم بـە ماوەیـەکی کـەم بـاوکم لـە رەوانـدوز کۆچـی دوایـی کـرد. تـا گەیشتمەوە نێژرابوو پرسەکەشی خەریکی تەواو بوون بوو. ناحیەکە نـاوی – فهود ـبوو، کە لەناو زۆنگاوەکەدابوو، تـازە کرابـووە ناحیـە. بۆیـە زۆر دواکـەوتوو بـوون، هەرچەندە بازارێکی نیمچە گـەورەی هـەبوو، بـەڵام بێجگـە لـە سـاختمانی کـارگێری ـاحیـە و بنکـەی پۆلیسـشی قوتابخانـە، دووکـان و خانووەکـانی ئاوایـە کـە گـشتی لـە (حەسیر) لەگەڵای خورما دروست کرابوون.

دانیشتوانی ناوچەکە زۆر دواکـەوتوو بـوون ئەوسـا نەخوێنـدەوار بـوون. قوتابخانـەی کچانی لێ نەبوو تەنیا دوو پۆلی یەکەم و دووەمی کچانی لـێ بـوو ئـەوانیش هـەر لـە قوتابخانـەی کـوڕان دەیـان خوێنـد و هـەر مامۆسـتایانی پیـاو دەرسـی پێـدەگوتن. لەزستاناندا ئاوهەوای خۆش بوو سەرما نەبوو. بەڵام هەر لە سـەرەتای مـانگی ئایـار گەرمایەکی بە تەوژم دەستی پێ‌دەکرد.

ئەم ناحیەیە سەر بە قەزای (جبایش)(جـەزائر) بـوو، کارگایـەکی ئۆتـۆبێلی دروست کرابوو لە نێوانیان بە ناوزۆرنگاوەکە دا.

زۆر نەمامـەوە لـەوێ کـە گواسـتنەوەی حـزبیم بـۆ هـات و کۆمیتـەی محلی ناصـریە توانیان پەیوەندیم لەوگەڵ بکەن. منیش ناونیشانی زۆربەی مامۆستایانی هـەولێرم پێ دان بۆ ئەوەی بە خێرایی پەیوەندیم پێوە بکەن. پێش ئەوەی من بچم بۆ ئەوێ، یـادی بـەخێر ( موسـی خلیـل) کـە بەرپرسـی سـەندیکای مامۆسـتایانی هەولێربووگواسـترابووەوە ئـەوێ. ئـەم مامۆسـتا رەحمەتییـە زۆر یارمـەتی مـن و مامۆستایەکانیشی دەدا. و ئـەختێ خزمایـەتی لەگـەڵ (مارفـە)کەچـەڵ هـەبوو. دوای ماوەیەك لە چوونم بۆ ئەوێ بە کاك موسایان گوت بوو فلان کەس ئەناسی، ئـەویش گوتبووی بەڵێ پێی گوتبوو لە جیاتی من زۆر سەلامی لێبکە و پێی، بڵێ (بدرالـدین علی) راپۆرتێکی زۆر خراپی لەسەر نووسیوە. بـەڵام لـە مـن بـەولاوە کەسـی تـر ئـەو

راپۆرتە نابینیِ، لە راستیشدا لەو لێپێچانەوەی ساڵی / ١٩٦٣ لەگەڵمدا کراو دادگای عورفیش هیچ ناوی ئەم راپۆرتە نەهات بوو. هاوینی / ١٩٦٢ کە گەڕامەوەچاوم بە هاوڕێیانی کۆمیتەی محەلی کەوت. دیار بوو لەو رۆژانەدا کۆبوونەوەی محەلی دەبەستراگوتیان مەڕۆ لە کۆبوونەکەدا ئامادەبە. لەم کۆبوونەوەیەدا کە بە چاودێری هاوڕێ عەزیز محمد بوو. زۆر باسی ئالۆزی بارودۆخی کوردستان کرا. بەتایبەتی ئەم یاداشتەی کە م.س پارتی ئاراستەی کۆمیتەی ناوەندی حزبمانی کردبوو. شایانی باسە کۆمیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیدا، لە مانگی ئاداری ١٩٦٢ دا دانی بە بزووتنەوە چەکدارییەکەی کوردستان نا و داوای لە حکومەتی قاسم کرد، کە کێشەی نەتەوەی کورد بە ڕێگایەکی ئاشتیانەو دانـان بە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کوردستان چارەسەر بکات. هەروەها داوای لە رێکخراوەکانی حزب کرد، کە لە پێناو جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانەی (ك.ن) بە کۆمەڵێ جموجووڵی ئاشتیانە هەڵبستن. بە کردەوەش رێکخراوەکان بە کۆمەلی چالاکی هەڵسان وەکو ئیمزا کۆکردنەوە و دروشم هەڵواسین و خۆپیشاندان و لە شاری بەغدا هاوڕێیەکمان شەهید بوو لە کاتی دروشم هەڵواسیندا.

وەکو دێتەوە بیرم پارتی لەم یاداشتەدا، داوای لە حزب کردبوو کەبەشداریبکات لە شۆڕشی ئەیلول دا و بەرەیەکی نیشتیمانی لە نێوان پارتی و شیوعی پێکەوە بندرێ. حزبمان لەوەڵامی یاداشتی پارتیدا، رای وابوو کە بەرەکە لەنێوانیاندا بکرێ، بەڵام هەر لایەك لەسەر شێوازی خەباتی خۆی بمێنێتەوە دیاربوو سەرکردایەتی پارتی بەمە رازی نەبوو.

زۆرینەی هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوخۆی هەولێر لەگەڵ ئەوەدابوون کە بەشداری لە شۆڕشی چەکداری بکەین. هاوڕێ عەزیز دەیگووت ئەگەر ئێمە وەکو حیزبی شیوعی بەشداری

بکەین، دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان و دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی دەوروبەر دژایەتی شۆڕشەکە دەکەن، هەلو مەرجەکە زۆر ئالۆز دەبێ. لەسەر داوای هاوڕێیان من ئەو

هاوینــه لــه رەوادوز نەمامــەوە و ماڵەکــەم هێنــابووە هــەولێر و کۆمیتــەی شــاری هەولێریان دایه دەستم بوومه ئەنـدامی نووسـینگەی محەلی دوای ماوەیـەك هـاوڕێ عــەزیز گەڕایـەوە بـۆ هـەولێر، چـونکه بەرپرسـی لقـی کۆمیتـەی کوردسـتان بـوو. دیاربوو بۆ ئەوە هاتبوو کە بچێت بـۆ لای بـارزانی، بـۆ ئـەوەی باسـی ئـەو بارودۆخـە نوێیەی لەگەڵ دا بکات. لەو ڕۆژانەدا کاك عزەتی سلێمان بـەگ بـه خـۆی و کۆمەڵـە چەکدارەکی له هەولێر بوو. من پێم گوت دەتوانی هاوڕێ عەزیز لەگەڵ خۆت ببـەی بۆ رەواندوز، لـەوێش رەوانـەی لای بـارزانی بکـەی، ئامـادەیی خـۆی پیـشان دا. بـەلام هاوڕێ عەزیز وای پێباش بوو، کە بە ڕێگای کۆیێ بڕوات دوای دوو سی ڕۆژ چوو بۆ کۆیێ، بەلام ئەوەندەی پێنەچوو گەڕایەوە، چونکه یەك دوو شەو پێش گەڕانـەوەی ، له کەرکوك له ماڵی هاوڕێ (احمد غفور) خـۆی دابـو سـەربازو شـێخ علـی بـەرزنجی گیران. له کۆیێ وایان له هاوڕێ عەزیز گەیانـدبوو ، کە هەموو ئەندامانی لق گیراون. بەم شێوەیە سەردانەکەی هاوڕێ بۆ لای بارزانی نەمر ئه جارە سـەرنەکەوت. دوایـی له زستان دا کە له ناصریه بووم هاوڕێ دڵزار پێـی گـوتم هـاوڕێ عـەزیز رۆیـشتووە بۆلای بارزانی . ئێمه چەند ڕۆژپـێش کودەتـای شـوباتی ١٩٦٣ بـوو. وای بـۆ دەچـووم کەلــه وانــەبوو هــاوڕێ عــەزیز لــە هــاوینی / ١٩٦٢ ســەردانەکەی ســەرکەوتوو وەرچەرخانێك له خەباتی حیزبمان دەهاتە پێشەوەو بە قازانجی حیزب دەشکایەوە. شایانی باسه سکرتێری ئەو دەمـەی حیـزب، هـاوڕێی هەمیـشه زینـدوو سـەلام عـادل، دوای کۆبوونەوەی کۆمیتـەی ناوەنـدی ك.ن ، له مـانگی ئـاداری ١٩٦٢ دا ڕاپـۆرتی ك.ن بۆهەموو حزبەشیوعیەکانی جیهان رەوانەکرد. لەگـەڵ نامەیـەکی خۆشـی داو، داوای له هەموو حیزبه شیوعی و کریکاریەکانی جیهان کرد.کە داکۆکی لـه کێـشەی ڕەوای گـەلی کوردسـتان بکـەن و فـشار بخەنـه سـەر حکومـەتی قاسـم کـه ئـەو شـەرە دەسـت درێژیکاریەی دژی گەلی کوردستان رابگری. کێشەکە بەرێگای ئاشتیانەو دیموکراتیانـه چارەسەر بکات. بە راستی هاوڕێ سەلام عادل، نێونەتەوەیی (اممی) ڕاستـەقینەبوو. دۆستێکی بەئەمەکی گەلی کوردستان بوو.هاوڕیەکی هەرە دڵسۆزبوو بـۆ بیروبـاوەڕی

مارکیزم – لینینیزم و چینی کریکاران و گەلە عێراق بە گشتی. لە هاوینی / ١٩٦٢ دا حیزب بریاری دا ، کە دەست لە کاری خۆم هەلگرم و ببمە محترف یانی بۆ حزب ئیش بکەم و بەس، بەلام من بەو بڕیارە رازی نەبووم ووازم لە کارەکەم نەهێناو، گەڕامەوە بۆ ناصریە. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەبوو، هەرچەندە تێبینی زۆرم هەبوو لەسەر سیاسەتی ئەوسای حزب، بەلام نەدەبوو بە هیچ شێوەیەك بڕیاری حزب رەت بکەمەوە. لەسەر جێبەجێنەکردنی ئەم بڕیارە، دیارە کۆمیتەی ناوخۆی هەولێر بەبێ ئامادەبوونی خۆم بڕیاری وەلانانی منیان داوە لە کۆمیتەی ناوخۆیی ئەم بڕیارە درێژەی هەبوو تا ساڵی / ١٩٦٣ کە لە سلێمانی بەرپرسی کۆمیتەی شار بووم. ساڵی خوێندنی / ١٩٦٢ – ١٩٦٣ لەسەر داواوی خۆم بۆ ناحیەی(قلعە سکر) گوازرامەوە لەوێ وەکو ئەندامی قەزاکارم کردتا رۆژی کودەتای شوباتی/ ١٩٦٣ . لەو کاتەوە معاونی پۆلیسی ناحیەکە ئەندامی حزب و خەلقی سلێمانی بوو، پێی گوتم مەترسێ من بوار نادەم بگیرێی لێرە، تەنیا ئەگەر لە هەولێر داوات نەکەن. منیش وام لێك دایەوە کە لەوانەیە ئەمنی هەولێر زۆر سەرقاڵ بێت و منی لە بیر نەبێ. بەلام معاون ستار کە منی باش دەناسی لەبیری نەکردبووم، بەبروسکە داوای گرتن و رەوانەم بۆ هەولێر کرا لە ١٩٦٣/٢/٢٨ گیرام و معاونەکە کە ناوی سلاح بوو پێیراگەیاندم، کە لەسەر بروسکەی هەولێر تۆمان گرتووە. ئینجا لەوێ گوازرامەوە بۆ هەولێر لەوێشەوە بۆ رەواندوزی.

شایانی باسە کە لە ( قلعە سکر) بووم لەوبیست رۆژەی دوای کودەتا یەك دوو جار تەنزیم رێکخرایەوە، بەلام زوو هەڵدەوەشایەوە، چونکە گرتنی هاوڕێیان بەردەوام بوو تاقمی کودەتا چییەکان بڕیاریان دا هەڵبژاردن بکەن لە دواناوەندی قلعە. قوتابیەکان هاتن بۆ لام، منیش پێم گوتن بە تاکە کەسی خۆیان کاندید بکەن. بەم شێوەیە هەموو هاوڕێیانی ئێمە دەرچوون. بەلام دوای دوو رۆژ هەموویان گرتن. تامن گیرام هەموو هاوڕیانی ك - قەزاو ژمارەیەکی زۆری هاوڕێیانی تر گیرابوون، بەلام هیچ لێپێچانەوەیان لەگەڵ نەکرابوو.

(قلعه سكر) ناحیەکی گەورەو ئاوەدانەکەوتۆتە سەر روباری (غـراف) کەلـە روبـاری (دیجلە) هەلبەستراوە ناوچەویەکی فراوان لە قەزای – رفاعی – و لـە قـەزای شـەترە دا بەراو دەکات٠ دانیشتوانەکەی ئـەو کـات لـە ٩٠٪ کوردی فـەیلی بـوون و دەسـەلاتی حزب زۆر فراوان بوو لە ناو شارەکەدا ٠ لـە رەوانـدوز لێپێچانەوەیەکی زۆر هـێمن و ئاسایی کرا لەگەڵمدا٠ منیش تۆمەتەکانم رەت کردەوە٠ دوای دوو مـانگ مانـەوەم لـە رەوانـدوزدا٠ هـەموو گیراوەکـان کـە شـیوعی بـوون رەوانـەی هـەولێر کـراین، چـونکە بارودۆخەکە لە کوردستان بەرەو گرژی دەرۆیشت٠

شایانی باسە خەلکێکی زۆر لە هاورێیانیئێمە گیرابوو٠ لەگەل ئەوەش ژمارەیەکی کە ٧٠ – ٨٠ هـاورێ دەبـوون، بنکەیـەکی پێـشمەرگەیان لـە باشـووری – رۆژهەلاتیـە رەواندوز کردبۆوە، کە لە گەلیەکی بچووك دابوو پێیان دەگوت (لۆغان)تا شەر لەگەڵ رژێـم دەسـتی پێکـردەوە، لـەبارودۆخێکی زۆر سـەخت دەژیـان٠ هـەموو نـان پەیـداکردنیان لـە سـەر شـاری رەوانـدوزبوو، ئـەوەیش برادەرانـی رێکخـراوی پـارتی بەزەحمەت رێگای دەدا خواردەمەنیان پێبگات و هاورێیەکیـشمان لـەوێ شـەهید کـرا بە تۆمەتێکی هەڵبەستراو٠

بـەلام دەسـت پێکردنـەوەی شـەر لەلایـەن رژێمـی دکتـاتۆری تاقمەکـەی کودەتاچیەکانەوە،بەهۆی بەشداری کردنی چالاکانەی هاورێانمان لـە شـەرەکانی(گەلی علی بەگ) و سپیلك دا وەزعیـان هەنـدێ باشـتربوو٠ئێمـەی دەسـت گیـسراکراوەکانی رەوانـدوز ،پێش هەلگیرسانەوەی هێـرس بۆسـەر کوردسـتان، گوازرایـنـەوە بـۆ هـەولێر لەگرتوو خانەی هەلێر بارودۆخمان خراپ نـەبوو، چـونکە پاسـەوانە نەتەوەییـەکان، دەسەلاتیان بەسەر گرتووخانەکە نەبوو٠ موتەسەریف قەدەغـەی کردبـوو، بێنـە نـاو گرتوو خانەکەوە بەلکو ئەگەر ویستبایان گرتوێ ببەن، دەبوو بە نووسـراوی فـەرمی داوای بکـەن و نـابو بـەبێ دەسـت نیـشان کردنـی کـاتی مانـەوەی لەلایـەن گلـی بدەنەوە٠(بدرالدین علی) هەرچـەندە رقـی لـە کـوردو شـیوعی دەبـۆوە ئەوەنـدوەش رقـی لـە بەعـسیەکان دەبـۆوە٠ بۆیـە پـێش کودەتـای ١٨/ ت٢/ ١٩٦٣ پاسـەوانە

نەتەوەییەکان لە هەولێر دەرکردن. چونکە زۆر ئەشکەنجەی کۆمەڵە قوتابییەکیان شیوعیان دابوو، دیاربوو کەس و کاریانلەلای متصرف سکالایان کردبوو. هەروەهاچێشت لێنەری گرتوخانەی هاوڕێی خۆمان بوو ناوی مام شەریف بوو یادی بەخێر بی، نامەی منی بۆنوسینگەی کۆمیتەی ناوخۆیی دەبردو، نامەکانی ئەوانیشی بۆ من دەهێنا کەبە خەتەکە دەمزانی. هـ - مام قادر نامەکانی بۆ دەنووسین هەواڵەکانی حزب و چالاکییەکانی پێشمەرگەی بۆ دەناردین. رادیۆیەکی بچکۆلانەمان هەبوو، گوێمان لە مۆسکۆ و دەنگی گەلی عێراق دەگرت کە ئیسگەیەکی نهێنی بوو. ئێسگەی مۆسکۆ بەشێکی باشی بۆ رووداوەکانی عێراق و دەست درێژیەکانی حکومەتی کودەتای بەعسی تەرخان دەکرد، کە ویرای ئەێمەی شیوعی و شۆڕشی گەلی کوردستان، پەلاماری نەتەوە پەرستە عەرەبەکانیشی دەدا، پاسەوانە نەتەوەییەکانی بەردابوە گیانی هەموو خەڵکی عێراق و کوشتن و ئەشکەنجە دانی خەلکی عێراقی بە حلاڵ کردبوون رۆژانە تاوانی نامرۆڤانەیان دژی جەماوەر ئەنجام دەدا. بۆیە ببونە جێگای نەفرەتی هەموو گەلی عێراق. لەم سەرو بەندەدا، عەریفی ئازا و بەجەرگ (حسن سريع) بزوتنەوەکەی دەست پێکرد. بەڵام بەداخەوە بە هۆی هەندێ هەڵەی کە کران و خۆئامادە نەکردنی تەواو، ئەم بزوتنەوە ئازایانەی سەرنەکەوت. لەگەل ئەوەش ئەم بزوتنەوەیە، جارێکی تر دوپاتی کردەوەکە حزبی شیوعی رەگ و ریشەی لە ناو جەماوەرو سوپای عێراق هەیە. لە هەمان کاتدا خۆراگری سەرکردەکەی بزوتنەوەکە ، لە بەردەم دادگا نا دادپەروەرکەی بەعسی، پەندێکی بەنرخ بوو بۆ خەڵك و مێژوو.

بەڵام بەداخەوە حزب ئەو کاتە بە هۆی چالاکی تاقمە تێك دەرەکەی ناو م.س لەسەر رێبازێکی راست رەو دەرۆیشت چونکە ئەگەر سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانەی هەبوایە، پێویست بوو حزب، شۆڕش دژی قاسم و دام و دەزگاکەی بەرپا بکات چونکە قاسم بەتەواوی مل کەچی هێزە کۆنەپەرستەکان بەسەر کردایەتی بەعس بوو. هەر لە دوای لێدانەی لە ٧/ت١ / ١٩٥٩ ، قاسم ترساو چاوی بۆ شۆڕ کردن

ئەمەو وێرای سیاسەتە چەوتەکەی کە دەیویست هەرماوەیەك پەیوەندی خۆی لەگەڵ لایەنەکدا خۆش بکات و تەنازلاتی بۆ بکات و دژی لایەنەکانی تر بوەستێتەوە. سەرەرای ئە جەنگە نارەوایەی دژی گەلی کوردستان سەپاندبووی بەم رێبازە قاسم خۆشی لەناو بردو دەستەو دڵسۆزەکانیشی دوچاری زیانێکی زۆر گەورە بوون. بەڵام من وای بۆ دەچم کە سەرکردایەتی حزبی شیوعیش ئۆبالێکی زۆری دەکەوێتە سەر. چونکە قایسم تاقەکەسێك بوو بە ئارەزووی خۆی حوکمی دەگێرا. کەچی حزب بریتی بوو لە ژمارەیەکی زۆر رێکخراو و کۆمیتەی جۆراوجۆر تا دەگاتە ، ك. ن و ئەوەی من ئاگام لێی بێ زۆربەی رێکخراوەکانی حزب داوایان دەکرد کە حزب شتێ بکات لە دژی قاسم کەچی وەڵامی حزب ئەوەبوو کە هێشتا(شەحنە)ی نیشتیمانی تێداماوە، بۆیە راست نییە حزب هیچ شتێك بکات دژی ئەم پیاوە نیشتمان پەروەرە !!! لە ٨/ت٢ / ١٩٦٣ دا، عبدالسلام عارف بە هاوکاری لەگەڵ نەتەوەپەروەرەکانی، کودەتایەکی دەست پێکرد دژی بەعسیەکان. وەلە ماوەیەکی کورتدا لە حوکم لایدان، و نەتەوەپەروەرەکان کاروباری وڵاتیان، بەدەستەوەگرت. هەرچەندە عبدالسلام هاوبەشی بەعسیەکان بوو، لەو تاوانەی دژی شیوعیەکان و دیموکراتیەخوازەکان و گەلی کوردستان ئەنجام دران. خۆشی پیاوێکی کۆنەپەرستی دڵ رەق بوو. بەڵام بە لادانی بەعسیەکان لە حوکم و هەلوەشاندنەوەی پاسەوانی نەتەوەیی ( الحرس القومی) بارێکی زۆر قورسی لە سەر شانی هێزە دیموکراتیەکان لادرا.گۆرانکارێکی هەست پێکراو لە هەل و مەرجی سیاسی هاتە پێشەوە.بۆ نموونە لە گرتووخانەی هەولێر، هەموو مافێك لە گیراوەکان زەوت کرابوو. نە مواجهە هەبوو، خواردن و جل و بەرگ قەدەغەکرابووبێتە گرتووخانە، رێگامان پێنەدەدرا رۆژی یەك کاتژمێر لە حەوشەی گرتوخانەکە پیاسە بکەین. بەڵام دوایکودەتا معاونێکە تری پۆلیس بۆ گرتوخانەداندرا. خۆی داوای کرد کەچ داخوازیمان هەیە پێیرابگەیەنین. ئێمەش هەموو داخوازیەکانمان پێگوت، رازی بوو هەموویان جێبەجێ بکات و، دوایش گفتو گۆ لەگەڵ کاربەدەستانی نوێ ی

عێراق و سەرکردایەتی شوباتی / ١٩٦٤ کوتایی هات. ئەم شەڕ راگرتنە هەرچەندە ڕژێمی نوێ پێویستی پێ هەبوو. بەڵام بە گوێرەی پێشمەرگەو گەلی کوردستانیش پشوودانێکی باش بوو. لەم کەین و بەینەدا، ناکۆکییەکانی نێوان بارزانی و م.س پارتی تەقیەوە، م.س بە سەرکردایەتی ابراهیم احمد کۆنفراسێکی لە ماوەت رێکخست لە نیسانی / ١٩٦٤ دا لەم کۆنفراسە بڕیاردرا سەرۆکایەتی بارزانی لە حزب تەجمید بکرێ. ئەم کارە بوە هۆی روودانی شەرلە نێوان هێزەکانی سەربە سەرکردایەتی بارزانی و هێزەکانی سەربە م.س پەنایان برد بۆ ئێران و ئەم روداوە نەخوازراوە، بوە سەرەتای ناکۆکی لە نێوان بزوتنەوەی ئازادی خوازی گەلی کوردستان، کە تا کۆتایی سەدەی بیستەم درێژەی دکێشا. حزبمان دیارە زۆر هەوڵی داوە کە ئەم دووبەرەکیە رونەدات، بەڵام بەداخەوە هەر رووی داو هۆکاری ئاشکرای ئەو رێککەوتنە بوو کەبارزانی لە شوباتی / ١٩٦٤ دا ، لەگەڵ عبدالسلام دا کردی.

دوای ئەم روداوانە بارزانی بڕیاری بەستنی کۆنگرەی شەشەمی دا. کۆنگرە لە ١/تەموزی /١٩٦٤ دا کرایەوە. یەکێ لەبڕیارەکانی دەرکردنی ابراهیم احمد و جماعاتەکەوی بو لە حزب و هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی نوێ بوو، بە سەرۆکایەتی بارزانی. لەم لیژنە ناوەندییە، زۆرینەی کەسایەتی نوێ بوون، و حبیب محمد کریم بو بە سکرتێری پارتی.

لە ٢٠/نیسانی/١٩٦٤ دا ، لەلایەن دادگای عورفی چوارەم لە کەرکوك دادگایی کرام، بواریان پێدام کە داکۆکی لەو خۆم بکەم. لەگەڵ ئەوەش دوو ساڵ حوکمیان دام و، لەبڕیارەکە داهاتوە (کە بۆ زانین حوکمەکەی سیاسی نیە) . دوای هەفتەیك رەوانەی زینندانی بەعقوبەکرام. کارگێری زیندانەکە گوتی بیانبەن بۆ (قلعەی یەکەم)حکومدراوی دووەم دەرگای کردەوە و رۆیشت. بەڵام من نەڕۆیشتم کارگێرگوتی بۆ نارۆی منیش گوتم من حکومدراوی سیاسیم. کارگێڕگوتی بەرائەت – پاکانە – بدە بۆ ئەوەی بتبەینە لای سیاسیەکان، گوتم من شیوعی نیم بۆچ پاکانە بدەم. گفت و گۆیەکی درێژ لە نێوانماندا کرا، کارگێرلێم توڕەبوو هەڵسا هات

زللەیەکی لێدام و گوتی بیبەن بۆ لای فهد کە معاون وەردیان بوو٠ ئەویش لێم تورە بوو چونکە گوتی جنێوبدە بە فهد منیش جنێوم نەدا،کە گوتی جنێو بدە بە من منیش ناوم فهدە دوایی گوتی جنێو بدە بە نوری سعید خۆ ئەو نیشتمانپەروەرنەبوو، گوتم جنێو بە کەس نادەم٠ دوای ناردی بە دوای وەردیانێکی زلی کەتە٠ وەردیانەکە نەختێ لێیدام، ئەمجا فهد گوتی بیبەن بۆ لای معاونێکی تر، ئەو زۆر بەنەرمی قسەی لەگەڵ دا کردم٠ دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کە – پاکانە – ناکەم گوتی بیبەنەلای جەماعەتەکەی خۆی٠ دیسان هێنامیانەوە لای فهد، ئەم جارە گوتی بیبەن سەری بتراشن بە شەق بیبەنە قەلای یەکەم، بەم شێوەیە خۆم لە قەلای یەکەم دۆزیەوە٠ قەلای یەکەم کە لە بەشی زیندانە کۆنەکە و نەختێ بچکۆلانە بوو بۆ زیندانی گراوەکانی – عادی – داندرابوو٠ دوای من و کابرای سایقی خەلکی دوز، خوالێخۆشبوو حسین نادرو قوتابیەکیان هێنا ژمارەمان بوو بە چوار کەس بووینە سوقرەیەك٠ نزیکەی دوو مانگ لەو قەلایەمانەوە٠ رۆژێك پشکێنەرێکی کارگێری هات بۆ لامان٠ پرسیاری کرد کێ گرفتێکی هەیە؟ من هەڵسام گوتم ئێمە چوار کەسین لێرە لەسەر سیاسەت گیراوین٠ کەچی کارگێری زیندان ئێمەی بەشەق هێناوە بۆ ئەم قەلایە، ناومی لە لای خۆی نووسی٠ رۆژی دوای رۆژ کارگێر کە ناوی کامل عوبید بوو، ناردی بە دوامانـدا یەکسەر لەمنی پرسی دیارە سکالامان دژ دەکەی٠ منیش گوتم دەتەوێ چی بکەین، ئازاریشمان بدەی دەنگیش نەکەین٠ دیسان داوای پاکانەی لێمان کرد، من و هاورێ حسین پاکانەمان نەکرد، بەلام سائقەکەو قوتابیەکە رازی بوون پاکانە بکەن٠ لەسەر ئەمە من و هاورێ حسێنیان هەفتەیەك ناردە ریازە٠ دوای هەفتەیەك کە هاورێ حسین ماوەی زیندانیەکەی تەواو کردبوو بردیان بۆ لای دەست گیروەکان٠ منیشیان بۆ لای ئەو هاورێیانە برد کە پاکانەیان نەکردبوو، لەوێ چاوم بە ئەبو فەلاح – حنایوسف –و دکتۆر حبیب المالح کەوت، کە دوای شەهیدکرا لەگەڵ هاورپەکی تری عەنکاوەکە ناوەکەیم لە بیر نەماوە، هەروەها خالد کەلە شارەوانی هەلێر کاری دەکرد٠ ٢-٣ لەوێ بووم کارگێر هەمووی لە حەوشە

کۆکردینــەوە٠ و گــوتی ئەمــە دوا دەرفەتــە بــۆ پاکانــە، ئــەگینا بــۆ زینــدانی دوور دەتانگوازینەوە٠ کە کەس ئامـادە نـەبوو پاکانـە بـدات، بـانگی یـەکێکی کـردو، داوای لێکـرد سـێ لیـستی بـە نـاوی زیندانیـە سیاسـیەکان بـۆ بکـات. لەبـەر ئـەوەی ئێمـە هەولێری بەیەکەوە وەستابووین هەمووومان گوازراینەوە بۆ شاری (عمـارە) ٠ دوای ٢- ٣ رۆژ رەوانەی تەسفیراتی پۆلیسیان کردین٠ لەوویش بۆ رۆژی دوایـی ئێمـەیان نـارد بۆ بەغدا،لە گرتووخانەی – سرای – چەند رۆژ ماینەوە، لـەوێ چـاومان بـە هەنـدێ بڵاوکراوەی حزب کەوت٠ ئینجـا ئێوارەیـەك بەشـەمەندەفەر رەوانـەی بەسـرا کـراین لەوێـشەوەبۆ زینـدانی عمـارە رەوانـەکراین، بـۆ شـەوی ١٤/١٣ / ٧ / ١٩٦٤ گەیـشتینە زیندانیەکـە ٠ رۆژی دوایــی ســلام عــارف وتــارێکی بــە بۆنــەی ١٤ /تــەموزی / ١٩٥٨ خوێندەوە٠ لەم وتارەدا رای گەیاند کە بەرەو سۆسیالیزم وولاتەکەی دەبات، هەر لەم وتـارەدا چـەند کۆمپانیایـەکی سـەرمایەدارانی نیـشتیمانی خۆمـالی کـرد٠ لـە کاتێکـدا کۆمپانیای نەوتی کەرکوك هیچ قسەی لەبارەوە نەکرا٠

زیندانەکان لێیان پرسیم کە رام چییە لـە مـەر ئـەو بڕیارانـەی عبدالسلام٠ منـیش لەبەر رۆشنایی رێبازی حزب، گوتم ئەمە مانای سۆسیالیزم نییە٠ ئەگـەر عبدالـسلام راسـت دەکـا بــۆ ئــەم هــەزارەها شــیوعیەی لــە زیندانــەکان نەهێــشتۆتەوە، ئێمــە سۆسیالیـستی راسـتەقینـەین !!!٠ شـایانی باسـە، کـە دوای دەرچـوونی بەیاننامەکـە٠ لیژنەی ناوەندی حزب لە دەرەوە لـە ئـەوروپا کۆبوونەوەیـەکیان رێکخـست٠ بـۆ چـاو گێڕانــەوە بــە رێبــازی حــزب و هەڵبــژاردنی ســکرتێر کــە هــاوڕێ عــەزیز محمـد بــە سکرتێر هەڵبژێردرا٠خەتی نوێیان بۆ حزب دارشت کەبە خـەتی ئـاب نـاوی دەرکـرد ناوەرۆکی خەتەکە ناوەرۆکێکی راست و رەوانەبوو٠ کە تیادا ئامـادەیی حزبـی پیـشان داوە هاوکاری حکومەتەکـەی عبدالـسلام بکـات بـە هەنـدێ مـەرجی پلـە دوو و سـێ٠ وەکــو چــاولێکردنێکی تــاقی کردنــەوەی میــسر کــە عبدالناصــر دەیویــست بینــای سۆسـیالیزم بکـات لـە میـسر بۆیـە شـیوعیەکانی لـە زینـدان ئـازاد کـردن و سـەرۆك وەزیرانێکی چەپی هێنایە پێـشەوە راپۆرتەکە وای دەردەخات ئەگـەر لـە عێـراقیش

شـيوعيەكان ئـازاد بكـرێن لـە ( يـەكگرتووی سۆسـياليزم)ی عبدالـسلام وەربگيرێـت دەتوانـدرێ لـە عێـراقيش سۆسـياليزم بنيـات بنـدرێ٠ بـەبێ ئـەوەی بـە بـير خۆيـان بهێنينەوە كە ئەو عبدالسلامە ٢ – ٣ساڵ پێش ئـەوە٠ سـەركردايەتی هـەموو تاقمـە كۆنەپەرستەكانی عێراقی كردووە لە كودەتای ساڵی / ١٩٦٣ دا بەرامبەور بـەو رێبـازە زۆرينەی رێكخراوەكانی حزب نارەزايی خۆيان دەربڕی و چەند تاقمێكی چەپ و رەو پەيدابوون٠ دوای چەند رۆژێ، بەياننامەی حزبمانپێگەيشت كە پشتگيری لە خۆماڵی كردنەكانی عبدالسلام دەكات٠ هاوڕێيان گوتيـان ئەمـە چيە تـۆ چيت گـوت و حـزب چی دەڵێ، گوتم ئێستاش هەر ئەمە رای خۆمە٠

زيندانی عمارە بينايەكی كۆن و دارزاو بو، بەڵام كارگێڕييەكەی بـاش بـوو، نـە داوای پاكانـەيان دەكـرد، نـەهيچ فـشارێكيان دەخـستە سـەر زيندانيـەكان٠ بۆيـە چـەند دەورەيـەكمان كـردەوە بـۆ فێربـوونی محاسـبەو زمـانی ئينگليـزی٠ هـەروەها دەورەی نەخوێنـدەواريمان كردبـۆوە بـۆ نەخوێنـەدەوارەكان كـە ژمارەيـەكی زۆری لێبـوو، چونكە زۆربـەی زينـدانييـەكان سـەربازبوون٠ لـە بۆنەنيـشتيمانيەكان ئاهـەنگ رێـك دەخرا وتاری سياسی دەخوێنرايەوە٠ لەو زيندانـە چـاوم بـە شـەهيد ( محمـد احمـد خوزەری) كەوتەوە كە بەيەكەوە لە خانەی مامۆستايان لـە بەعقوبـە تخرجمـان كـرد لە ساڵی / ١٩٥٢ دا٠ شەش مانگم لەم زيندانە دا رابـوارد٠ كـە حوكمەكـەم تـەواو كـرد لەگـەڵ هەنـدێ زينـدانی تـر ئێمـەيان هێنايـەوە بەغـدا بردييـانين بـۆ ( امـن عامـە) ئاسايـشی گـشتی٠ هەرئـەو رۆژ دوای پـڕ كردنـەوەی لاپـەرەی كاروبـار ئێمـەيان ئـازاد كرد٠ لەوانەيە لێرە پرسيارێك بكرێ كـە چۆن بـەبێ پاكانـە ئێـوەو ئـازاد كـران؟ بـۆ روون كردنەوەی ئەمە، دەمەوێ ئاماژە بەم كۆمەڵە ووتارانە بكەم ، كـە هەنـدێ لـە نەتـەوە پـەروەرە عەرەبـەكان لـە كۆتـايی سـاڵی/ ١٩٦٤ دا، لـە رۆژنامـەی (الثـورة) بڵاويان كردەوەو داوايان كردبوو، كە چيتر پاكانـە لـە بەنـدە سياسـيەكان وەرنـەگيرێ چـونكە ئـەم پاكانـە گـرێ و گـۆڵی دەرونـی لـەلای ئـەو كەسـانە دروسـت دەكـات كـە ناچاردەكەين پاكانـە پـڕ بكەنـەوە٠ لـەو سـەردەمە عبدالـسلام و نەتەوەپـەروەرەكان

بـەلای عبدالناصـریان دادەشـکاندوە، عبدالناصـریش لـەم کاتـە زۆر لـە یـەکێتی شـورەویەوە نزیـك کـەوتبۆوەو شـیوعیە میـسریەکانی هـەموو ئـازاد کردبۆیـە لـە عێراقیـشدا ٢ — ٣ مـانگ پاکانـە داوانـەدەکرا. بـەڵام عبدالـسلام کـە پیـاوێکی کۆنەپەرستی دژی کۆمۆنیزم بوو، دیسان پاکانەی دوای ئەم ٢- ٣ مانگە داهێنایەوە.

مـن لـە ٢١ / ١ / ١٩٦٥ ئـازاد کـرام، دوای ٣ — ٤ رۆژ لـە بەغـدا مامـەوە هاتمـەوە بـۆ رەوانـدوز. نزیکەی دوو مانگ لە ماڵەوە بووم، و لەبەر ئـەوەی بـارودۆخی کوردسـتان بەرەو تازەبوونەوەی شەڕ دەڕۆیشت. لەگەڵ سێ هاوڕێی تـر، کە رەفعـەت عبـدالله و حسن مام برایم و عمر عبدالله بوون. چوینە دەرەوە بۆ ریزی پێشمەرگە، لە بنکەی — بەرسیرین — لەوێش دوو مـانگ مامـەوە. کە خواردەمـەنی و جێگای نووسـتنمان زۆر خراپ بوو، لە شەش جەم یانی دوو رۆژ، یەك جەم یا ساوار یا برنج بەوشکی یا نیسك بوو پێنج جەمەکەی دیکەچاو و نانی زۆر خراپ بوو.

دوای دوو مانگەکەم ، هـەرێمی کوردسـتان کـە ئـەو کـات لـە شـاری قـەڵادزێ بـوو، بـە دوامیاندا نارد، دووڕۆژ بە پێ رۆیشتم تا گەیشتمە قـەڵادزە. لـەوێ بـەرپرس هـاوڕێ شەهید ابوستاربوو ابو حکمەت و ابو سربازیش ئەندام نووسینگەی کۆمیتەی هەرێم بوون. ابو ستار پێی گوتم دەبێ بچینەوە ناوەوە ، بۆ هـەولێر یـا سلێمانی بـۆ ئـیشی نهێنی . منیش سلێمانیم پێ باشتر بوو چونکە لـەوێ کـەم کـەس دەیناسـیم، لەسـەر ئەوە رێك کەوتین کە بچم بۆ سلێمانی. دوای ماوەیەك لەگەڵ دوو ماڵی هاوڕێیانمان، بەرێگای کاروانی رەوانەی سلێمانی کرام، لەبەر ئەوەی هـیچ پیناسـەیەکم پێنـەبوو ، بەشەو بە پیادە لەگەل دەلیلێك چوومە نـاو شـار، و لـە مـاڵی عبـدالرەحمان شـیوعی دایـان نـام. رۆژی دوایـی هـاوڕی نـوری هـات بـۆ لام و دوای چـەند رۆژێ هاتـەوە تەسلیمی( حەمەی ئەزاهەتی) کردم کە ئەو کاتە یاریدەدەری بەر پرسی لیژنـەی شار بوو، ئەویش بردمیەوە مالی خۆیان کە ماڵێکی حزبی بـوو. لـە ماڵـەوە زۆر پرسـیارم لێی کرد و بۆ دەرکەوت کە ناوشاری سلێمانی رێکخراوێکی بـەرفراوان و نووسـینگەی هەیـە. دوای چـەند رۆژی کۆبوونـەوەی م شـارکراوونامادەبووم حمـە تەقـدیمی

هاوڕێیانی کردم. کە ئەم هاوڕییە بەرپرسی ل/ شار داندراوە. کۆبوونەوەکە بە ڕێك و پێکی کۆتایی پێ هات و. م.شار هەفتەی جارێك کۆدەبۆوە بۆ لێکۆڵینەوەی کۆنووسی ل/ کەرتەکان کە چوار ل. کەرت بوون. وئیش و کاری حزبی زۆر بە ڕێك و پێکی بە ڕێوە دەچوو و دارایەکی باش هەبوو، چونکە ژمارەیەکی زۆری دۆستی پێتاك دەرمان هەبوو، بەتایبەتی شانەی رۆشنبیرەکان پێتاکێکی زۆریانکۆکردەوە. لەوکات وام هەست دەکرد کە حزب ئێمەی نەبێ هیچ ڕێکخراوێکی تر لە شارەکانییە ماوەی ٦ – ٧ مانگ ئیش و کاری ڕێکخراوی شار بە ڕێك و پێکی بە ڕێوەدەچووبەرەو پێشەوە هەنگاوی دەنا. بەڵام دوای ئەمە ، خوالێخۆش بوو غەفور میرزا کەریمیان ناردوەکو ئەندامی ل. شار، هەرهات دەستی کرد بە گێرە شێوێنی ، دیار بوو منی بە شایستەی بەرێوەبردنی شار نەدەزانی و هەوڵی دەدا لەبەر چاوی هاوڕێیانی شار بەبێ توانا دەرم بخات. ئەم کردەوانەی کاك غفور بوە هاوکاری کەم بوونەوەی چالاکیەکانی ڕێکخراوەکەی شار.

شایانی باسە لیژنەکیش هەبوو بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕێکخراوەکانی ناو شار کە بریتی بوو لە ڕێکخراوی ئافرەتان و شارکە ئەویش لە چاو خۆی ڕێکخراوەیە فراوان بوو. هەروەها ڕێکخراوە کرێکاران هەبوو، کە کرێکارانی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار و کارگەی جگەرەی بەرێوەدەبرد. ئەو لیژنەیە بریتی بوو لە هاوڕێیەکی مەسیحی خەڵکی موسل کە ناوی حاجی بوولەگەڵ خانم زوهدی کە بەرپرسی ڕێکخراوی ئافرەتان بوو، من و حەمەش نوێنەری ڕێکخراوی شار بووین لە لیژنەیەدا. لە بەهاری ساڵی ١٩٦٦ دا حزب بریاری دا، کۆنفراسی یەکەمی ڕێکخراوەکانی کوردستان ببەسترێ، ئێمەلە لیژنەی ناوخۆیی ٦ – ٧ هاوڕێ بەشداریمان نەکرد لە کۆنفراسەکەدا. کەلە گوندی(کەلیتە) بەسترا گوندێکی بچکۆلانەبوو، دەکەوێتە نێوان گوندی وەرتەو دەرگەلە، ئەو گوندە تا ئەو کاتەهەر ڕێکخراوی حزبی لێبوو. دوو سێ کەس منیان دەناسی لە خەلکی گوندەکە. من پێش ئەوەی بۆ کۆنفراسەکە بچم، بە هاوڕێیانی ل. شارم ڕاگەیاند، کە ماوەیەك دەچمەوە

شارەکەی خۆمان بەسەردان و پێم گوتن هاوڕێ حەمە سەرپەرشتیتان دەکات تا دەگەڕێمەوە، هیچ تێبینیان لەسەر ئەو گەشتەی من نەبوو. ڕێگاکە لە سلێمانیەوە بۆ گوندی کەلیتە دوربوو بە هەفتەیەك ئەنجا گەیشتینە ئەوێ دوای گەیشتنمان کۆنفراسەکە دەستی پێکرد، راپۆرتی سیاسی و ڕێکخراوەیی ئامادەکرابوون. من یەکێك بووم کە زۆر گفت و گۆم کرد لەسەر هەردوو راپۆرتەکە، کە نووسینگەی هەرێم ئامادەی کردبوون. دیاربوو بهاء الدین نوری لە لیژنەوی ناوەندیەوە، بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆنفراس نێردرابوو، بەلاّم دوای دەست بەکار بوونی کۆنفراس بە ٢ — ٣ رۆژ ئینجا گەیشت تەنیا هەلّبژاردنی ل. هەرێم و دەرکردنی بەیاننامەی کۆتایی مابوو. ئەم دوو ئیشە زۆر بە دیموکراتیانە لەلایەن سەرپەرشتیکار بەڕێوەبرا بۆ ل. هەرێم هەر هاوڕێیەکی کۆنفراس بۆی هەبوو خۆی کاندید (ترشیح) بکات. من خۆم کاندید نەکرد. بۆ بەیاننامەی کۆتایش، رستە رستە گفت و گۆی لەسەر کرا دوایش بە گشتی گفت و گۆی لەسەر کرا، بە زۆربەی دەنگ هاوڕێیانی کۆنفراس بڕیاریان لەسەر دا.شایانی باسە کە بهاء الدین نوری بە سکرتێری کۆمیتەی هەرێم هەلّبژێردرا.

لەکاتی بەستنی کۆنفراس، پێشمەرگە هێرشی کردە سەر ئەو هێزەی سوپای عێراق کە لە کاتی لەبار بۆ خۆیان بەشێکی زۆری چیای هەندرێنیان داگیر کردبوو. ئەو هێزەی کە ئەم ئەرکەی پێ سپێرابوو، بە پلەی یەکەم پێشمەرگەی شیوعییەکان بوون، لەگەلّ ئەو هێزەی کە کاك عزەت سلێمان بەگ بەرپرسیان بوو، لەگەلّ ١٠ — ١٢ پێشمەرگەی سعیدی محمەدئاغای مێرگەسوور.لەلای هەمو کەس ئاشکرابوو کەهێزی سەرەکی ئەم نەبەردە بەناوبانگە هێزی حزبی شیوعی بوو بەسەرکردایەتی شەهید فاخر و رەئیس کمال هێرشەکە رێك خرابووهەر ئەوانیش هێرشەکەیان سەرکەوتوانە بەڕێوەبرد، شایانی باسە کە مستەشارێکی بەتالیۆنە سوکەکان دوای راپەڕینی سالّی ١٩٩١ بۆی گێرامەوە کە سەرکردەی (فرقە)ی چوارەمی سوپای عێراقی پێی گوتوە دوای شەڕەکە، کە (شیوعیەکان لە هەندرێن شەڕێکی وایان کردوە کە لە

ڤێتنـامیش شـەڕی وا ئازایانـە نـەکراوە. کەچـی ئێـستا هـەوڵ و تەقەلایـەکی وا لـە گۆڕێیە، کەرۆڵی سەرەکی شیوعیەکان لەو نەبەردەمەزنە بسرنەوە یا بەلایـەنی کـەم بە رولی پلە دوو سەیربکرێ. هەرچەندە ئێستا زۆربەی ئـەو شـیوعیەیانە مـاون، کـە شەرەفی بەشداریان لەو نەبەردەدا هەبوو.

ئەو ئێوارەیە کـە هێرشـەکە بـۆ سـەر سوپای عێـراق دەستی پێکـرد بـۆ نیـوە شـەوە تەتـەری ئـەو کاتـە کـە نـاوی عـەریف نـوری بـوو، لـە نـاو گونـدی کەلیتـە چـەند دەمانچەیەکی تەقاند و هەمووومان لە خەو راپەرین. ئینجا هاتە ئەو ماڵەی کە ئێمە لێی خەوتبووین، و پێی راگەیانـدین کە پێشمەرگەکانمان هەندرێنیان وەرگرتەوەو لە هێزی دوژمن پاکیان کردەوە لەم هەڵمەتە گەورەیە تەنیا سێ شەهیدی پێشمەرگەی قارەمانمان دا.کە عریف یونس و خدری عەولابەگی خـەلکی دەرگەلـە و صـالحی مـام الیاس بوون کەبـە خـوێنی پـاکی خۆیـان ئـەو سـەرکەوتنە مەزنـەیان بۆپێـشمەرگەی کورستان و حزبی شیوعی تۆمار کرد.

بەبۆچوونی من ئەم نەبـەردە گەورەیـە حکومـەتی ئـەو سـای عێراقـی ناچارکرد کـە رێکـەوتنێك لەگـەڵ سـەرکردایەتی شـۆڕش و گـەلی کـوردی کـرد کـە بـە رێکـەوتنی ٢٩/حزەیرانـی / ١٩٦٦ نـاوی دەرکردلـەو سـەردەمەی کـە عبـدالرحمن محمـد عـارف سەرۆکی کۆمار بـوو، دوای سـوتانی عبدالسلامی بـرای لـە رووداوی فرۆکـە لـە شـاری بەسرا.

مـن رۆژی دوایـی چـووم بـۆ دەرگەلـە دیـتم دانیـشتوانی گوندەکەهـەموویان لـە ئەشکەوتەکان دەژیان. چونکە ئە رۆژە فرۆکە جەنگیەکان ی رژێم بە شـەش فرۆکـە بۆردومانی ناوچەکەیان دەکرد، ٢ — ٤ بۆمبی ناپاڵمیان بە گوندی دەرگەلە دادابوو.

دوای کۆتـایی هـاتنی کۆنفراسـەکە دەرچـوونی بەیاننامەکـە ئێمـە گەڕاینـەوە بـۆ سلێمانی. دیارە لەو کاتەی لە کـۆنفراس بـووین لیژنـەی شـار لـە حمـەی یاریـدەدەرم هەڵگەڕابوونەوە، گوتبویان سکرتێری شار پێی رانەگەیانـدین کـە ماوەیـەك دەچێتبۆ لای کەس و کاری. من و هاوڕێیانی ل. ناوخۆیی سلێمانی زۆر هەوڵماندا لەگەڵ یـان

که کێشەکە لە ڕێی گفت و گۆ چارەسەر بکەین. کەچی ل. شار هەر سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان. بۆیە ناچاربووین پەیوەندی بە هاوڕێیانی کەرتەکان بکەین کە زۆربەیان نارەزایی خۆیان دەربڕی لەم کردەوەی لیژنەی شارو ئامادەیی خۆیان نیشاندا، کە هاوکاری لەگەڵ ل. شاردا نەکەن. کە هەستیان بەو جولەیەی ئێمەکرد، پاشگەزبوونەوە ئامادەیی خۆیان نیشان دا کە گفت و گۆ لەگەڵ ل/ ناوخۆیی بکەن وایان دەرخست کە ئەوان بە حەمە رازی نین یارمەتدەری ل. شار بێت، لەسەر ئەم تێبینیانەیان بڕیاردرا حەمە بۆ کەرکوك بگوازرێتەوە.

هەر لەم ماوەیەدا، کۆنفراسی محلی بەسترا و ل. محەلی هەڵبژێردرا، لە کاتی دابەشکردنەوەی ئەرکەکان هاوڕێ حسین علی غالب بوو بە بەرپرسی ل. شاردانرا . منیش بوومە ئەندامی نووسینگەی محلی. هاوڕێ مام قادریش بوە سکرتێری محەلی. بۆ ماوەیەك بارودۆخی ل.شارهێوربوومەوە . بەڵام لە ساڵی / ۱۹٦۷ دا دوا ئەوی عزت الحاج - رمزی، لە حزب یاخی بوو و توانی زۆربەی ڕێکخراوەکانی بەغدا لەگەڵ خۆیدا ببا. یەکسەر ل. شاری سلێمانی پشتگیری خۆیان بۆ ڕەمزی دەربڕی و داوایان لە ل. محەلیش کرد کەواز لە حزب بێنن بچیتە پاڵ تاقمەکەی ڕەمزی. بەڵام نووسینگەی محەلی هەرزوو کۆبووەو چالاکیە کەرتەکارییەکەی – ڕەمزی – ئیدانە کرد. دوای ماوەیەك سکرتێری بانگ کرا بۆ ناوچەی دەرگەلە بۆ کۆبوونەوەی ل. هەرێم، تاقمەکەی – ڕەمزی – هاوڕێ حسین علی غالبیان دەرکرد. ئەویش هات بۆ لام دەمانچەیەکی حزبی لەلابوو تەسلیمی کردەوە وگوتی من دەچم بۆ بەغدا زۆر هەوڵم لەگەڵ دا کە نەڕوات و پێم گوت ئەم تاقمە زوو هاشەو هوشەیان خامۆش دەبێ و. هاوڕێیانی دڵسۆز دەگەڕێنەوە باوەشی حزب، بەقسەی نەکردم هەرسوور لەسەر ئەوەی کە بچێت بۆ بەغدا و ئیشێك بدۆزێتەوە من ئەو کاتە ڕێکخراوی ئافرەتانم لەلابوو هیچ لە ئەو ڕێکخراوە لەگەڵ کەرتەکان نەڕۆیشتن. هاوڕێ ئانیبیش لیژنەی دەوروبەری لەلابوو لەوان هەندێکیان لەگەڵیان ڕۆیشتن. لە هاوڕێیانمی خوارەوەش هەڵوێستی هاوڕێ ( ئەحمەد حامید) زۆرئازایانەبوو لە دژیان

نەك هەر لەگەڵیان نەرۆیشت دژیایەتشی ئەکردن هەروەها هاوڕێیان عوسمان دانیش و عوسمان عەلاف لە دژیان بوون پەیوەندیان بە هاوڕێیان دەکردبۆ گێڕانـەوەیان بـۆ ریـزی حـزب. لەوکاتـەوە هـەر مـن و هـاوڕێ نائـب لـە شـاردا مابوینـەوە، خێـرا نامەیەکمان نارد بۆ لقی دە بۆ مەلا علی و مـلازم عبـدالرحمان، بـەم شێوەیە تـەنیا یەك پێشمەرگە لەو لقە لەگەڵیان رۆیشت ئەویشیان چەك کرد. لە قەزاکانیش هیـچ هاوڕێ نەچوو لەگەڵیاندا. چونکە زوو پەیوەنـدیمان پێـوەکردن. شایانی باسـە لێـرە باسی هەڵویستی حسن بـەرزنجی بکـەم، ئـەویش ئەنـدامی نوسـینگەی ل .محلی بـوو هات و داوای لێکردم هەندێ پارەی بدەمێ کەپێی بچێت بۆ بەغداو بزانـێ وەزعەکـە لەوێ چۆنە. منیش برە پارەی دارایی ل- محلی لە لای من بوو. بەڵام دوای دەرکەوت کـە چـووە لـەوێ پەیوەنـدێ بەکەرتەکارانـەوە کـردوەو نامـەی بـۆ نووسـیوە، چـونکە نامەکـەی دوای دەسـت حـزب کـەوت بـە پێویـستی دەزانم کـە بیلـێم چـەند جارێـك لەلایەن کـەرتکارەکانی سلێمانیەوە هەرەشـەم لێکـراوە، دیـارە ویـستبویان بمگـرن لـە ماڵێك حەشارگەیەکمان هەبوو، لەوێ دەست بەسەرم بکەن. بەڵام خاوەن ماڵەکـە کـە هاوڕێیەکی عەرەب بوو، پێی گوتبون ئەگەر ئەم هاوڕێیە بهێنن بۆ ئێوە، مـن ئـازادی دەکەم و وازیش لە ئێوە دەهێنم.

هەل ومەرجەکە نزیکەی مانگێك بەم شێوەیەوە مایـەوە، ئینجا هـاوڕێ ئەبوسـەرباز هات بۆ سلێمانی دوای پەیوەندی کردنی بەمن و هاوڕێ نائب . بڕیـاردرا ل/ محـەلی کۆببێتەوە بۆ باس کردنی ئەم بارودۆخە و چارەسەرکردنی کوم وکوڕیـەکانی وەکـو پێکـەوەنانی ل/ شـارێکی نـوێ کـە لـە هاوڕێیانـە ئەحمـەد حامیـد و ئەفراسـیاب شاوەیس کە زوو لە کـەرت کەرەکە دوورکەوتـەوە لەگـەڵ دوو سێ هـاوڕێ ی تـر کـە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. هەندێ کاری تـری رێکخراوەیی، هـابو سـەرباز ماوەیـەکی بـاش مایـەوە لەگـەڵمان دا. دوایـی گەڕایـەوە بـۆ شـوێنی خـۆی دوای گەڕانـەوە بەماوەیەك. توفیق ئحمەدیان بوو بە بەرپرسـی ل/ محـەلی سلێمانی نـادرە وهـاوڕێ جلال دەباغیش لە دەرەوە گەڕایەوە، خرایە م/ محـەلی و هەنـدێ هـاوڕێ دڵسوزیش

کە راستی تاقمەکەی -رەمزیان - بۆ دەرکەوت گەڕانەوە ریزی حزب و، ئیش و کارەکەمان بەرەو باشی دەڕۆیشت. لەم سەروبەندەدا حزب بڕیاری دا کە کۆنفراسی سێیەم بگرێ، هەر ل.محەلی یەك نوێنەر بۆ ئەم کۆنفراسە رەوانە بکات ئێمە لەبەر ئەوە خەریکی کاروباری حزب بوین. هاورێ حەمید کەخەڵقی دوزخورماتوو بوو لە بەغداوە نێردرابوو بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات. ئەومان بۆ بەشداریکردن لەو کۆنفراسە نارد. لە پاییزی / ١٩٦٧ دا. رۆژێك ئەو ئافرەتەی نامەی ئەهێناو ئەبرد. هات نامەیەکی بۆ هێنام، کە دیاربوو م.هەرێم دوو کەسی ناردکە ئەو زستانە لەلای خۆمان داڵدەیان بدەین، کە چووم یەکێکیان (شەهید فائق معینی)بوو کە پێشتریەکترمان دەناسی، لەگەڵ حمەدامین سیراجی دا. ئێمە لە / محلی سلێمانی بارودۆخمان زۆرخراپ بوو، دوای کەرتکاریەکەی -رمزی - . بەڵام مامۆستا صادق زۆر پیاوانە ئامادەیی خۆی دەربڕی کە لە ماڵی خۆیان جێگەیان دەکاتەوە. بەراستی تا ئێستاش منەتباری مامۆستا صادق و خێزانەبەرێزەکەیم، شەهید فائق و حمدامین سیراجی تا بەهاری / ١٩٦٨ لەلامان مانەوە لەو بەهارە جوڵانەوەیەکی چەکداری لە ئێراندا سەری هەڵدا کە ملا شیرێزی سەرکردایەتی دەکرد.بۆیە کاك حمدامین رۆیشت بۆ پەیوەندی کردن بەم بزافە، هەروەها کاك فائقیش بڕیاری دا بچێتەوە بۆ ئێران بۆ سەرپرشتی بزافە چەکداریەکە. خەریکی رێکخستنی ئەوە بووین کە بە سەلامەتی بگەیینە سەر سنووری ئێران. (شێخ لەتیفی)ئەمر بەلێنی پێداین کە بیگەیینە گوندی - سیتەك - ئەم رەوانەی دەکات بۆ ئێران. لەم سەروبەندەدا رۆژێك چوومە لای کاك فائق گوتی بەتەمامەلەگەل (قادرتەگەران) دا بڕۆم ئێوەراتان چییە،منیش پێم گوت من ئەو پیاوە ناناسم، برقیەك هاورێیان بکەم. رۆژی دوایی چوومەوەلای پێم گوت هاورێیان پێیان باش نییە لەگەڵ ئەم کابرایە بڕۆی چونکە قاچاخ چییە لەوانەیە بتفرۆشێ. بەڵام ئەم گوتی قادر کوردێکی ئێرانە باوەڕ ناکەم خیانەت لەگەڵ کوردی ئێراندا بکات. بۆیە سبەی لەگەڵ ئەودا دەڕۆم. یەکترمان ماچ کرد. دوای ماوەیەك زانیم کە قادر تەگەرانی تەسلیمی لقی

چوارەمی پارتی کردووە. بەم شێوەیە بە سەرکردایەتی پارتی دوای کوشتنی لاشە پیرۆزەکەی دایەوە ئێران کە چەند رۆژی لە مهاباد هەڵیانواسی. بەم شێوەیە تراژیدیای ژیانی تێکۆشەری ناسراوی کوردی ئێران کۆتایی هات پارتی باشی کرد کە لە کۆنگرەی نۆیەمینی، رەخنەی لە خۆی گرت کەئەم کارە نا جوامێرانەی ئەنجام داوە. کۆنفراس لە مانگی کانونی یەکەمی / ١٩٦٧ لە گوندی(داربەسەر)ی دەشتی کۆیەبەسترا، ئومێدێکی زۆرمان هەبوو کەلەوکۆنفراسەدا، کەسایەتی راست و رەواکان جارێکی تر بۆ سەرکردایەتی هەڵنابژێرنەوە،بەلآم بە پێچەوانەوە(رداعتبار) یان بۆ گراو، ئەم جارە بە هەڵبژاردن هاتنەوە بۆ سەرکردایەتی حزب.

دوای کۆتایی هاتنی کۆنفراس هاورێ عمرعلی شێخ هات بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی دەرئەنجامی کۆنفراسمان بۆ باس بکات. لە کۆبوونەوەی ل.محلی من لێم پرسی ئایا فلان وفلان، هەڵبژێرانەوە بۆ سەرکردایەتی حزب، لەوەلآمدا گوتی بەڵێ. منیش زۆر نارەزایی خۆم لەکارە دەربری، گوتم ئەمە دەبێتە بەهێزبوونی تاقمی کەرتکار. ئەم جارە زۆر تورەبوو، گوتی نا دەتەویست ئەمانە نێنەوە سەرکردایەتی بۆ ئەوەی دڵی تۆ ئاو بخواتەوە.منیش هەرئەوکاتە بریارم دا کە جارێکی تر خۆم بۆ ئەندامێتی ل.محلی نەپاڵێومەوە، بەلآم بەلامەوە باش نەبوو هەرئەو کاتە واز لە ل.محەلی بهێنم چونکە هێشتا تاقمی کەرتکارهەر بەهێزبوون.چاوەرێم کرد تا هاوینی / ١٩٦٨ ، کە بریار دراکۆنفراسی دووەمی سلێمانی ببەسترێت. ئەنجا نامەیەکم بۆ ن/محلی نووسی کە نەئامادەی کۆنفراس دەبم و نەخۆشم بۆ ل/محەلی دەپالێومەوە. دیارە لەسەر ئەم نامەیە محەلی بریاری دابوو، کە بۆ ل/ قەزای بمهێننە خوارەوە. دوای کۆنفراس ماوەیەك لە ل.شاری سلێمانی وەکو ئەندام کارم کرد، بەلآم بریاریان دا ل/شاربەرێوەببەم پەیوەندی تاکەکەسیم لەگەڵ ن/مەحلی دا هەبێ. هاورێ نائب دوای راپەرینی بەهاری / ١٩٩١ ، وتارێکی لەوبارە نووسی لە رێگا بلآوی کردەوە ئەو دەڵێ. لەبەر ئەوە وازی هێنا چونکە نارازی بوو لە هەڵوێستنی یەکێتی شورەوی کەچەکێکی زۆری دەفرۆشتە رژێمی بەعسی عێراق، رژێمیش ئەو

چــەکانەی دژی شۆڕشــی گــەلی کەوردســتان بــەکاردەهێنا٠ بــەلام لــە راســتیدا وازهێنانەکەم لەبەر هەردوو هۆکاربوو، یەکەم دەمزانی کە تاقمی راسترەو دەسەلاتی بەسـەر سـەرکردایەتی حزبـدا هەیـە، دووەمـیش بێـزاریم لـە سـەردەمەی یـەکێتی شوردوی هەبوو، کە هاوکاری لەگەڵ چەند دەوڵەتێکی دکتاتۆری دەکات ، وەکورژێمی ئەوسـای عێـراق٠ لەبـەهاری سـالی ١٩٦٩ . رەمـزی – عـزت الحـاج – و زۆربـەی کادیرەکانی تاقمی کەرتکار گیران و، رەمـزی دانـی بەهـەموو نهێنییـەکانی تاقمەکـەی نا٠ کە بەداخەوە بووەهۆکاری لە سێدارەدانی ئەوانەی مەروخان، وەکو احمد حلاق و صالح عسکری چەند هاوڕییەکی تر ٠ کە رەمزی اعترافی لەسەر کردبوون کە ئەمانە بەرپرسی عسکری بوون٠

وەکـو زانـدراوە لـە ئـاداری /١٩٧٠ رژێمـی بـەعس و سـەرکردایەتی شـۆڕش٠ڕێکـەوتن نامەیەکیان لە نێوان خۆیان خۆیان مـۆرکرد، لـەم رێکـەتن نامەیـەدا، رژێـم دانـی بـە ئۆتۆنـۆمی نـاوە، بـۆ گـەلی کوردسـتان٠ بـەم هۆکـارە ماوەیـەکی کـەم نـەختێ ئازادیـە دیموکراتیـەکان لەلایـەن جـەماوەر پـەیڕەوکرا٠ بـەلام رژێـم زوو رێگـای لـەم ئازادیـە دیموکراتییە گرت، لە بەغدا لەو خۆپیشاندانەی بۆ پـشتگیری رێکەوتنەکـەی رێکخـرا پۆلیس و ئـەمن پـەلاماری بەشـەکەی حزبـی لـەم خۆپیـشاندانە داو دەسـتی کـرد بـە لێدانی هاوڕێیان ٠ لە سلێمانی بەبۆنەی نەورۆز جەماوەر بە خۆپیشاندان بـۆ یاریگـا رۆیشتن، ئێمەش خۆپیشاندانی جیاوازی خۆمان هـەبوو ٠ تـا گەیـشتینە یاریگـا هـیچ نەبوو بەلام هەوڵیان دا رێگا لە ئێمە بگرن و نەهێلن بچینە ناو یاریگاکە٠

تا سالی / ١٩٧١ لە سلێمانی مامەوە، بەلام لە بەهاری ئەو ساڵە رژێمی بەعس شالاوێکی گرتن و راونانی دژی حزب هێنا. لە ئاکامی ئە شالاوە توفیق احمد کـە نـاوی حیزبـی هەژاربوو دەست گیرکـرا رووخـاو هـەموو نهێنییـەکانی حزبـی دایـە دەسـتەوە لەبـەر ئەوەی کـە ئێمـە کادیرەکـانی حزبـی بـاش دەناسـین و مـاڵ و رێگـاو جێگـای دەزانـین ٠بریارم دا کە خۆم بۆ هەولێر بگوێزمەوە و لەوێش بگەرێمـەوەبۆ رەوانـدوز چـونکە لە بنکەی حزب لە گوندی بەرسیرین بۆ ئەوەی ئەگەر رژێم ویستی دەست گیرم بکات

بەئاسانی رابکەم بۆ دەرەوە٠پێش ئەوەی کۆتایی بهێنم بەو ماوەیەی لە سلێمانی دا کارم ئەکرد، پێم باشە ئاماژە بە رووداوێکی گرنگی ئەو کاتە بکەم، کە بریتی بوو لە پەلـەماردانی بنەماڵەیـەکی کۆنەپەرسـت٠ کـە لـە هـاوینی / ۱۹٦۷ دا بـە رۆژ لـە شەقامێکی قەلەبالغی سلێمانی هاورێ رەوفیان شەهید کـرد٠ کـە ئـەو کـات ئەنـدامی لیژنـەی هـەرێمی کوردسـتان بـوو٠ دوابـەدوای ئەمـەش ٤ – ٥ هاورێیـتریـان شـەهید کردین وەکو وەستا صالح و عبدالله و صالح کە برابـوون، لـە نانەواکـەی خۆیـان بـەبێ ئەوەیئێمە وەکو حزب هیچ خراپەیەی ئەم بنەماڵەیـەمان کردبـێ ٠ گوایـا ئەمـەیان لەبەر ئەمە کـردوە، چـونکە خزمێکیـان بـە نـاوی علی کـانی ساردی لـە مـاڵی خـۆی کـوژراو ئـەو پیـاوە یـەکێك بـوو لـە تاقمەکـەی (کـانی ماسـی) کـە ئـەوانیش کۆمەڵـە هاورێیەکیان شەهید کرد بوو لە ساڵی / ۱۹٦٤، ۱۹٦٥ دا٠
دیارە رژێم وەکو تاکتیکێك پەلاماری کادیرەکانی هـەولێر و سـلێمانی و دهـۆکی نـەدا لەم شاڵاوەدا٠ بۆیە دەستی بۆ ئێمە نەبردو وەکو داوام کردبووبۆ هەلێر گوێزرامەوە، لەوێش بۆ رەواندوز دایان نام٠ دوو ساڵ لە رەوانـدوزمامـەوە، ماوەیـەك لـە ل/قـەزای رەوانـدوز کارم کرد و دوایش کرامە بەرپرس لە قەزاکە٠
لـە هـاوینی / ۱۹۷۱ دا،دەنگـۆی پێکـەوونانی بـەرەی نیـشتمانی بڵاوبـۆوە٠ مـن لـە دژی ئەوەبووم کە حزبمان لەگەڵ حزبی بەعسی فاشی دا لەبەرەیەکدا کاربکـات٠ بۆیـە لـە هـەر شـوێنی لێیـان پرسـیمایە رات چییە بەرامبـەر ئـەو بەرەیـە ، مـن لـە وەڵامـدا دەمگوت (کـارێکی زۆر هەڵەیـە کـەحزبی ئێمـە بچێتە بـەرە لەگـەڵ حزبـی بـەعس) دیاربوو هاورێیەکی ل/هەرێم لـەلای هـاورێ کـەریم سـکاڵای لـە دژکردبـووم کـە دژی بـەرە قـسە دەکـەم، ئەوکاتـە دیـارە هـ کـەریم سـکرتێری هـەرێم بـوو لەدەرگەلـە دادەنیشت، کـە چـووم بـۆ لای گـوتی سـکاڵات لێ کـراوە لـە دژی بـەرە قـسە دەکـەی و، رۆژێکی بۆ دانام کە بچمە بەرسـیرین، لـەورۆژدوە خـۆیی و حـەجی مـەلاو بەرپرسـی هندرێن، لەگەڵم دانیشتن٠ هـ کەریم قسەکەی دایەروماو گوتی ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن بەرەیەکی سێ قۆڵی ئێمە و پارتی و بەعس دروست بکـرێ٠ مـن تۆمەتـەکـەم ئینـکـار

نـەكرد(گـوتم بـەڵێ هەركەسـێ لـێم بپرسـێ رات چـییە بەرامبـەر ئـەو بەرمیـەی چاوەڕوان دەكرێ پێكەوە بنـدرێ) دوایـی گفـت و گۆیـەكی درێـژ مـن گـوتم سـوورم لەسەر ئەورایەم تەنانەت ئەگەر لە حزبیش دەربكرێم. بـەم شـێوەیە كۆبوونەوەكـە كۆتایی هات، بەڵام هیچ كردەوەكیان دژ نەكردم. بۆ خۆهەڵكێـشان نـاڵێم، تـا دوایـش هەر دژی بەرە مامەوە كە كـە پـارتیش ئامـادە نـەبوو بەشـداری تێـدابكات، بـەرە كـە تەنیا لە ئێمـەو بـەعس پێـك هـات، دوای سـاڵی ١٩٧٥ یـش یـەك دوو حزبـی كـارتۆنی كوردی لەبەرەكە وەرگیران. هەموو كەسیش دەزانێ ئەو بەرمیە چۆن كۆتـایی هـات. لە راستیدا هەموو كردەوەكانی دژی حزبمان و گەلی كوردسـتان هـەر لـە مـۆر كردنـی بەرە تا كۆتایی پێ هێنانی لەلای بەعس بەو شێوازە كارەساتاویەی كە هەموو لایـەك لەبیریـەتی. بـەم شـێوەیە هەڵوێـستی ئـەو سـێ هاوڕێیـە ل.ناوەنـدی و مـن راسـت دەرچوو. بەداخەوە لە هەڵسەنگاندنەش كە پێشكەش بە كۆنگرەی چوارەمی حزبـی كرا، ئازایانە دەست نـەخرابووە سـەر ریـشەی ئـەو رێبـازەی حزبـی بـەوە گەیانـد كـە بەرە لەگەڵ حزبێكی خوێن رێژی وەك بەعس بكات. ریشەكەی بـەلای مـن بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە كـە دەمێكـە تـاقمێكی راسـت رەو دەسـتیان بەسـەر حزبـدا كێـشاوەو، لـە هەڵوێستی راست ورەوابەرەوهەلوێستی تری راست رەوانەی پاڵی پێوە دەنێن. ئەگەر هەڵوێست بەرامبەر حكومەتی قاسم بۆرەمبرریكی هەبوو كە ئـەم پیـاوە شۆڕشـی ١٤/ تـەموزی تەقانـدەوە. بـۆ ئـەم بـەرە شـەڕو شـەقە هـیچ مبررێـك بەدەسـتەوە نـەبوو. بەڵكو منداڵیش دەیانزانی كە (بكر) و (صدام) و حزبە خوێن رێژەكەیان، هیچ كاتـێ لەبەرەی گەل دانەبوون. بەڵكە هەمیشە دژی بەرژەوەندی راستەقینەی گەلی عێـراق بوون. دوای هاتنم بۆ رەواندوز مەترسیم هـەر هـەبوو، بـەڵام دوای سـەر نەكـەوتنی ئـەو پلانـەی لەسـەر ژیـانی بـارزانی كردیـان. ئـەمن لـە هـەموو قـەزاو ناحیـەكانی كوردستان دا كێشرایەوە. بۆ ئەمنی رەواندوزیش كە ئەوسا هەر قەزابوو، كێشرایەوە بۆ هەولێر بەم كێشانەوەی ئەمنەنەختێ هەستم بە دڵنیایی كـرد. و ئـە دوو سـاڵەی لە رەوانـدوز دووربووم، لە چاو دێری ئەمن و جاسوسەكانی بەعس، كە زۆر بەووردی

چاودێریان دەکردم دوای دوو ساڵەکە لە ڕەواندوز، کە هەل و مەرجەکە هەندێك بە گوێرەی ئێمەهێمن بووەوە. دوای مۆرکردنی پەیمانی بەرە لەلایەن هاوڕێ عزیز و حسن بکرەوە. دوای دوو ساڵەکە داوای گواستنەوەم کرد بۆ هەولێر و بڕیاری گواستنەوەم دەرچوو. لە هەولێر خرامە ل/ شاری هەولێر تا هاوینی ساڵی ١٩٧٨ لێرە بە پێویستی دەزانم باسی ئەوە بکەم کە لە پاییزی / ١٩٧٤ دا. کۆنفراسی محلی بەسترا، لە راپورتی ل/شار ئاماژەمان بە ڕۆلی بەعس و دام و دەزگاکانی کردبوو، لە دژی ڕێکخراوەکانی حزبمان دا، بە تایبەتی ئەو فشارەی خرایە سەر حزب بۆ راگرتنی چالاکییەکانتی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانمان زیاتر بۆ ئەوەی کەلە ڕێکخراوەجیهانییەکان دا، نوێنەری بەعس جێگای هاوڕێیانی ئێمە بگرنەوە. وێرای راپۆرتیش من راشکاوانە تر قسەم لەسەر هەلوێستی بەعس کرد دژی حزبمان. لەم قسانەی من هاوڕێ کەریم بۆ سەرپەوەرشتی کردنی کۆنفراسەکە هاتبوو ووتی ئەگەر بەرەکە بدەینە دەست هـ- ملاحسن بەهەفتەیەك دەیروخێنی. بەهەرە حال بۆ ئەندامی ل- محەلی ناوم خرایە لیستی حزب، بەلام بە پالێوراو دەرچووم. نزیکەی چوار ساڵ هەر بەپالێوراوی مامەوە، لەبەر ئەوەی لە دژی بەرە بووم و، لە کۆبوونەوەکانی ل-مەحلی راشکاوانە رای خۆو دژی بەرە دەردەبڕی. بەلام دوای ئەوەی لە ساڵی / ١٩٧٨ دا بەعس بە ئاشکرا کەوتە لێدانی ڕێکخراوەکانی حزب و لە بەسرا دەستی پێکردبەرەو بەغدا و کوردستانیش. یەکسەر ئەندامەتی ل/ محەلیان بۆ گێرامەوەو بە ئەندامی ن/محەلی دایان نام. بارودۆخەکە زۆر درێژەی نەکێشا کە شالاوەکەی بەعس گەیشتەت هەولێریش، منیش خۆم شاردەوەبۆ ماوەی چوارمانگ لە هەولێر لە بەغدا لە ماڵی خزم و دۆستانم. لە کۆتایی مانگی ئادار حزب ڕەوانەی کردم بۆ ناو زەنگ، کە تازە حزب لەوێ بنکەیەکی پێشمەرگەی کردبۆوە.

لە ١٩٧٩/٣/٢٨ دا، دوای بیست سەعات رۆریشتن بە پێ گەیشتمە بنکەی حزب لە (ناوزەنگ) کە دەکەوێتە سەر بنکەی سنووری عێراق – ئێران. ئەو کاتە ناوچە سەر سنووریەکەی ئێرانکە رووبارێکی بچوکی هەبوو، لە نێوان عێراق – ئێران دا لە ژێر

دەســەڵاتی حزبــی، دیمــوکراتی کوردســتان – ئێــران بــوو بــۆ ئێمــەی پێــشمەرگە کرابووەوە• هەڵوێستی یەکێتیش زۆر توند بوو، بە هیچ شێوەیەك ئامادەنەبوون ئەو بەڵێنەی لە پارتی بدەن کۆمەڵێ ( رەبیەیان لـەناوخاکی ئێرانـدا دانـابوو بـۆ داکـۆکی کردن لە بارەگـای سـەرەکیان، هەنـدێ لـە هێزەکـان لـە نـاوەوە هێنایـەوە هەرچـەندە هەڵوێستی حزب بەرامبەر بەو هێز هێنانەی پـارتی تونـد بـوو بـەڵام لـەو بـاوەڕەدام کەلەسەر داوای – حدکا – هێزەکەیان کێشایەوە چونکە حـدەکا رازی نـەبوو بـۆ ئـەم شەڕە لـە خـاکی ئێـران روبـدا• (خـری نـاوزەنگ) بازارگەیـەکی لێبـوو لەگـەڵ چـەند ماڵێك• بریتـی بـوو لـە دۆڵێـك لـە پـشت سـەری مامەنـدە، کە دیوەکـەی تـری شـاری قەڵادزێ بوو• هەموو ناوچەکە بریتی بوو لە دۆڵێکی درێژووکانە، گونـدی(شێنێ) لێ بوو کە لە ژێردەسەڵاتی میری دا نەبوو• لەگەڵ گوندۆکەیەکی تری بچووك بـە نـاوی زەڵێ. بـەڵام چـەند بنکەیـەکی (پ•م)ی لێ بـوو لەگـەڵ بارەگـای سـەرەکی یـەکێتی و سۆسیالیست• قاچاخچیەکانی عێـراق کـەل وپـەلی عێراقیـان دەهێنـا بـۆ (نـاوەزەگ)و قاچاخچیە ئێرانییەکانیش کەل وپـەلی ئێرانیـان دەهێنـا• لـەوێ دوکانـدارەکان لێیـان دەکرینــەوە هەریەکـەیان کـەل و پـەلی وڵاتەکـەی تریـان دەکـڕی و لەگـەڵ خۆیـان دەبردەوە بۆ وڵاتی خۆیان• بنکەکەی ئێمە لە دوو ژوور پێك دەهات، کـە بینایـەکی خــراپ بوو،کــەل وپــەلی پێــشەرگایەتیمان زۆر کــەم بــوو بــۆ نموونــە زۆربــەی پێـشمەرگەکان چـەکیان نـەبوو، ئـەو دوو ژوورەش زۆر کـەم بـوو بـۆ خــەوتن و حەسانەوەی پێشمەرگەکان• ئـەوەی بـاش بـوو بـەهاربوو بـەرەو هـاوین دەرۆیـشتین• پێـشمەرگەکان زۆربـەیان لـە قـەڵادزێ و رانیـە بـوون• دوای ماوەیـەك لیژنەیـەکیان پێکهێنا بـۆ بەرێوەبـەردنی بنکەکـە، منـیش ئەنـدام بـووم لـەم لیژنەیـەدا، بـەڵام کـە هاوڕێیانی لیژنەی ناوەوە هاتن، ووردە ووردە ئێمەیان لەلیژنەکـە لادا• مـاوەی زیـاتر لە ساڵێك بەبێ کار مامەوە دوایی هاوڕێ ابو فاروق، کەبەرپرسی لیژنەی هەرێم بوو داوای لێکردم کە لیژنەی محـەلی هـەولێر پێـك بهێنمـەوە• هاوڕێیـانی ل/محـەلی کـۆن کەلەوێ بوون، هاوڕێیان مـەلا نەفتـە ، جەبارحـسن، توفیـق حـەریری، شـەهید حمـە

سعيد ، احمد عوينه بوون٠ بويه نووسينگەکەمان پێك هێنا له من و مەلا(نەفتـه) و (جبارحسن) چونکه (ه.حەمەسعيد) له راگەیاندن کاری دەکردو مـام (خـدريش) لـه بەشی پێشمەرگايەتی کاری دەکرد٠ و يەکەمين هاورێ که ئامادەيی خـۆی دەربـڕی بـۆ چوونەوە بۆ وولات، و کاری نهێنی هاورێی شەهيد مام (عبدالله) برای مەلانەفتەبوو. که کادیرێکی زۆرکارامەو وریا بووله کاری نهێنیدا بەراستی شایانی ئەوەیـه ریزێکـی تایبـەتی بـۆ دابنـدرێ٠ دوای بـه داخـەوە توشـی نەخۆشـی ژێرپەنجـەی گـەدەبوو، هەرچـەندە حـزب رەوانـەی تـارانی کـرد، بـەڵام هـەر لـەوێ کۆچـی دوایـی کـردو لـه دۆلەتوو خاکی ئێـران بـه خاکمـان سـپارد٠ لـه دوايیـدا دلشادی کوڕی دوای راپـەڕين لاشـەکەی هێنایـەوەو، ئێمەجـەماوەرێکی زۆری هەولێربـه پیریـەوە چـووین و لاشەکەمان بردەوە بۆ گوندی پیرداود، من دوای ناشتنی ووتارێکم لـه سـەر گۆڕەکـەی خوێنـدەوە٠ شـایانی باسـه (سـەید کاکـه) و (بـارزانی مەلاخالـد) و (ابـومخلص) لەوناشـتنه لەگـەڵ جـەماوەرێکی بەرچاوی جوتیارەکانی دەشـتی هـەولێر لـەم رێ و رەسمه دا بەشداريان کرد٠

شایانی باسه دوای ئەويش شەهيد سالار (سەفەر حمەدامین) ئامادەيی خۆی دەربـڕی بۆ کارکردن له نـاوەوە وەکـو بەرپرسـی قـەزای مخمـور، کـه دوای ئـەوەی ٣ – ٤ سـاڵ کاری کردو رێکخراوی ئەم قەزايەی بوژاندەوە، له ناو شاری هەولێر لەلايەن بۆسه – کـەمین – يـەکی رژێمدەسـت گـیرا کـرا، لـه زیندانیـشدا، زۆر ئازايانـه رووبـەرووی پیاوەکـانی ئـەمنی رژێـم راوەسـتاو هـیچ نهێنیـەکی حزبـی نەدرکانـد، وێـرای ئەشکەنجەدانێکی زۆری درندانـه سـەربەرزانه وەکـو پاڵـەوانێك مایـەوە، بۆیـه پیـاوه جانەوەرەکانی رژێمی بەعس له ژێر ئەشکەنجەدا شەهيديان کرد٠

دوای ماوەيەك له ساڵی / ١٩٨١ دا، هاورێ (ناصـح حمـدامين) هاتـه ریـزی پێـشمەرگە، بەڵام لەبەر ئـەوەی لـه ل/محـەلی کارمـان پـێ هـەبوو بـۆ بوژانـدنـەوەو بـەرێوەبردنی رێکخراوی ناو شاری هەولێر، رەوانەی ناو شارمان کردەوە، دوای هاورێ رەوەنـديشمان هەر بۆ کاری نهێنی بۆ ناو شار تـەرخان کـرد لەگـەڵ هـاورێ (ئـارامی) بـرای شـەهيد

(داود) بەداخــەوە هــاوڕێ کۆچــەریش — ناصــح حمــدامین — گوزارشــتی لەســەردرا، لەلایەن ئەو کەسەی کە ماڵەکەی شوێنی حەسانەوەی سەرەکی بوو، لەناو شاردا. بۆیە هێزێکی زۆری ئەمنی عێراقی چوونە سەری. ئەویش بە دەمانچەکەی خۆی داکۆکی لە خۆی کرد، و ئەڵێن ٣ — ٤ ئەمنی کوشتووە، دوا فیشەکی دەمانچەکەشی لە خۆی دا خۆی شەهید کرد بۆئەوەی نەکەوێتە دەستی ئەم دڕندانەی ئەمنی بەعس.

و ئەحمەد عەوێنەشمان دوای کۆچی دوایی مام عەولا بۆ سەرپەرشتی ڕێکخراوی قــەزای دەوروبــەری هــەولێردانا. هــەر زووش هــاوڕێ (ســید نظیــف) مــان بــۆ بــەڕێوەبردنی قــەزای کــۆیێ دانــابوو بــەڵام بەداخــەوە، زوو لەلایــەن ســوپاوە دەســت گیرکراو دوای ماوەیەك لە سێدارەدرا. بەم شێوەیە ڕێکخراوەکانی محەلی هەولێر بە چاکی بوژایەوەو شایانی باسە هاوڕێ (توفیق هەریر)یش زوو بۆ ڕێکخستنەوەی ل. قەزای شەقڵاوە داندرابوو. تەنیا بۆ قەزای روزانـدوز هاوڕێیـەکی وامـان نەبوو کە بتوانێ سەرپەرشتی ڕێکخراوەکە بکات.

دوای تێکشکاندنی سوپای عێراق لەساڵی / ١٩٨٢ داڕێکخراوی هەولێر هاتەوە پێش دۆخــی شــاڵاوی بــەعس لــە ســاڵانی ( ١٩٧٨ ، ١٩٧٩ )دا زۆر دارەیەکەشــی لــە هــی ئــەو وەختەی تێپەڕاند.شایانی باسە لە سەرەتا / ١٩٨٢ بۆ ل- هەرێم پالێورام هەر لەو ساڵەدا، ئەندامێتی ل — هەرێم وەرگرت، دووبارە کاری حزبیمان لە پارێزگای هەولێر کەوتــەوە جموجــۆڵێکی هەســت پێکــراو. بــەڵام داخەکــەم شــەری نێــو خــۆی هەرلــە سەرەتای/ ١٩٨٣ دا ٠ ئەو دەست کەوتانەی بەردو پاشەوەبرد، چونکە لە ئاکامی ئەو شــەڕەدا، ئێمــە وەکــو ڕێکخــراوەو پێشــمەرگە لــە هــەولێر دوور کەوتینــەوەو ناچاری پاشەکشەبووین بــۆ ناوچــەی ڕۆســت، ماوەیــەکی درێــژ کادیرەکانمــان لــەڕێکخراوەکان دوورکەوتینەوە ئەم شەڕە تــا ســنوورێکی هەســت پێکــراو دڵەڕاوکێ وساردی لــە نــاو جەماوەر و هێزی پێشمەرگە دا پەیداکرد.

لێرە بە پێویستی دەزانم کە نەختێ باسی هۆکارەکانی ئەم شەڕە ناوخۆیە بکەم ٠ هەرلە سەرتای هاتنمان بۆ ریزی پێشمەرگەزۆر هەوڵماندا نێوانی یەکێتی لەلایەك و

سۆسیالیست لەلایەکی تردا ئاسایی بکەینەوە، چونکە نێوانیان باش نە بوو. بەڵام نەمان توانی نێوانەکەیان وەکو پێویست چاك بکەین، هەروەها هەوڵماندا نێوانی پارتی و یەکێتی ئاسای بکەینەوە، بە تایبەتی پ.م یەکێتی واز لە ڕێگەگرتنی گەریلاکانی پارتی بهێنن. جارێکیان ٢٨ پێشمەرگەی پارتیان لە مەلەکان بە دیل گرتبوودوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر ئازادیان کردن و هاوڕێیانی ئێمەلە ڕێگای ئێرانەوە تەسلیمی پارتیان کردنەوە.

گەریلاکانی یەکێتی زوو زوو لەگەڵ گەریلاکانی سۆسیالیست لێکیان دەدا. زیاتریش هەڵەکان لەلایەن گەریلاکانی یەکێتی رویان دەدا. لەبەر ئەوە سۆسیالیست بارەگاکانی خۆیان بۆ دۆڵە تووی بەری ئێران گواستەوە و. ناخۆش ترین ڕووداویش لەم بارەوە، بەدیل گرتنی کاك (نەوشیروان) بوو لەلای سۆسیالیست، باش بوو ئەو کاتە هاوڕێ (عەزیز) لە ناوچەکەبوو. بەتوندی نارەزایی خۆی لە دژی ئەم دەسرت درێژی کردنەدەربڕی و گوتی ئەمە دەبێتە پێشینەیەکی خراپ لە پەیوەندی نێوان هێزە کوردستانیەکان دروست دەکات، لەسەر ئەمە سەرکردایەتی سۆسیالیست بڕیاری دا، کاك (نەوشیروان) ئازاد بکات و بیداتە دەست گەریلایەکی ئێمە لە ناوچەی شارباژێر، هاوڕێیانی ئێمەش کاك نەوشیروانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایە بنکەی ئێمە لە ناوچەکەدا، وەکو میوان نەك وەکو دەست گیرکراو. بڕیاریش بوو لەگەڵ خۆیان بیهێنن بۆ ناوزەنگ و بیدەنەوە دەست یەکێتی، بەڵام کاك (نەوشیروان) شەولە بنکەکەی ئێمە رای کردو خۆی گەیاندە بنکەیەکی خۆیان لە ناوچەکەدا، گرنگ ئەوەیە کە گرفتەکە کۆتایی هات.

من وای بۆ دەچم کە گرفتی شەڕی ناوخۆیی، دەگەڕێتەوە بۆ پێکەوەنانی هەردوو بەرەی (جەوقەد و جود) کەلە ساڵی / ١٩٨٠ پێکەوەنران. لە پێشەوە بەرەی جەوقەد کەبەرەیەکی عێراقی بوو، لە کاتی گفت و گۆیەکانی شام وەفدی ئێمە زۆر هەوڵی دابوو، کە پارتیش لەم بەرەیەدا وەربگیرێ. بەڵام یەکێتی رازی نەبو تەنیا ڕێگای بە حشع درا کە بەرەیەکی دوو قۆڵی لەگەڵ پارتی پێکەوە بنێ. دیاربوو سۆسیالیست

دەیویست بێتە ناو ئەم بەرەیە، بۆیە بەرەکە بوو بە سێ قۆڵی و ناونرا بەرەی نیشتمانی دیموکراتی( جود). سەرکردایەتی یەکێتی وای بۆ دەچوون، کە ئەم بەرەیە دژی ئەوانە، بۆیە کەوتە بەربەرەکانی ئەم بەرەیەی (جود)٠

لە هاوینی /١٩٨١ دا ، عبدالله ماوەیەك کە مستەشار بوو لەلای رژێم خۆی و ١٠ – ١٢ جاش هاتن بۆ ریزی حزبمان٠ ئێمەش بۆ ئەوەی چەکدارەکانی رژێم وا هەست نەکەن کە ئەوەی هاتە ریزی پ٠م دەگیرێ و دەکوژرێ وەرمان گرتن٠ لایەنەکانی تر بە تایبەتی پارتی و یەکێتی و سۆسیالیست ، نارازی بوون لە وەرگرتنی ئەم کابرایە، پارتی و سۆسیالیست کە ئێمە قسەمان بۆ کردن وازیان لێهێنا٠ کەچی یەکێتی هەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە عبدالله ماوەیلی بدەنە دەست ئەوان بۆ ئەوەی بیکوژن٠ حزبیش هەر ئەم داوایەی قەبوڵ نەکرد٠ تا شەوێك کە عبدالله بەتەنیا لەماڵێکی لە دەرگەلە دەخەوێ گەریلاکانی یەکێتی دەچنە سەری و دەست گیری دەکەن و دەیبەن لەسەر رێگای پشت ئاشان دەیکوژن٠ لە ئاکامی ئەمەشەرە لە نێوان پ٠م ئێمە و ئەوان لە وەرتێ شەر هەڵدەگیرسێ٠ گەریلایەکی ئێمە بۆ فریاکەوتنی بنکەکەمان لە وەرتێ رۆیشتن، لە گەرویان دەیانەوێ پ٠م یەکێتی لەوێ چەك بکەن، ئەوانیش ئامادە نابن، کە چەك بکرێن٠ تەقە دەست پێدەکاو ٣ – ٤ پ٠م یەکێتی دوو پ ٠ م لە ئێمە شەهید دەبن٠ بنکەکەی ئێمە لە وەرتێ ناچار دەبێ وەرتێ جێنەهێڵن و بنکەیەك لە زراگەلی بکەنەوە٠ و لە ناوزەنگیش سەرکردایەتی هەردولابریاری راگرتنی شەرەکە دەدەن بەم شێوەیە شەرەکە کۆتایی هات، بەلام ساردیەککی هەست پێکراو لە نێوان ئێمەو ئەوان هاتەپێشەوە٠

من ئەو کاتە لە مەلەکان بووم، چونکە نزیك بوو لە رێکخراوەکانمان ئەو لقەی مەلەکان ناچاربوو پاشەکشە بکات بۆ وەرتێ، ئێمەش لەگەلیان چوین بۆ وەرتێ، ماوەیەك لەوێ ماینەوە٠ دیارە رۆژێکیان کە من لەباردگادا نەبووم. کاك نەوشێروان خۆی و هێزێکی یەکێتی، لە دۆلەرەقەوە بەرەو دۆلی – خانەقا – دەچێت ئاگاداری هاورێیان دەکات، کەئەگەر کارێکیان هەیە دێمەلایان٠ بەلام سەرکردەکانی بەتالیۆن،

نەختێ بە ووشکی وەڵام دەدەنەوە کە هیچ کارمان نییە. من کە هاتمەوە رەخنەم لێگرتن و، پێم گوتن، بۆ چ وا بەووشکی گوتوبوتانە هیچ کارمان نییە بەڵام حەز دەکەین بفەرموون چایەك لەلامان بخۆنەوە منیش ئەهاتم لەگەڵدا دائەنیشتم. دوای ماوەیەکی تر دیار بوو کاك (نەوشێروان) دەگەڕایەوە بۆ دۆڵە رەقە، ئەم جارەش ئاگاداریکردینەوە کە دەیەوێ سەردانمان بکات. منیش لەوەڵامدا گوتم بابفەرموێ چاوەڕێی دەکەین. دوای ماوەیەکی کەم هات ئێمەش بە گەرمی پێشوازیمان لێ کرد. من و هاوڕێ ابو عادل الشایب - لەگەڵی دانیشتین دوای نەختێ ووردە گلەیی هەردوولامان. نەوشێروان پێی گوتم کە ئێمە بڕیارمان داوە تەنازولی مێژوویی بکەین و، رێگا بە پارتی بدەین بێنەوە ناوچەی سۆران، بە مەرجێ چیتر شەڕی حزبی دیموکراتی ئێران نەکەن و، بڕیارە لەم نزیکانە کۆبوونەوەیەك رێك بخەین. بە ئامادە بوونی ئێوەو پارتی و و حزبی دیموکراتی کوردستانی - ئێران، بۆ گفت وگۆ کردن لەسەر ئەم تەنازولەی ئێمە. و حەزدەکەم هاوڕێیانتان لەم ناوچەیەدا. ئاگاداربکەنەوە بۆ ئەوەی هیچ گرفت دروست نەبی، وپێشی گوتم کە هێزێکی پارتی لەبارەگای ئێوەیە لە پشت ئاشان، بەڵام ئێمە دەستیان بۆ نابەینچونکە بارەگای ئێوەلەلای ئێمە پیرۆزەو دەستی بۆ نابەین. ئەنجا هەڵسا و رۆیشت بۆ دۆڵە رەقە.

منیش هەر ئەو رۆژە نامەیەکم بۆ (ملازم خدر) نووسی و قسەکانی کاك نەوشێروانیشم بۆ نووسی، ولە کۆتای دا ووتم پێشنیار دەکەم، کە ئەو هێرشەی بڕیارە ئێمەو پارتی بکەینە سەر هێزەکانی یەکێتی لە وەرتێ و دۆڵی خانەقا رابگرن تا بزانین دەست پێشخەریەکەی یەکێتی چۆن دەبێ. چونکە من لەو باوەڕەدام کە نەوشێروان فروفێڵ نازانێ هەمیشە بەڕاشکاوی قسە دەکات. نامەکەم رۆژی دوایی دایە دەست ئەبو هێمن کەبەرپرسی سیاسی بەتالیونی هەولێربوو دەچوو بۆ پشت ئاشان. بەڵام (ملازم خدر) بەقسەی نەکردم دوای چەندرۆژێ هێرشەکەی بۆ دۆڵی خانەقا و وەرتێکرا. من زۆر گومانم هەیە لەوەی ئەبو هێمن نامکەکەی نەدابیتە ملازم خدر. چونکە دوای دەرکەوت کە ئەبو هێمن پەیوەندی لەگەڵ رژێمدا هەیە.

لەئاکامی هێرشەکە پێشمەرگەکانی یەکێتی پاشاکشەیانکرد، لەوەرتێش کەسی وایان نەبوو، تەنیا ٢ – ٣ پ٠م هەبوونەوانیش رایان کردبۆ دۆڵەرەقە٠ بەڵام لەوێ خۆیان کۆکردەوەو هێزێکی زۆریان ئامادەکرد، بۆ هێرش کردنە سەر وەرتێ٠ هێزەکانی جودیش خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکەدا٠ لە ٨ یا ٩ /ت٢ / ١٩٨١ هێرشیان دەست پێکردبۆ سەرمان بەڵام سێ رۆژ نەیاتوانی هیچ بێنەپێشەوە٠ چەنکە هێزەکەی پارتی دۆشکەیەکی ئەمریکیان پێ بوو، لە سەر گردی دایان بەست بوو، لە هەر لایەك هێزی یەکێتی پێشڕەویان کردبا دوو سێ گوللە دۆشکایان تێدەگرتن و پاشەکشەیان دەکرد٠ بەلام دیار بەهێزەکەی پارتی بڕیاری پاشەکشەی دابوو، بۆیە دۆشکاکەوو رەبیەکی زۆر گرنگیان بە دەستەوەبوو٠ بەبێ ئاگاداری ئێمە و سۆسیالیست پاشەکشەیان کردبوو، شەو (ملازم خدر) و من چوینەلای – مەلامحمد – کە ئەوسا بەرپرسی لقی دووی هەولێربوو٠ داوان لێی کردکە دوشکاکەمان بۆ بەجێ بهێڵێ٠ بەڵام رازی نەبوو، (ملازم خدر) پێی گوت بەڵێنت پێدەدەم کە خۆم لەسەر دۆشکا دەبم و تا نەکوژرێم نایدەمە دەست یەکێتی٠ کەچی (مەلامحمد) هەر سوور بوو لەسەر نەدانی دۆشکاکە بە ئێمە وگوتی (کاك مسعود) داوای کردوەپاسشەکشە بکەین٠ دەرکەوت کە هێزەکەی یەکێتی هەستیان بەوە کردبوو کە رابیەکەی سەر (زینی ئەستێروکان) چۆڵ کراوە هەر زوو رەبیەکەیان داگیر کردبوو٠ هێزەکەی ئێمە و سۆسیالیستیش لە توانای دانەبوو بەرەنگاری ئەو هێزە زۆرەی یەکێتی بباتەوە وە کە بەیانی پێشمەرگەکانی یەکێتی زانسیان دۆشکەکە نەماوە لە هەموو لایەك هێرشیان هێنا و نزیکبوونەوە لە وەرتێ٠ بەڵام دیار بوو لە نێوزەنگ هاوڕێ ئەبو سەرباز – مەلا احمد بانیخێلانی -لەگەڵ مام جەلال رێك کەوتبوون کە شەڕەکە رابگیرێ و، مام جەلال بروسکەی بۆ نەوشێروان کردبووکە شەڕەکە رابگری٠ بەڵام ئێمە هەرپاشەکشەمان کردبوو٠ هێزی سۆسیالیستیش لەگەڵ ئێمە پاشەکشەیان کرد٠

بەم شێوەیە شەڕی وەرتێی دووەم کۆتایی هات، دوای ۲-۳ ڕۆژیش وەفدەکی ئێمەو ئەوان کۆبوونەوەو لەسەر هەندێ شت ڕێکەوتن وەکو ڕێگادان بە گەریلاکانی ئێمە و سۆسیالیست بۆ چوونەوە دەشتی کۆیێ و هەولێر و خۆشناوەتی بۆ درێژەدان بە چالاکی دژی هێزە چەکدارەکانی ڕژێم. بەلام هێزی پارتی دەبێ بگەڕێتەوە بۆ دۆلی ڕۆست – لەسەر ئەم ڕێکەوتنە چەند گەریلایەکی ئێمە لەگەل کادیرەکانمان گەڕانەوە بۆ دەشتی کویێ و خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر، زۆری پێنەچوو لە(سێکانیان) توشی شەرێکی نابەرامبەر بوونە، لەگەل هێزێکی گەورەی ڕژێم لە ڕۆژی ۲۷ / ۱ / ۱۹۸۲ دا. هەر چەندە پێشمەرگەکانمان زۆر ئازایانەڕووبەڕووی هێزەکەی ڕژێم بوونەوە، بەلام چونکە هێزەکەی ڕژێم گەلێ زۆرتربوو لە گەریلای ئێمە، ئەو هێزە بە پالپشتی چەند هێلیکۆپتەرێك بوو زیانی گەورەمان لێکەوت یانزە پ.م ئازامان شەهید و بەدیل گیران. ئەو هێزەش کەمتەرخەمی نەکردو ژمارەیەکی زۆری لە هێزی ڕژێم کوشت و بریندارکرد، لە ڕاستی ئەو شەڕەی (سێ کانیان) داستانێك بووبۆ خۆی لەگەل ئەو ژمارە زۆرەی شەهید و بریندارەو بەدیلگیراوەکانمان. شایانی باسەکەجێگایەکەش هەموار نەبوو بۆ شەڕی پارتیزانی. هەر لەهەمان ئەوکاتەشدا ڕێکخراوی سلێمانیمان کەشف بوو کۆمەلێ کادیرمان دەست گیرکران، هەر لە ئاکامی گیرانی ئەو کادیرانەمان، کە ببونە مکۆی ڕێکخراوەکانمان لە کوردستان هاوڕێ ئازامان (د.حبیب المالح) و هاوڕێیەکی تری خەلکی دەشتی کۆیێمان کە کارمەند بوو لە هەولێر دەست گیرکران و شەهیدیان کردن. هەرچەندە ئەو سالە سالی شکستی هێزەکانی ڕژێم بوو لە جەنگی عێراق – ئێراندا، بەلام حزبی ئێمە وێرای کەشف بوونی ناوەندی کوردستان، دووزیانی پێشمەرگایەتی گەورەمان لێ کەوت لقەکەی کەرکوکمان بەسەرکردایەتی پێشمەرگەی چاونەترس (بەکر تەلانی) بوە ئامانجی هێزێکی گەورەی ڕژێم لەبەری کەرکوك زێی بچووك لەسەروبەندی ئاهەنگ گێران بوو بۆ یادی دامەزراندنی حزب. کە بووە هۆی شەهید بوونی ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەکانی ئازای ئەم لقەی کەرکوك و،

پێشەوایان هاوڕێی ئازاو دلێر هاوڕێ – بکر تەلانی – کە شارەزایەکی زۆریلە شەڕی پارتیزانی هەبوو لە ژمارەیەکی زۆری نەبەردی پێشمەرگایەتی، سەرکەوتوانە بەشداری کردبوو. نازانم لە شوێنێکی ناهەموار بوو ڕێگای نەدابوو پێشمەرگەکان پاشەکشە بکەن؟!! بەم شێوەیە خۆی و ژمارەیەکی بەرچاوی پێمشەرگەکانی شەهید بوون خۆشی بەرپرسی سیاسی لقەکەش هاوڕێ – ئەحمەد – شەهید بوون و بەراستی کادیری شەڕی پێشمەرگایەتی بەم دوو سێ دێرە مافی خۆی پێنادری، بەڵکو شایانی ئەوەیە کە کتێبێ یا هەر نەبێ نامیلکەیەکی لەسەر بنووسرێ.

شکستی دووەم لە گوندی – بەکربایف – دەشتی گەرمیان بوو کە گەریلاکانمان لەم گوندەدا. دووچاری هێرشێکی بەربلاوی دوژمن بونەوە، ئەویش بە هاوکاری فڕۆکەی هێلیکۆپتەر لەم شەڕە نەخوازراوەش دا. ژمارەکی زۆری هاوڕێکانمان شەهید بوون، لەناویاندا هاوڕێ کوڕی هاوڕێ (مەلا ئەحمەد) بوو. بەراستی ئەم سێ زیانەی، سێ کانیان و بەکر بابیف و ئەوبەری زێی بچووك، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر رۆڵی حزبمان لە شەڕی پاترتیزانیماندا. بەڵام لە بواری ڕێکخراوەیدا ڕێکخراوی پارێزگای هەولێرمان بە خێرایی فراوان بوو زۆری ئەو هاوڕێیانەی لە حزبدا بچڕابوون گەڕانەوە بۆ ریزی حزب و کۆمەڵە گەنجێکی تازەش هاتنە ناو حزبەوە.

هەرلە ساڵی / ١٩٨٢ دا، ڕاپەڕینێکی جەماوەری لە کوردستان تەقیەوە. ڕاپەڕینەکە لە شاری قەڵادزە سەری هەڵدا، کە کۆمەڵە ژنەشەهیدێکی ساڵی / ١٩٧٤، چووبوونە سەر گۆڕی شەهیدەکانیان. بەڵام پیاوەکانی سوپای عێراق، جوڵەی نیمچە جەماوەرەیان ، بەلاوە گران بوو بۆیە تەقەیان لەم کۆمەڵە ژنە کرد، لە ئەنجامدا دایە ئامینە و مامۆستا سنەوبەر شەهید بوون و ژمارەیەکیش بریندارببوون.

دوای ئەم دەست درێژیە ترسنۆك و نامەردانەی کاربەدەستانی رژێمی گۆڕ بەگۆڕی بەعس جەماوەری شاری قەڵادزەی خۆڕاگر تێکڕاخۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست و، لەو خۆپیشاندانەدا چەند دروشمێکی شۆڕشگێڕیان دژی رژێم بەرزکردەوە، دیسان رژێم بە تەقەکردن خۆپیشاندانەکەی جەماوەری بلاو پێکرد، دوای سووڕانەوەی

خۆپیشاندەران بە هەموو شەقامەکانی شارەکەدا٠ دوای بڵاوبوونەوەی دەستدرێژیە بێئابڕوویانەکەی رژێم بۆ سەر ژنانی قەڵادزێ تەقەکردن لە خۆپیشاندانەکەی جەماوەری شارەکە٠ جەماوەری رانیەی دەروازەی راپەڕین خۆپیشاندانێکی گەورەیان بەبەشداری هەموو لایەنەکان رێکخست، هەرچەندە کاربەدەستانی سەربازی و مەدەنی ئەم شارە ویستیان بڵاوە بە جەماودری راپەڕیو بکەن بۆیان ئەنجام نەدرا٠ دوای خۆپیشاندانی رانیە جەماوەر لە شاری سلێمانی کۆڵ نەدەدەر، راپەڕین خۆپیشاندانی گەورە گەورەیان رێکخست، کە جەماوەر بە راشکاوی هاواریان دەکرد٠بڕوخێ رژێمی دکتاتۆری بەعسی و راپەڕینەکە چەند رۆژی درێژە کێشا٠ ئەنجا جەماوەری شاری هەولێری دێرین راپەڕین، لەگەڵ ئەوەی کە رژێم بە توندترین شێوازی زەبرو زەنگی بەکارهێنا دژی جەماوەر چەند کەس کوژران و ژمارەیەك برینداربوون.وهەندێکیان تا ئەم رۆژەش بێ سەرو شوێنن وەکو قوتابی زانکۆ (سمیرفاروق) کە مامیشی(جماله) چاوشین و هەرچوارکوڕەکەشی (غفارومهدی ومحمدامین وشۆڕش ) لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان شەهید بوون، بەراستی بنەماڵەیەکی قوربانی پێشکەش کەربوون نمونەی ئەو بنەماڵە کوردانە بوون کە بێباکانە قوربانیان پێشکەش ئەکرد لە پێناو مافە رەواکانی گەلی کوردستان و داخوازیەکانی چینەهەژارەکان٠ شاری کەرکوکی بابەگوڕگوڕیش، هەرچەندە فشارێکی قورسی رژێمی لە سەری بوو، بەڵام رۆڵە چاونەترسەکانی ئەم شارە شەهید شێخ مارف و جبارو پیروزخان و مهدی مەردان ، نەیان ویست لە شەرەفی مەزنی بەشداریکردن لە راپەڕینە جەماوەریەکەی گەلی کوردستان رۆڵیان نەبێ٠

رژێمی دکتاتۆری بەغداش مەترسیەکی زۆرگەورەی لە و راپەڕینە لێ نیشت٠ بۆیە لە شاری سلێمانیدا پیاوەکانی رژێم بە ئاراستەی سەرۆکە تۆقیوەکەیان، لەگەڵ کەسایەتی و پیاوە ئایینیەکانی کۆبوونەوەدو پرسیان پێکردن٠ ئاخۆ چۆن دەتوانن ئەم کێشەی گەلی کوردستان چارە بکەن٠ پیاوە ئایینیەکان و پیاوەماقەولانی پێیان گوتن، ئەم کێشەیە بە دەست پێشخەریەکی وەکو ساڵی / ١٩٧٠ و دانان بە مافە

ڕەواکانی گەلی کوردستان چارەسەر دەکریٚ. بەلاٌم دیار بوو سەرانی ڕژیٚم بەم ڕیٚگا چارەیە ڕازی نەبوو، بەلٌکو پەنای برد بۆ ڕیٚگای پیلان گیٚڕان و لەیەك هەلٌەی شاندنەوەی ڕیزەکانی گەلی کورد، ژیٚر بەژیٚر کەوتە گفت وگۆ لەگەلٌ سەرکردایەتی یەکیٚتی نیشتمانی کوردستان. دیارە مەرجیشیان بۆریٚك کەوتن نەهیٚشتنی بزافی چەکداری لە کوردستاندابوو. گفت وگۆیەکە هەر دریٚژەی کیٚشا تا سالٌی / ١٩٨٣، بەلام لە ئاکامی ئەم گفت وگۆیەدا. ساردی لە نیٚوان بەرەی جوقد وجودداقوولتربوو. هەرچەندە ڕژیٚم لەریٚگای (عبدالرحمان قاسملوی) شەهید لەگەلٌ حزبی ئیٚمەش هەولٌی داو گوایا سەدام بە دکتۆر قاسملوی گوتوە کە ئەو کیٚشەیەی لە نیٚوان ئیٚمەلەلایەك ولە نیٚوان پارتی و یەکیٚتی دا هەیە، هەر دوو لا لیٚی بەرپرسین، بەلاٌم کیٚشەو لە نیٚوان ئیٚمەو حزبی شیوعی دا هەیە، هەر ئیٚمە یاخود بەعس لیٚی بەرپرسە، سەرکردایەتی حزب بیٚ پیٚچ و پەنا گفت وگۆی لەگەلٌ بەعس ڕەتکردۆتەوە. چونکە حزب دەیزانی کە سەدام پیاویٚکی فیٚلٌ بازوساختەکارە هیچ بڕوای بە دیموکراسیەت و مافی ڕەوای گەلی کوردستان نییە ئەو دەست پیٚشخەریە لە ئاکامی بیٚتوانایيەتی، دوای شکستی هیٚزە سەربازیەکەیەتی لە ( محەمەرە) و ئەو ڕاپەڕینەی گەلی کوردستانە و، دەیەویٚ بەفیٚلٌ هەر نەبیٚ ماوەیەك شۆڕشەکەی گەلی کورستان سارد بکاتەوەو، هەر کاتیٚ خۆی بەهیٚز کردەوە پشت لە ڕیٚکەوتن نامەکەی دەکات.

لەم ماوەیەشدا ئیمپریالیزمەی ئەمریکی بە ئاشکرا یارمەتی ڕژیٚمی سەدامی دەدا دژی کۆماری ئیسلامی ئیٚران کە دژی ئەمریکا بوو هەر لە سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئیٚران تا ئەمڕۆش. بەم شیٚوەیە لەسالٌی / ١٩٨٣ دا، ڕژیٚم نەختیٚ هیٚزی پەیدا کردەوەو دوای تیٚکشکانی چەند هیٚرشیٚکی کۆماری ئیسلامی بۆ سەرعیٚراق کە مەبەستی شاری بەسرە و هەندیٚ شویٚنی گرنگ بوو لەعیٚراقدا داگیر بکات، بۆیە ڕژیٚم دوای ئەوە ڕیٚکەوتنەکەی لەگەلٌ یەکیٚتی پاشگەز بووە. هەرچەندە کاك نەوشیٚروان ڕای وابوو کەیەکیٚتی تەحەمولی ئەو پاشگەزبوونەوەدەکات.

بەلاَم بەداخەوە لەناكامی ئەو گفتوگۆیەی یەكێتی لەگەڵ رژێم دا كردی بوە هۆكاری شەری فراوان هێزەكانی یەكێتی و جوود هەرچەندە یەكێتی ئەو رووداوەی گوندی باداوانی قۆستەوە بە هێرشكردنە سەر بەرەی جود. لەگەڵ ئەوەش كە ئەو هێزەی لەگەڵ شەهید شەماڵ و سەرباز بوو دەست پێشخەریان كردبوو بۆ هێرشكردنە سەر كۆمەڵە پ.م سۆسیالیست كەلەو گوندە بوون، بەنیازی پەرینەوە چووبوون بۆ بنكەی سەرەكی سۆسیالیست لەبناری سەفین دا. شایانی باسە كە گەریلایەكی ئێمە لەو گوندە دەبن و بەسەركردایەتی (حمەی حلاق)، یەكێتی حمەیان بەوە تاوانبار كرد كە ئەو بۆ پ.م سۆسیالیستیان شێخ شەماڵ و سەربازی دەست نیشان كردووە، بەم شێوەیە حزبی ئێمەشیان تاوانباركرد لەم كێشەیەداو، هەموو پەیوەندیەكیان لەگەل ئێمەدا پچراند كە بنەكەمان لەگوندی (شێخ وەسانان) بوو، مەڵبەندی سێیەمی ئەوانیش لە بالیسان بوو. رێگای هات و چۆشیان لێبرین. دەبی باسی ئەوەش بكەم، لە پێش ئەم رووداوەدا . هێزیكی پ.م یەكێتی بۆسە ( كەمینیان)لە هێزێكە هاوبەشی ئێمەو سۆسیالیست لە دەشتی كۆیی نایەوە و، چەند هاورێیەكی ئێمەو ئەوانینیان شەهید و بریندار كردو ژمارەیەكی تریان چەك كردن. هەرچەندە بریار بوو بۆ چارەسەر كردنی ئەو كێشەیە كۆبوونەوەیەكی هاوبەشی ئێمەو ئەوان و سۆسیالیست لە بارەگای ئێمە بكرێ، بەلاَم بەبیانوی رووداوی گوندی باداوان لەم بەڵێنەش پاشگەزبوونەوە. لەسەر ئەمە ئێمەو پارتی و سۆسیالیست بەیاننامەیەكمان لەسەر مەڵبەندی سێیەمی یەكێتی دەركردو هەولی زۆرماندا كە بەیاننامەی بریندار كەر نەبێ، بەلاَم هەندێ راستی هەبوون كە دەبی هەر باسیان بكەین. ئەوانیش لە وەلاَمی ئەو بەیاننامەیە سێ قۆڵیەی ئێمە، بەیاننامەیەكی پر توندو تیژی دەركردو لە ئێسگەكەی خۆیان بلاَویان كردەوە.

بەم شێوەیە هەرچەندە لەم كاتەدا وەفدی بالاَی سەركردایەتی سەردانی بارەگای سەركردایەتی ئەوانی كردبوو . بەیاننامەیەكیان دەركردبوو لە باردی بەهێزكردنی پەیوەندی هەردوو حزبدا. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر مەسەلەیە، تەماشای

یاداشتەکانی هـ. کەریم ئەحمەد بکە بەناوی – المسیرە – چونکە خۆی یەکێك بوو لە ئەندامەکانی وەفدەکە. ئەم هەڵ و مەرجـە نـا هـەمواره نزیکەی مـانگێکی خایانـدو ئەوان هەر هێزی خۆیـان لـە پارێزگـای هـەولێر کـۆدەکردەوە. ئێمـە وامـان مەزەنـدە دەکـرد، کـە خۆیـان بـۆ هێرشـکردنە سـەرمان ئامـادە دەکـەن لەبـەر ئـەوەو بـە هـۆی زیادبوونی مەڵبەندی یەکێتی، هێزەکانی جود رۆژی ١٩٨٣/٤/٢٤ ، هێرشیان کردە سەر مەڵبەندی سێ لە گوندی (بالیسان) وشەر تـا رۆژئـاوا درێـژەی کێشا. لەلایـەنی جـود دوو هاوڕێی ئێمە ئـازاد سەرسۆری شـەقلاوە هاوڕێیـەکی خـەڵکی بەغـدامان شـەهید بـوون. لەگـەل پ.مێکـی گوڵۆبـاغ لـە پارتیـدا . بەرپرسـی گونـدی - توتمێ –ش کـە سۆسیالیست بوو بەسەختی بریندابوو، رەوانەی هەولێریشکرا بـەڵام لەبـەر سـەختی برینەکـەی لـە نەخۆشـخانەدا شـەهید بـوو، و نـازانم چـەند پێـشمەرگەی ئـەوانیش شەهید بـوون. شـەو زانیمـان کـە مەڵبەنـدی سێ پاشەکشەی کـردووە بـۆ گونـدی – بیراوە – لە هەمان رۆژ لە گوندی - مەلەکان – یش شەڕ دەستی پێکرد بوو لە نێوان هێزەکانی ئێمەو ئەوان جارجارە تەقەی دوور بەدووریان لە یەکتر دەکرد .

دیـارە یـەکێتی هێزێکـی زۆری بەسـەرکردایەتی نەوشـێروان کـۆ کردۆتـەوە، بـۆ سـەر بارەگای حزبمان وسۆسیالیست و ئەو گەریلایەی پارتی کە لە گوندی -پشت ئاشان – و دەوروبەری دا بوون. هێزەکەی ئێمە لەوێدا بەشی زۆری کادری حزب بـوون لـەبرا عەرەبـەکانمان، بۆیـە توانـای رووبەڕووبوونـەوەی هێزەکـەی یـەکێتی یـان نـەبوو ژمارەیەکی زۆر کەنزیکەی پەنجا هاوڕێ دەبووبـەدیل گیران و شـەهید کـران، لەگـەڵ خوشـکێکی پێـشمەرگەدا، بەراسـتی ئـەم کـارە تـاوانێکی گـەورەبوو لـە دەمـارگیری نەتەوەییـەوە سەرچـاوەی گرتبوو،لەوانەشـە رژێـم هـانی دابـن بـۆ کوشـتنی ئـەم کادیرانەمان بۆئەوەی حزبمان لە ناوەراست و خواروی عێراق لاوازببێ. بێجگـە لـەو دیلانـەی کـە بـەم شـێوە ناجوامێرانـە شـەهید کـران، چـەند هاوڕێیـەکی ئازامـان لـە رووبەرووبوونەوەکـە شـەهید کـران، لەناویانـدا هـاوڕێ خـدرکاکیل کەبـە قاردمـانی داگیرکردنی سەنگەرەکانی ناسرابوو، لەراستیدا ئەم شەڕە خزمەتێکی زۆری بە رژێم

کردو زیانێکی زۆریشی بە خەباتی چەکداری کوردستان گەیاند، بەبۆچوونی من یەکێتی بە پلەی یەکەم ئۆباڵی ئەم شەڕەی دەکەوێتە سەر بەتایبەتی نەوشیروان هەرچەندە لایەنی جوودیش نەختێ لە ئۆباڵی ئەم شەڕە ناڕەوایە تحمل دەکات. دیارە هێزەکانی یەکێتی نەخشەی هێرشی هەبوو بۆ سەر ناوچەی خۆشناوەتی، و بۆ ئەوەی زیاتر خوێنی لاوەکانی کورد بە ناڕەوا بڕژێ، هێزەکانی جوود بڕیاریاندا کەلەم ناوچەیەدا پاشەکشە بکەن بۆ ناوچەی رۆستێ . لەم پاشەکشە بەدرێژیەش دەبوو ٢ – ٣ جار لە شەقامە سەرەکیانا ، کە سەنگەری رژێمی لێبوو دەربازببین. بەم شێوەیە بە رێگای بەنی هەریر، لە شەقامی هەولێر – رەواندوز پەڕینەوە لە یەکێ لە سەنگەرەکانی رژێم لە دۆلی (نیشاوە)تەقەمان لێکرا، باش بوو تەقەکان بێ زیان بوون. دوای نیوەی شەو گەیشتینە گوندی (سرێشمە)خەلکی ئەو گوندە ئەو شەوە زۆر خزمەتیان کردین و نانێکی باشیان پێ داین. بەرەبەیان بە رێگای گەلی (علی بەگ)دا بەرەوچیای برادۆست کەوتینە رێگاوە، نیوەڕۆ هەر لە گەلیەکەماینەوە. بۆ ئێواریەکی درەنگ گەیشتینە مامەندە رەش مالێکی کگۆچەریان لە خێلی – بالەکی – شەو لای ئەوان ماینەوە هەرچی نانی هەیان بوو بە ئێمەیان دا، بەلام لەبەر زۆری ژمارەمان بەشی نەکردین. بۆ بەیانیش هیچ مان نەبوو بیخۆین. پێش نیوەڕۆ خەلکی گوندی - بالەکیان – پەیدابوون و هاتنە لامان. دیتیان کە بارو دۆخمان خراپە و نانمان نییە گەڕانەوە بۆ پاش نیوەڕۆ، نان و شەکرو چایەکی زۆریان بۆ هێناین، سوپاسیان دەکەم.

دوای رۆژئاوا بە چیایەکەدا چوونە خوارەوە، بەرەو شەقامی رەواندوز مێرگەسوور. بە دۆلێکی زۆر سەخت و ناخۆشدا کە پێیان دەگوت (گەروێ پیران)هەرهەمووی کۆسپەبوون. پ.م کان هەر هەموویان دەستی یەکتریان گرتبوو، هاوڕێ سالاری شەهید و کوڕەکەی لە پێش مندا بوون. رەنگە ئەو هاوڕێیە بیست جار زیاتر کەوتبێ چونکە قاچێکی کۆنە شکست بوو. بۆ بەرەبەیان گەیشتینە سەر شەقامەکە، دیاربوو جاشەکانی ئەو ناوچەیە بۆسەیان بۆ دانابووین، بۆیە پێش ئەوەی بگەینە

سەر شەقامەکە چەند تەقەیەکیان کردو دوای بە سواری ئۆتۆمبیلەکانیان رۆیشتن. ئێمە بەرەو (کونەگوند) دەرۆیشتین، بە هەزار حاڵ پێش رۆژهەڵات گەیشتینە گوندەکە. خەلکی گوندەکە زۆر خزمەتیان کردین و پێیان راگەیاندین کە بەس بەچەکەوە نەچینە دەرەوە، چونکە سەنگەری رژێم زۆر نزیك بوو لە گوندەکە، ئێوارە بەرەو رۆژئاوا رۆیشتین و چووینە چەند گوندێکی بچووك، من و چەند هاورێ لە گوندی ماویلیانۆك ئەو شەوە ماینەوە. هەمووومان خربووینەوە لە بەیانیەکەدا، بەرەو ناوچەی – سیدەکان – بامان دایەوە بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندێکە خێلی – برادۆست – بەناوی گۆری، شەو لەوێ ماینەوە، خەلکی گوندەکە پێیان گوتین لێرە هیچ مەترسیتان نەبێ، رژێم لەوناوە نییە و کەریم خانیش پێیگوتوین، ئەگەر شیوعیەکان رێیان کەوتە لاتان خزمەتیان بکەن.لەبەر ئەوە زۆر ماندووبووین رۆژی دوایش هەرلەوێ ماینەوە. بۆ رۆژی دواتر بەرەو رۆژهەڵات کەوتینە رێ بۆ نیوەرۆگەیشتینە گوندەکی تر لەوێ نانی نیوەرۆیان داپێمان بەلام بە پێنج دینار تەنەکە ئاردێکیان بۆ کردین بەنان ئەو کات پێنج دینار زۆربوو. بۆ شەو چوینە شوێنێك کە هەندێ رەشماڵی لێ بوو، شەو لەوێ ماینەوە بۆ رۆژی دوایی بەرەو رۆست بەرێ کەوتین، لە رێگاکە رووبارێکی بە خور هەبوو یەکێ لە پێشمەرگەکانمان تفەنگەکەی لێکەوتە ناو رووبارەکە هەرچەندە بۆی گەراین نەمان دیتەوە. ئێوارەکە گەیشتینە گوندی رۆستێ، کە گوندێکی گەورەیەو لە سنووری نزیك و رژێم لەساڵی / ١٩٧٨ رایگواستونەتەوە. بەلام شکستەکەی رژێم لە ساڵی / ١٩٨٢ دا، بواری دا بە خەلکی بەبێ رەزامەندی رژێم بگەرێنەوە گوندەکانی خۆیان، چونکە لەو ئۆردەگازۆرەملێیانە بەبێ کار دانیشبوون، رۆستی گوندێکی کۆن و گەورەبوو پێش راگواستن و، ناوچەیەکی فێنك و خۆش لە هاوینان هەرچەندە بە زستان نەختێ ئاو وهەوای ساردەو بەفرێکی زۆری لێ دەباری، خەلکەکە زۆر سەخی و بەر چاو فراوانن، ئێمە کە ژمارەیەکی زۆری پ.م بوین نزیکەی مانگێ لە ماڵەکانی ئەم گوندە دەژیاین. تا توانیمان هەندێ کەل و پەلی پێویست و ئازوقە بکرین و

چەند بارەگایەك دابنێین. لە راستی دا ئەم گەشتە نەویستەی خۆمـان وەكو نیمچە رێ ڕەوە گەورەكەی – المسيرة الكبرى – چین دەهاتە بەرچاو.هەرچەندە هەنـدێ رێرەوەكەی ئەوان درێژ نەبوو، هیچ كەسمان لێ نەمرد لە رێگادا. بـەڵام وەكو ئـەوان دووچـاری مەترسـی ومانـدوبونێكی زۆربـووین. دوای ئـەوەی لـە گونـدی رۆسـت و هەندێ گوندی دەوروبەری وەكو گرتك و سمێرن، كە نێستابووە بە ناوچە – ناحیـە- جـێگیر بـووین. بیرۆكـەی ئـەوە هاتـە پێـشەوە، هێزێكـی هاوبـەش ڕەوانـەی چـیای - قەنـدیل – بكەین لەوێوە هێرش بكەینە سەر بنكەكانی یـەكێتی لـە بنـاری قەنـدیل، وەكو تۆڵە سـتاندوەك لـەو هێرشـەی كردیانـە سـەرمان لـە ناوچـەی سۆران دووریـان خستینەوە. رێكخستنی هێزەكە درێژەی كێشا، بەڵام لە مانگی ئەیلول هەر كراو، لەو هێرشەش سەركەوتوو نەبووین چەند هاوڕێیەكمان شەهید بوون وەكـو نـزار نـاجی یوسفی برای دایكی ئیمانی خێزانی هاورێ هەمیشە زیندو (سـلام عـادل)و دكتۆرێـك كـە بـرای هـاوڕێ – ابـو یـسار – ی ئەنـدامی ك.ن حزبـی شـیوعی عێـراق و چـەند هاوڕیەكی تر. من زۆر لە ووردەكاری ئەم شەڕەی – قەندیل – نازانم چونكە كـاتی ڕوودانی بەرێگاوە بووین بۆ سوریا.

من لە زستانی ١٩٨٢ – ١٩٨٣ دا، نەخۆش بووم بۆیە داوام لە حزب كـرد كـە بمنێـرن بۆ یەكێ لە دەوڵەتە سۆسیالیستەكان هەم بـۆ ( دەورەی حزبـی) كـەهیچ دەورەیـەكم نەدیبوو، هەروەها بۆ چارەسەری نەخۆشییەكەم . لە ناوەراستی مانگی تەموزی ١٩٨٣ دا ئاگاداریان كـردم كـە خـۆم ئامـادە بكـەم. منـیش نـاردم منداڵـەكان هـاتن و چاوم پێیـان كـەوت، دوای گەڕانـەوەیان لـە دەوروبـەری ٢٠/ تـەموزی /١٩٨٣ دا، لەگـەڵ گەرێلابەكە حزبی بەرێ كەوتم بۆ ناوچەی بادینان، دوای هەشت رۆژ بە پێ رۆیشتن گەیشتینە بارەگای كەرتی بادینانمان كەلەسەر زێی گەورەبوو. لەوێ چاوم بە هـاوڕێ (ئەبو جوزێف) كە بەرپرسی كەرت بـوو. لەگـەڵ چـەند هاوڕێیـەكی ئـەو ناوچـەیەدا كـەوت هـەروەها چـاوم بـە هـاوڕێ شـەهید(خیـری القاضـی) كـەوت كـە تـازە لـە چارەسەری (علاج)لە (بولغاریا)دا گـەڕابوەوە لەسـەر داوای خـۆی، كەبەداخـەوە دوای

ماوەیەك بە نەخۆشی دڵ گیانی لەدەست دا، دوای یەك دووڕۆژ حەسانەوە، ڕەوانەی فەوجی یەکەمیان کردین، لە گەلی ئەسپان کە دەکەوێتە پشت ئەو چیایەی نێوان بامەڕنی و گەلیەکە نزیکەی مانگێ لەوێ مامەوە تا نۆبەتمان هات، بۆ ڕۆیشتن بەرەو سوریا بە ناوتورکیادالەوێشەوە بۆ ئەو بنکەیە ڕەوانەیان کردین، کە لە گەلی (کێشان) بوو. گەلی کێشان گەلێکی زۆر دورو درێژو ئاوێکی بەناو دەڕوات، دەکەوێتەباشووری زاخۆوە. چەند ڕۆژیش لەوێ ماینەوە، تا گەریلارێك خرابوە تاریکە شەو. ئەنجالەوێوە بە شەوێکی تاریك ڕۆیشتین و لە ڕێگا چەند گوندی سوتاومان دیت، کە مزگەوتەکان وکەنیسەکانیان کاول کردبوو. بۆ بەیانی گەیشتینە گوندی(سەنات)کە چیایەکی لە پێش بوو سەروی چیاکە سنووری نێوان ئێراق - تورکیابوو. گوندە ڕاگوێزرابوو هەموو خانووەکانی وێران کرابوون. بەلام ڕەزو باغێك و دارگوێزێکی زۆری لێبوو، وەرزی فەریکە گوێزبوو، ئێوارەکە بە چیایەکە هەلگەڕاین، تا گەیشتینە سەری چیایەکە شەو داهات، لە دامێنی چیایەکەدا، گوندێکی کوردستانی کاول کراو هەبوو، لەوێ لاماندا بۆ نان خواردن، هەرکۆمەلێ ئاگرێکی کردبۆوە بۆ چای لێنان، من لەو کاتەدالەسەر پشت پاڵ کەوتبووم، ئەستێرەیەك دارژا، سەرۆکی مەفرەزە وای زانی کە ئەمە - لایتی قەرەقولەکانە هەرچەندە من پێم گوت هاوڕێ ئەمە ئەستێرەبوو دارژا بە قسەی منی نەکرد بڕیاری دا کە هەموو ئاگرەکان بکوژێننەوە، خێرا نانەکەمان بخۆین و بجولێین. ڕێگاکە زۆر سەخت و ناخۆش بوو، دوای ئەوەی لە گوندەکە دەرچووین، هاوڕێ شەهید (مەلا بەختیار) لە پێشم دەڕۆیشت زۆر ئاگادارم بوو. بەلام ڕێگاکە شاخاوی و سەخت بوو وتاریکیش بوو هیچ ئاویشی لێنەبوو، پێیان دەگوت سەری(زیارەت) بەم شۆمیە تا سەعات سێی دوای نیوەشەو ڕۆیشتین ، ئەنجا گەیشتینە ئەشکەوتێك، لەوێ پێیان ڕاگەیاندین،کە ڕێگا کە لەمەودوا سەخت تردەبێت، بۆیە دەبێ چاوەڕێ بکەین تا نەختێ دونیا ڕووناك دەبێت. لە ڕاستیدا ڕێگاکە سەردو خواربوو، دوای گەیشتینە شاخێك،دەبوایە بەم شاخەدا بڕۆین، ئەم شاخە وەکو دیوارێکی

داتاشراوبوو، له ناوەراستی دا وەكو بەدەست دروست كرابی، پارچە شاخێكی تەسكی له ناودا دەرچوو بوو تەنیا جێگای ئەوە دەبوو كە پێی لەسەر دابنێ، دەبوایە دەست بە شاخەكە وەبگری، بەم شێوەیە وورده وورده بڕۆی تا دەرباز دەبی، ئەم مەسافەیە لە ( ١٠٠) مەتر كەمتر نەبوو٠ نازانم چۆن هەموومان دەربازبووین ، تەنیا دایكی جۆزیف نەبێ كە لەگەڵ مان بوو، نەی دەتوانی بەسەر ئەم پەلە شاخە تەسكەدا بڕوات٠ بەڵام كوڕەكەی و هاوڕێ ئەبو وەسەن بەرپرسی گەریلا گوتیان ئێوە بڕۆن ئێمە دەیهێنین و دوای ماوەیەك هێنایان ٠ لە شاخەكە دابەزین بۆ دۆلەكە كە رووباری – هیزل – پێدا دەڕۆیشت ٠لەسەر رووبارەكە پردێكی لە داردروست كراو هەبوو، بەسەر ئەم دارانەدا پەڕینەوە، دیسان بە هەورازێكی سەخت سەركەوتینەوە٠ بەڵام زۆر درێژ نەبوو لەوێ بامان دایەوە بۆ گەلیێكی بچووك كە ئاوێكی كەمی پێدا دەڕۆیشت ئەو رۆژی تا ئێوارە لەم گەلیەدا ماینەوە٠

بەشەو دیسان كەوتینە رێگا، ئەو شەویش رێگاكە سەخت بوو، بەڵام كەمی لە رێگای شەوی پێشوو هەموارتربوو٠ بۆ بەرەبەیان دیسان خۆمان لە پەنایەك مات كرد، تا ئێوارە لەوێ بووین٠ ئێوارەكە وەكو پیشەمان كەوتینە رێگا، ئەوشەویش رێگای كەمیسەخت بوو٠ بەرەبەیان گەیشتینە ئەو بنكەیەی پێشمەرگەكانمان لە دۆڵێك دایاننا بوو، لە ناو خاكی كوردستانی توركیادا٠ ئەو رۆژەو شەوەكەی و رۆژی دوایی لەوێ لە پاش حەسانەوە٠ ئەنجا ئێوارەی رۆژی دووەم ، بەرێ كەوتین ئەو شەوەش هەر چەندە رێگاكەمان بەناوچیاوهەرەت بوو، بەڵام لە شەوەكانی پێشوو هەموارتربوو٠ بۆبەیانی لەسەر ئاوێك دا، لە تنیش گوندێكی بچووكدا ماینەوە، ئێوارەیەكی درەنگ بەسەر دەشتی بۆتان شۆڕ بووینەوە، لە بناری چیاكەدا هاوڕێیانی گەریلاكەمان، لە خانویەكی چۆڵ دا چوونەژوورەوە، لەو خانووەدا نۆ چوپی تراكتۆر و هەندێ پسكویتیان دەرهێنا، بسكویتەكەیان بەسەر دابەشكردین، چوپەكانیشیان هەلگرت٠ هەر لەوێ پێیان گوتین كەدەبێ زۆر ئاكامن لە خۆمان بێت چونكە لەم دەشتە زۆر جار جەندرمەی‌تورك بۆسەدادەنێنەوە٠ دوای رۆیشتن

مەسافەیەکی زۆر گەیشتینە ئەو بۆرِیەی کە نەوتی عێراق بۆ تورکیا دەگواستەوە، بۆریەکی زۆر ئەستور بوو، هەروەها لەسەر زەوی دایان نابوو. بەسەر بۆرِیەکە پەرِینەوە، لێرە لەیەکێ لەو جێگا مەترسیدارەکان دەربازبووین بەرەو شەقامی نێودەوڵەتیدا رۆیشتین دوای نیوە شەو گەیشتینە ئاوێك و پەرِینەوە، ئیتر گەیشتینە شەقامی نێودەوڵەتیدا، کە کەل وپەلی لە بەندەرەکانی تورکیا بۆ عێراق دەگواستەوە، بەم نیوە شەوە، لۆری بارهەلگر بە خێرایی رەت دەبوون. ئێمە لە نزیك شەقامەکەدا، خۆمان دابووە بە زەوی دا بۆ ئەوەی شوفێری لۆریەکان نەمان بینن. لەم شەقامە کە لۆریەکان کەم دەبوون ٤ — ٥ کەس بازمان دەدا دەپەرِینەوە باش بوو لەوێش بێگیروگرفت دەرباز بووین، بەرو شەقامی قیرتاو نەکراو(ترابی) لەوێش بەسەلامەتی دەرباز بووین بەرەو دۆڵی روباری دجلە شۆربووینەوە. لەسەر رووبارەکە چوپەکانیان دەرهێناوپفیان دان، جاری یەکەم نەخۆش و ئافرەتەکانیان پەراندەوە، بۆ جاریدووەم ئێمەی مابووین بەسواری چوپەکان پەرِینەوە، کە هەندە مەلە وان پاڵیان پێوە دەنان پەرینەوە گەیشتینە خاکی سوریا و لەمەترسی دەرچووین، بەلاّم جلەکانمان هەمووی تەربوون و بەرەبەیانیش بوو سەرمابوو. ماوەیەك لەو شوێنە ماینەوە، تا هاورِێیانی گەریلا تراکتۆرێکیان هێنا و هەموومان کە شەست کەس زیاتر بووین ، سواری عەرەبانەی تراکتۆرەکە بووین تا ئێمەیان گەیاندە گوندێکی سوریا، کەدیار بووهەندێ ماڵی گەریلا کوردەکانی تورکیایلێبوو، لەوێ ئێمە یان لە چەند ماڵێك داناو سبەینە داهات نانی بەیانیان داینێ ئەنجا — تەلەفۆنیان — بۆ قامشلی کرددوای ماوەیەك هاورێ جلال دباغ هات ئۆتۆمبێلێکی گەورەو پیکابێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، هەموومان سواری ئۆتۆمبیل و پیکابەکە بووین، بۆ قامشلی لەوێ ئێمەیان لە دوو ماڵ دانا، ئەمەلە رۆژی ٧ئەیلولی ١٩٨٣ دا بوو. نزیکەی مانگێك لە قامشلی ماینەوە، تا هەویکیان لە — بەرەی دیموکراتی فەلەستینی — الجبهة الديمقراطية الفلسطينية — بۆ هێنایین ئەنجا لە ٢٠/ ئەیلولی /١٩٨٣ دا ٠ منیان لەگەڵ غنی باووریان و حمدامین سراجی رەوانەی دمشق پایتەختی سوریا کرد،

لەوێش نزیکەی مانگێك مامەوەو هەندێکاری حزبیمان پێ بەرێوەبردین، تا ۱۹۸۳/۱۰/۲۸ کە ڕەزامەندی یەکێتی شورەویم بۆ هات، کەبۆ دەورەی حزبی بچم بۆ مۆسکۆ. من مۆسکۆم دیتبوو، لە ساڵی ۱۹۷۷ ی سەردەمی بەرەمان لەگەڵ بەعس بۆ دەوردیکی دوو مانگی چووبووم بۆ ئەوێ. بەهاوینان بۆ مامۆستا حزبییەکان دەکرایەوە. بەڵام دەوردەکەی ئەمجارە بۆ ساڵێك بوو ٠ل/ حزبە دەردەوبڕیاری دا کە بکرێتە دوو ساڵ لەبەر ئەوەی هەمووان پ٠م بوین زۆر ئازارمان کێشا دوو شەو دوو ڕۆژ لە شوێنێ دایانام کەلەدەرەوەی مۆسکۆیە و پێی دەڵێن( داچە) یانی شوێنی حەسانەوە، دواتر بردیانم بۆ قوتابخانەی حزبی. من درەنگ گەیشتم هەندێ هاوڕێ دوو مانگ پێش من گەیشتبوون، دەستیان بو خوێند کردبوو. پرۆگرامەکان بریتی بوو لەم وانانە ( ئابووری سیاسی ، فەلسەفە) بزافی شیوعی ، تاقی کردنەوەی حزبی شیوعی سۆڤیەتی، لە بورای کارکردن ل ناوجەماوەردا.

وانەکان زۆربەیان بە زمانی عەرەبی دەگوترانەوە، چونکە مامۆستا کان زۆریان عەرەبیان دەزانی، ژمارەیەکی کەم نەبێ کەبەروسی دەرسیان دەگوتەوە بە ڕێگای گۆرەر – مترجم – شێوازی گوتنەوەی دەرسەکان، شێوازی زانکۆیی بوو، مامۆستا بۆوانەی داهاتوو کۆمەڵێ سەرچاوەی دەدا، دەبوایە ئێمەی قوتابی تەماشای ئەوسەرچاوانەبکەین، بەپێی توانای خۆمان هەندێ تێبینی لە بارەوە بنووسین، ڕۆژی دوای مامۆستا پرسیاری لێ دەکردین، دەبووبە دیالۆگ لە پولەکەدا ، ئەگەر مامۆستا هەستی بکردایە لەم دیالۆگە هەندێ زانستی مافی خۆی پێنەدراوەخۆیلە دواییدا بۆی شیدەکردینەوە. گروپەکەی ئێمە بچووك بوو بەڵام زۆرینەی هاوڕێیان بەرێك وپێکی بە دوای دەورو وانەکانیان دەچوونەوە. هاوڕێیەکی ل٠م حزبی سوریا مان لەگەڵ بوو، لە هەمووان تەمبەڵتر بوو.

ساڵی یەکەممان بەم شێوەیە بردە سەر لەو وانانەی کە تەواو بوون تاقیان کردینەوە، کە دووو وانەی سەرەکی بوون. (بزافی شیوعی و تاقی کردنەوە) بەڵام ئابووری سیاسی و فەلسەفە بۆ ساڵی دوەمیش مابوو. پشووی هاوین ۱/۷/تا ۱/۹ بوو، لە

هاویندا ئەوەی داواگردبا رۆژێ لەدەرەوەی مۆسکۆ کاریان پێدەکردین لە گروپە عەرەبیەکان تەنیا ئێمەی عێراقی و یەمەنی بەشداریمانکرد ئێمە سێ کەس بووین.
من و خوشکێك بەناوی تەنیا و هاورێکی خەڵکی بەسرا بە ناوی - حسین – گروپی یەمەنی کە زۆر گەورەبوو تەنیا دوو هاورێیان بەشداری کرد، کرێ ئیشەکە بۆ حزب بوو هەموو گروپی عێراق و یەمەن منیان کردە بەرپرسی خۆیان لەمەشق یەك دوو جار تووشی سەر ئێشە بووم بە هۆی هەندێ کرداری برا یەمەنیەکان ، بەرپرسی گروپەکان مامۆستایەکی بە تەمەن بوو زۆر رێزی بۆ من هەبوو ، ئەگینا هەردوو هاورێ یەمەنیەکەی رۆژدوایی دەناردەوەبۆ مۆسکۆلەوانە بوو لەوێش دەریان بکەن.
لە زستانی ١٩٨٤ – ١٩٨٥ چووم بۆ سەنەتۆری ( مصح) کە دکتۆر شوێنەکەت بۆ دەست نیشان دەکات. منیان رەوانەی باکوری قەفقاس کردو(٢٦) رۆژ لێ بووم، بۆ ئەم ماوەدرێژە تەنیا – ٥٢ – رۆبلیان لێ وەرگرتم لەگەڵ کرێی فرۆکە لە مۆسکۆوە بۆ باکوری قەفقاس. ئەگەر ئەو خزمەتەی منیان کرد لە وڵاتێکی سەرمایە داری بوایە دەهەزار دۆلاری دەویست هەر رۆژ نا رۆژێك دەیان بردم بۆ لای دکتۆر کە هەموو کیانی سەیر دەکردم، و هەموو رۆژێ دەیان بردم بۆ گەرماو کە دوو جۆر بوو، هەروەها نیوسەعات وەرزشیان پێدەکردم، نیو سەعات پشتیان دەشێلام، ئەمە وێرای چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانم وەکو پشت ئێشەکەو ئازاری قۆلۆن، بۆ نان خواردنیش چێشتخانە هەبوو، خواردنیان بۆ دادەنایین هەر کەس لە شوێنی خۆی دادەنیشت لەسەر مێزەکی چوار نەفەری، رۆژێکیان ئەو کچە خواردنی بۆ دەهێنایین، هات قاپەکانی لابرد و پێی گوتم با هەندێ گۆشتی ترت بۆ بێنم، گوتم نامەوێ تێرم خواردوەو ژن ومێردێك لەسەر مێزەکەدا لەگەڵم بوون، ژنەکە گوتی ئە بۆ لێناگەرای گۆشتت بۆ بهێننەوە. منیش گوتم لەوڵاتی خۆمان من پارتیزانم بە مانگێك ئەوەندە گۆشتە ناخۆم گوتی بۆ چ گەلەکەتان یارمەتیتان نادەن. گوتم چۆن یارمەتیمان نادەن؟ بەڵام ناتوانن هەموو رۆژێ گۆشتمان بۆ دابین بکەن. پیاوەکەی لێی هاتە

قسه و پێی گوت بۆچی پارتیزانەکانمانی خۆمان لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم هەمووڕۆژێ گۆشتیان دەخواد؟ ئیتر ژنەکە کۆتایی بەم بابەتە هێنا٠

هەر لەوێ لە سەنەتوریدا، جێگری بەرپرسی ئایینی ئیسلامم دیت کەناوی ( الله شوکر) بوو، ئەم زانای ئایینیە شیعە بوو، زمانی عەرەبی چاك دەزانی، زوو بوودبرادەرم و کارتکەی خۆی دامێ گوتی هەر کاتێ ئیشت بەمن هەبوو، تەلەفۆنم بۆ بکە٠

لە دوو ساڵ ئێمەیان دووجار بۆ سەردانی بۆ شوێنە مێژووییەکان برد، ساڵی یەکەم بۆ بلاروسیا – روسیای سپی – کە کۆمارێك بوو لە کۆمارەکانی یەکێتی شورەوەی، لەوێ ئێمەیان برد بۆ دارستانە چڕەکانی ئەم کۆمارە کە پارتیزانەکانی شورەوەی لە ناو ئەم دارستاتنەدا ، خۆیان حەشار دابوو، بۆ هێرش بردنە سەر هێزەکانی ئەڵمانیای هیتلەری کە ئەو کۆمارەیان داگیر کردبوو٠ لەوێ گوندێکیان پیشان داین کە هیتلەریەکان، لە رقی پارتیزانەکان رۆژێکی دەچنە سەریان بە بیانووی ئەوەی کە خەلکی ئەم گوندە یارمەتی پارتیزانەکان دەدەن، هەموو خەلکی گوندەکەیان لە کەنیسەی کۆکردبۆوە و چەکداریان لە دەوروبەر دانابوو، ئینجا ئاگریان بەردابوە کەنیسەکەو ئەوەی توانیبوشی لە ناو کەنیسەکە رابکا، چەگدارەکان تەقەیان لێ کرد بوو کوشتبویان، لەناویان دا جوتیارێکی باڵابەرز توانی بووی رابکا، نەوەکەی خۆشی خستبووە سەر شانی، بەڵام چەکدارەکانی دەرەوە تەقەیان لێکردبوو خۆی و نەوەکەیان کوشت بوو٠

ساڵی دووەمیش ئێمەیان برد بۆ( قەڵای بریت) کە لەکاتی جەنگی یەکەم دا،(لینینی) بلیمەت رێکەوتنی روسیاو ئەڵمانیای لەوێ موافقەت لەسەر کردبوو٠ هەوەها سوپای ئەلمانیای تازەی لە حوزەیرانی ساڵی / ١٩٤١ دا، لەم خاڵەوە هێرشی هێنا بۆ سەر یەکێتی شورەویدا٠ ئەم قەڵایە بریتی بوو لەکۆمەڵە بینایەك کە بەتالیۆنی سوپای سوری لێ جێگیربوو٠ ئەم بەتالیۆنەی سوپای سور، زۆر ئازایانە داکۆکیان لەو وولاتەکەی خۆیان کرد تاماوەیەکی باش هێرشکەیهیتلەرەکانیان

راگرت، بەڵام لەبەر ئەوەیسوپای هیتلەری گەلێك لەوان بەهێز تربوون، لە رووی ژمارەوز جۆری چەکەکانیان، ئەم لەشکرە داگیرکەرەتوانی قەڵاکە داگیر بکات٠
هەروەها دوو جار ئێمەیان برد بۆ شاری (لینین گراد) کە رژێمی ئێستای روسیا ناوەکۆنەکەیان بۆ گەڕاندۆتەوە کردویانە بە شاری( پترۆگراد) کە ناوی یەکێ لە قەلاکانی روس بووە٠ (لینین گراد) شارێکی گەورەو دلگیرە زۆری لە پاشماوە کۆنەکانی روسیای تزاری لێماوە، بەتایبەتی تەلاری زستانە کە زوو لەلایەن شۆڕشگێرەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ئازادکراو، لینینی دەوڵەتی کرێکاران – جوتیاران – سەربازەکانی لەوێ داناو لە ماوەیەکی زۆر کورت٠ نووسەرو رۆژنامەنووسی ئەمریکی( جۆن رید) لەبارەی ئەم شۆڕشەمەزنە پەرتوکی بەناوی ( دەرۆژەکەی دونیای هەژاند)نوسیوە کە شایانی ئەوەیە بخوێندرێتەوە٠ لەو شوێنە گرنگانەیان پیشانیان داین گۆڕستانە بە کۆمەڵکە بوو، کە بە هەزاران قوربانی ئەم شارە خۆڕاگرەی لە قوربانیەکانی ئابلۆقە سێ ساڵیەکەی هیتلەریەکانی لێی نێژراوە، هەروەها لە دەروازەکانی ئەم شارە، کە سەربازو خۆبەخت کەرەکانی لەوێ داکۆکیان لە شارەکردوە، لەم دەروازەیە ناوی هەزاران هەزارلە دۆکۆکی کەران هەریەکە لەسەر پارچە تەختەیەکیبچووك نوسراوە، کەلەم دەروازەیە شەهید کران بەراستی ئەو داکۆکیە ئازایانەی جەماوەری لینین گرادلە لەشکرکەی خۆیان کردوە ٠نموونەیەکی دەگمەنە بۆ بەرانگاربوونەوەی دوژمنێکی بەتواناو دڕندەی وەکو سوپای داگیرکەرەکەی هیتلەر٠ یەکێکی تر لە شوێنە لەبیرنەکراوەکانی ساری ( لینین گراد) متحفی – شوێنی وێنە لێدانان – ئارمیتاجە کەبینایەکی گەورەویەو بەسەدان ژووری تێدایە لەم ژووانەدا بە هەزاران وێنەی هونەری زۆر نایابی هەڵەواسراوە، ئێمەیان بۆ ماوەیدوو کاتژمێر بردە ئەم ئەنتیکەخانە، بەڵام بەڕاکردنیش نەمان توانی هەموو ژوورەکان ببینین، ئەگەر بتەوەێ ئەم ئەنتیکەخانەیە بە چاکی ببیبنی هەفتەیەکت دەوێلە سبەینێ تا ئێوارد سەیری هەموو ژووردکان بکەی بە

دیقەتــەوە ســەیری وێنــەکان بکــەی، کــە هونەرمەنــدە بەناوبانگـەکانی دونیـا ئـەم وێنەیان دروست کردووە٠

شاری مۆسکۆش شوێنی زۆر نایابی تێدایە، لە پێش هەمووانـدا قـەلای کـرملین کـە مەڵبەندی دەوڵەتی شورەوەی بوو، ئێستاش هـەر مەڵبەنـدی حکومەتـە، ئـەم قەلایـە گەورەیە بەسەر گۆڕەپانی سووردا دەڕوانێ، ئەم گۆڕەپانە لەسەر شۆڕشگێڕیەتی نـاو نەنراوە بە سوور بـەڵکو لەبـەر جـوانی، ئارامگـای (لینینـی ) لـەم گۆڕەپانـە دروست کراوە٠ کە بریتیـە لـە خـانوەکی بچووك و لاشـە تـەحنیت کراوەکـەی لـەژووری ئـەم خانوە دارنراوە لەسەر شوێنی تەختی بـەرز دەڵێـی خـەوی لێ کـەوتووە ، بـۆ چـوونە دیداری دەبێ بە چەند پلیکانێك دابەزی نیمچە سوڕانەوەیەك بـە دەوری دا بکـەی ئەنجا لە دەرگای دووەم بێتە دەرەوە، لەبەر ئاپۆڕای جەماوەر نامتوانی ساتێ بوەستی سەیری بکەی، ئەم سەردانانەی جەماوەر بۆ سەر گۆڕەکەی، کەلەسەردەمی شـورەوەی هەمیشە بەرێز جەماوەر بەژن و پیاو ومنداڵ و پەککەوتە لە ئاپۆڕایەکی کـەم وێنـە دا، رۆژانـە سـەردانان دەکـردو ئێـستا هـەر وایـە رژێمـی ئێـستای روسـیالەدژی بـیرو بۆچوونەکانی (لینینی بلیمەت)ـە زۆر جار ویستوویەتی ئەم ئارامگەیـە بگوازێتـەوە، بەلام لە ترسی جەماوەر نەیتوانیوە ئەم کارە ناپەسەندە بکات٠

یـەکێکی تـر لـە شـوێنە دەگمەنـەکانی مۆسـکۆ- پانۆرامـە – کـە بریتیـە لـە وێنـەی ئابلوقەدانی مۆسکۆ لەسەر دەمی ناپلیۆن، کە سوپاکەی گەیشتە دەوروبـەری مۆسـکۆ، بەلام پێی دانەگیرا، دەڵێن وێنەکیشە کە چەند ساڵ خەریکی بـووە، تـا ئـەم شاکارەی دروست کردووە٠ بێجگەلەمانەش مۆسـکۆ زۆر بـاخی گـەورە گەورەیلێیـە خـەلك بـە زستان و هاوین زۆر روو لەم باخانە بۆ کات بردنە سەر، بەناونانگ ترین باخ بـاخی رۆشنبیریە (پارك تۆری) کە باخێکی گەورەیە زۆر شوێنی رابواردنی لێیە، باخی وای تێدایـە بـە رۆژ تـرس دەدگـرێ کەلـە ناویـدا پیاسـە بکـەی، لەبـەر گـەوریی و چـڕی دارستانەکەی٠

بەداخەوە دوو ساڵەکەی زوو تەواو بوو لە ٥ /٧ / ١٩٨٥ دا گەڕاینەوە بۆ شام، لەوێش پتر لە دوو مانگ ماینەوەو ، لە ٢٥ / ٩ / ١٩٨٥ دا بە فڕۆکە هاتینەوە تاران، بەرێکەوت ئەو ڕۆژە عاشوورا بوو یا ٩ / مانگی محرەمی عەرەبی، کە ڕۆژی دوایی (عاشوورا) یە زۆر پیرۆزە لەلای شیعە مەزهەبەکان. بۆیە لە فڕۆکەخانەی تاران زۆر ئازاریان داین، دوا یان خستین جاتاکانیان زۆر بە ووردی پشکنین، لە کۆتایشدا سێ هاوڕێیان گل داینەوە نزیک ٢ – ٤ مانگ زیندانیان کردن . لەکاتی پەساپۆرت دانەوەش تەنیا پاسەپۆرتی منیان دایەوە چونکە ووتیان ئەوانی دیکە هەمووی ساختەکاری تێدا کراوە. دوای مانەوەی یەك دوو هەفتە برادەرانی سۆسیالیست وەرەقەی چوون بۆ شنۆیان بۆ کردین و، هاتینە شاری شنۆ لەوێ سوکە بارەگایەکمان هەبوو، ٢ – ٤ ڕۆژ لە وێماینەوەتا جلی کوردیان بۆ دروست کردین، بە ڕێگای (کێلەشێن) کەسەرچیایەکی زۆربەرزەو کێلی سنووری عێراق – ئێرانی لێیە و پێی دەڵێن – کێلە شین – بە ڕێکەوت پێش ئێمە هـ- عزیز بە هەمان ڕێگا هاتبوو بۆ خرینە کە بارەگای کاك مسعود لەوێ بوو ، ئەو و چەند هاوڕێیەك لەوێ مانەوە. بەڵام ئەمەیان برد بۆ - لۆلان – کە جاران گوندی شێخ ڕەشیدی شێخی برادۆستەکان بوو، ئەو کاتە بارەگای لقی دووی پارتی لێ بوو. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە، بۆ سبەینێ ئۆتۆمبێلێکیان بۆ هێناین و هاوڕێ عزیزیش لەگەڵمان هات تا مەسافەیەکی باش بە سواری ئۆتۆمبێل هاتین. لەو ناوە تۆپخانەی ئێران دامەزرابوو، لەگەڵ تۆپخانەی عێراقی وابزانم کەلە سەر چیای پیران بوو شەڕەتۆپیان بوو. ئێمە لە نزیکی ئەو شوێنە بە چیایەکە هەڵگەڕاین، بۆ نیوەڕۆگەیشتینە سەرچیاکە، کەبنکەیەکی ئێمەی لێ بوو، هاوڕێ ئەبو دونیا بەرپرسی ئەم بنکەیە بوو دیارە زانیبوویان هـ- عزیز ئێمە دەگەینەلایان، نانی نیوەڕۆیان بۆ ئامادەکردین، دوای حەسانەوەیەکی باش بەرەو ناوچەی – خواکورك – کە بریتیە لە چەند گوندێکی برادۆستەکان و، دەکەوێتە سێ گۆشەی عێراق – ئێران – تورکیا، گوندەکانی زۆر خۆش بوو پڕ باخ و بێستانن. بەڵام ئەو کاتە

لەلایەن رژێمی بەغداوەگواستـرابوونەوە دوای دوو سێ رۆژ مـن و چـەند هاورێیـەکی تریان ناردمبنکەیەکی تر، کە دەکەوتە پێش چیای - ئاودەل کێو – کە شاخێکی زۆر بەرزەگوندەکـە ووشـەکە رەقـەبوو، چـیای پیرانـی ناوچـەی مێرگەسـووردەکەوێتە بەرامبـەرمان. بـەڵام زۆر دوور بـوو لێمـان. دیـاربوو حـزب خـۆی بـۆ کـۆنگرە ئامادەدەکرد. ناوە ناوە هەندێ هاورێ لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەهاتن. دوو سێ رۆژیش پێش بەستنی کۆنگرد. من هاورێ حەمە سعیدیـشمان بـانگ کـردەوە بـۆ ناوچەی خواکورک. هـ حەمەسعید پێش من لەو بنکەیە بوو.

کـۆنگرەی چـوارەم لـە گونـدێکی ناوچـەی خوارکـورك، لـە ۱۰ /۱۱/ ۱۹۸۵/ دەسـتی بـە کارەکـانی خـۆی کـرد، دانیـشتنەکانی کـۆنگرە بـە شـەو لـە ژێـر خیـوەتێکی گـەورە دا دەبەستر،الە ترسی ئەوەی نەوەك رژێـم کـۆنگرە لـەم گونـدەدا بەسـتراوەدو بـە فرۆکـە هێرشمـان بباتـە سـەر. بابەتـەکانی کـۆنگرە بریتـی بـوون لـە ( راپـۆرتی سیاسـی ، راپـۆرتی رێکخستن، راپـۆرتی لەسـەر تـاقی کردنـەوەی بـەرەی نیـشتمانی پێـشکەوتن خـواز) زۆری گفـت و گۆکـان لەسـەر بابـەتی دوایـی کـران. مـن لـەو راپۆرتەکـە لـە کـۆنگرەدا خوێندمـەوە، زۆر لەسـەر بـەرە قـسەم کردبـە هەڵەیـەکی گـەورەی سەرکردایەتیم خستە روو، بۆ هاوکاری بەستنی ئەم بەرەیە پێم وابوو، ئـەم بەرەیـە ئابروو بەرەی یەکێك بـوو لـە هەڵەکانی سـەرکردایەتی دوای شـەهید بـوونی هـاورێ سلام عادلی شۆرشگێر و جمال حیدری نەمر. تـاقمێکی راسـتڕەو دەسـتیان بەسـەر بـە سەرکردایەتی حزبدا گرتبوو. ئەم تاقمە هەمیشە ئامادەی مل کەچ کـردن بـوون. بـۆ دوژمنەکانی حزب، لە عبدالسلامی کۆنەپەرستی رەگەزپەرستەوە تـا بکـر و سـەدامی دکتـاتۆری خـوێن رێـژ و دژی دیموکراسـی و شـیوعیەت و هەرچـی خێرێکـی بـۆ جەماوەر تێدابێ. ئەم سەرکردایەتیە بەو هەنگاوەگەورەترین خزمەتیان بـە رژێمـی بەعس کرد. لەسەر گۆڕەپانی نیشتماندا. ئەو حزبەی بەقسەی ( علی صالح السعدی) بەشەمەندەفەرێکی ئەمریکی شۆڕشی جەواشەی لە دژی شۆڕشی ١٤ تەموز بەرپاکرد. هـیچ بیروبۆچـوونێکی شـیوعیانەی راسـتەقینە رازی نەبووسـەرکردایەتی حزبێکـی

شۆڕشگێڕی وەکوحزبی شیوعی عێراق، کەلەلایەن دۆست و دوژمن بە حزبێکی چاونەترس و سل نەکردنە لە قوربانی دان ناسرابوو، دەست بخاتە دەست حزبێکی وا دڕندە و نۆکەری ئیمپریالیزم دەست بخاتە دەست بکوژانی سلام عادل و جمال حیدری و عبەلی و نافع یونس وسەدان سەرکردەو کادیری لێهاتووی حزبە دێرینەکەمان. کە خەلکی زۆر سادەی گەلەکەمان دەیانزانی، بەرەی بەعس لەگەڵ حزبی ئێمە لە تاکتیك بەولاوەهیچی تر نییە زوو یا درەنگ لێمان هەڵدەگەڕێتەوەدو گەورەترین زیانمان پێدەگەیەنێ. ئەم بۆچوونەش١٠٠٪ راست دەرچوو، لەگەڵ ئەوەش سەرکردایەتی دوای چوار ساڵیش نەیانوێرا هەڵسەنگاندنێکی بابەتیان بۆ تاقیکردنەوە سەر نەکەوتووەکە بنووستەوە.

دەمەوێ گلەییەکی بابەتیانەش ئاراستەی پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق بکەم. کە هەر دوای مۆرکردنی پەیمانی بەرەکە، هێرشی نا رەوایان هێنایە سەر رێکخراوەکانمان لە کوردستاندا. کەمن دڵنیام ژمارەیەکی هەرەزۆری کادیرو ئەندامانی حزب لە کوردستاندا دژیئەم بەرەیە دەوەستانەوە، بواریان نەدا رێکخراوەکانمان بیربکەنەوەولە هەمان کاتدا ئەوانیش پشتیان بە دەوڵەتێکی کۆنەپەرستی وەك حکومەتی شاو ئیمپریالیزمی ئەمریکی بەست. کە ئەم لایەنە بەئاشکرایی خیانەتیان بە گەلی کورد و شۆڕشەکەی کردو، شۆڕش ماوەیەکی باش بلاوەی پێکرا و گەلی کوردستان دوو چاری بێئومێدی قووڵ بوون. حزبی بەعسی فەرمان رەواش تووشی لەخۆبایی بوونێکی گەورە بوو، وای بۆ دەچوو کە جارێکی تر ئەم گەلە توانای بەرپاکردنی شۆڕشی چەکداری نابێ.

کۆنگرە ٤ – ٥ رۆژی خایاند لەسەر داوای سەرکردایەتی بڕیاردرا کە ژمارەی ئەندامەکانی ك. ن کەم بکرێتەوە لە پاڵ ئەمەش هەر پێشنیاری یەرکردایەتی بڕیاردرا کەسەرکردایەتی بۆی هەبێ کە ١٠ ەك هاورێ بەرزبکاتەوە بۆ ك.ن گۆیا بۆ ئەوەی ئەمك هاورێینە بە نەناسر ێی بهێننەوە. بەلام دوای یەك دوو کۆبوونەوەی ك.ن ، هەرهەەوویان ئاشکرابوون و هەندێکیان بەراستی شایەستەی ئەم

پلە حزبیە بەرزە نەبوون٠ دوای کۆتای هاتنی کۆنگرەش، ك٠ن ئیش وکاری لە نێوان کادیرەکان دابەش کردەوە، بۆ نموونە ( ابو یوسف) کرا بە بەرپرسی کۆمیتەی هەرێم، کەهاوڕێیەکی عەرەب بوو کوردیشی نەدەزانی، وێرای ئەمەش هیچ باوەڕی بە مافی ڕدوای گەلی کوردستان نەبوو٠ لەم ئالو گۆڕەدا منیش کە پێشان سکرتێری ك٠محەلی هەولێربووم٠ بۆ ئەندامی کەرتی هەولێری پێشمەرگایەتی گوازرامەوە٠ کە ئەو کات بارەگای لەگەلی خەلەکدابوو، کە نزیك گوندی کافیەی سەر بە قەزای ئاکرێ بوو، کافیە گوندێکی بچووك بوو، هەردوو کوڕی خالی کاك مسعود( ڕەزا و شەمال) بەرپرسی ناوەچەکە بوون کە بریتی بوو لە ٧ – ٨ گوند هەروەها بەرپرسی لیژنەی پارتی بوون، لە قەزای ئاکرێ و شێخان دا پەیوەندیان لەگەل ئێمەدا زۆر باش بوو٠ ئێمە وەکو کەرتی هەولێر دوو سال لەم ناوچەیەدا ماینەوە، لەسەرتای سالی / ١٩٨٧ دا٠ ڕژێم هێرشیکی گەورەی کردە سەر بارەگای بەتالیۆنی یەکی بادینانی حزبمان وتوانی بارەگاکە داگیربکات٠ کە بارەگای کۆمیتەی هەرێمی کوردستانیش هەرلەوێ بوو٠ لەبەر ئەوەی کە بارەگای کەرتی هەولێر نزیك بوون، بەتالیون و کادیرەکان ك٠ هەرێم هاتن بۆ ناوچەی کافیە٠ چونکە ژمارەیەك خێزانی هاوڕێیانی بەتالونیان لەگەل دابوو زستان سەرما بوو داوامان لە خەلکی گوندی کافیە و بیرکەکۆر کرد، کە دالدەی ئەم خێزانانە بدەن، ئەوانیش زۆر جوامێرانە بەدەنگمانەوە هاتن جێگای ئەم خێزانانەیان کردەوە٠زۆر سوپاسیان دەکەم٠ بەلام دیاربوو ئەو هێزەی ڕژێم خەلکی نیشتمان پەروەریان لەگەل بارەگای بەتالیو و ك٠ هەرێمیان نەسوتاندبوو، بۆیە دوای ماوەیەك تر ... ان بگەڕێینەوە بۆ جێگای خۆیان٠ تەنیا م٠ هەرێم لەلای کەرتی هەولێر مانە...٠
لە سالی ١٩٨٦ کە گفت وگۆیەکەی ( ی٠ن٠ك) لەگەل ڕژێمی سەدام هەر ... چاوەڕێمان دەکردنەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك٠ هەول و تەقەلا بۆ ئاشت...ەوە لەگەل لایەنەکانی (بەرەی جود) دەستی پێکرد، دوای چەند سەردان و ...یکەوتن، هەموو لا ڕێك کەوتن، کە شەڕی ناوخۆ کۆتایی پێبهێنرێ وهێزەکانی بەرەی جود

بگەڕێنەوە ناوچەی سۆران و ڕێگاش بدرێ بەهێزی ( ی·ن·ك) بۆ هاتن بۆ ناوچەی بادینان، لەم ئاشت بوونەوەش كاك ئیدریس بارزانی ڕۆڵێكی باشی هەبوو· دوای ئەم ڕێكەوتنە بڕیاردرا هێزی پێشمەرگەی كەرتی هەولێریش بگەڕێیەوە ناوچەی سۆران· بەڵام من و چەند پێشمەرگەیەك نەمانویست بگەڕێنەوە ئەو ساڵە كە كۆتایی ساڵی ١٩٨٧ بگەرێینەوە بۆ ناوچەی سۆران. چونكەرژێم دوو سەنگەری لەوبەرو ئەو بەری زێی گەورە دان لە تەنیشت بواردكە، بۆ ئەوەی كەس نەتوانێ لەم بواردەدا بپەڕێتەوە، تەنیا ئەم بوارەش هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەوساڵە لە ناوچەی سەیدان ماینەوە دوای ئەوەی كە ئازارێكی زۆرمان دیت لەو گەشتەی كەلە ناوچەی سەیدان كردمان بۆنزیك زێی بادینان لە پشت چیای (كوریس) بۆ گوندی (گۆرمبیران) كە دەكەوێتە ناوچەی زێبارییەكانەوە كە زۆریان لە فەوجە سوكەكان بوون، تەنیا لەو گوندە نەبێ· كە دۆستێكمان لێی هەبوو، گوندەكەش بچووك بوو هەموویان مامی دۆستەكەمان بوون· دووشەو و ڕۆژێك لەم گوندە ماینەوە تا دۆستەكەمان ڕەوانەكرد بۆ سەر زێی بۆ قسە كردن لەگەڵ كەلەك وانەكەدا، كەلەك وانەكە خۆی هات بۆ لامان، بۆی ڕوونكردینەوە كە بە هیچ شێوەیەك ناتوانی بمانپەڕینیتەوە، بۆیە دوای نیوە شەو گەڕاینەوە هەشت ولاخ و هەشت بارمان پێ بوو، بارانێكی بە خوریش ئەباری چەند جاری بارانەكان دەكەوتن، دەبوایە سەر لەنوێ باردكان ببەستینەوە، ئەمە كاتێكی زۆری لێكوشتین، بۆ بەیانی لە چیایەكە دابەزین لە دوو لەكە نانی بەیانیمان خوارد، لەبەر بارانێكی زۆر بە تەوژم· بەڵام هێشتا چیایەكی ترمان لەبەر دەم مابوو، بۆ گەیشتنەوەمان بۆ بنكەی خۆمان لە گوندی (ئیروان) بارانەكەش هەتا دەهات توندتر دەبوو، بۆیە ڕێگا پیشاندەرەكەمكان بەهەڵە بەرێگایەكی تردا بردینی· ئەوەش وای كرد كە شەومان بەسەردا هات، سەرماوبارانیش شپرزەی كردین، لەبەرئەمە درەنگی شەو لەگەڵی(كولیت) چوینە ئەشكەوتێك. كە خاوەن مەڕ ومالاتێكی لێ بوو شەو لەوێ ماینەوە تا بەیانی ڕۆیشتین· لە گوندێكی سەر ڕێگا تا دوای نیوەڕۆ ماینەوە، ئینجا گەڕاینەوە بۆ كونە

یارمەتیان داین· بەم شێوەیە گەڕانەوەمان بۆ ناوچەی سەیدان لە گەشتەکەمان بۆ سۆران سەرکەوتوو نەبووین· گرفتی ئازوقە پەیداکردنما هاتە پێشەوە· لێرە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە رۆلی (ئەسوەد مەنتك) بکەم کە لە پ٠م بوو لەلامان هەروەها د٠کەلەگەڵماندا بوو لەو گەشتە و هاوڕێیەکی خەلکی بەغدا کە ناوەکەیم لەبیرنەماوەبکەم چونکە رۆڵێکی باشیان هەبوو لەم گەشتەدا·

بۆ پەیداکردنی ئازوقەش خەلکی گوندەکانی دەوروبەرمان کە چەند گوندێکەی بچکۆلە بوون و بریتی بوون لەو ماڵە بارزانیانەی لە پەلامارەکانی رژێم بۆ قوشتەپەو هەولێر رزگار ببوون چونکە پەیوەندیمان لەگەڵیان دا باش بوو· هەروەها خەلکی گوندەکانی سورچیان لەو بەری - زێی گەورە — وەکو خەلکی گوندی ماویلیان و گوندەکانی تری دەوروبەری کەبە خێرایی ئازووقەیان بۆ پەیدا کردین و ئەو زستانە لەوێ ماینەوە، کە زستانێکی زۆر سەخت بوو، بەلام جێگای ئێمە نەختی گەرم بوو داری سوتاندمان لێ نزیك بوو· پەیوەندیمان هەبوو لەگەڵم· هەرێم و کەرتی بادینان، بۆ ناوچەی سۆرانیش بە رێگای بروسکەوە دۆستێکمان لە مێرگەسۆر هەبوو هەموو جارێ پۆستەمان بە دەستی ئەو دەنارد·چونکە هێزی پێشمەرگەمان هەموو لە دۆڵی بالیسان بوو، هـ — ابو ربیعیش کەئەندامی کەرت بوو لەوێ بوو، بە هاوڕێ - ابو سیروان — کە بەرپرسی کەرت بوو نێردرابوو بۆ ئێران بۆ عیلاج چونکە بەر لە پەلامارە کیمیاویەکە کە رژێم بارەگگای ئەو کەرتەی کەلە ناوچەی بادینان بوو، لە ٥ / ٦ /١٩٨٧ بە چەکی کیمیاوی بۆردوومانی کرد و ، دوو کادیری ئازامان لەوپەلاماردانە شەهید بوون،و ژمارەیەکی زۆریش برینداربوون کە پێویست بوو هەندێکیان بۆ عیلاج رەوانەی ئێران بکەین·

ئەبو سیروانیش یەکێك بوو لەوانەی رەوانەی ئێران کرابوو· بەتەمابووین لە بەهاردا بڕۆین بۆ ناوچەی خۆشناوەتی کە بارەگای کەرتی هەولێر لەوێ بوو· بەلام لەبەر بەرزبوونەوەی ئاستی زێی گەورە بڕیارماندا لە ناوەراستی هاوین بڕۆین کە نەختێ ئاستی زێیەکە نزم دەبێتەوە·

ئەوەبوو لەم ساڵەدا٠ شاری هەڵەبجە بەچەکی کیمیاوی بۆردوومان کرا ئەو کارەساتە گەورەیە بەسەر گەلەکەماندا هات کە رژێم ناوی لێنابوو ( ئەنفال)لەو پەلامارە پێنج هەزار کەس شەهید بوون دە هەزار کەسیش بریندار بوون، هەموو خەڵکی ئەم شارە شەهید کرا و دەوروبەری رایان کرد و پەنایان بۆ ئێران بردو لەوێ بریندارەکان تیمار کران. بەڵام هەنێکیان تا ئێستاش لەو نەخۆشخانەیە رزگاریان نەبوودکە بە هۆی کیمیابارانەکە تووشی ئەم نەخۆشیە هاتوون شایانی باسە کەبەهاری ساڵی پێشووش / ١٩٨٧ دۆڵی خۆشناوەتی بەتایبەتی گوندی (شێخ وەسان) بەهەمان چەك بۆردومان کراو، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بالیسان شەهید و برینداربوون، خەستەخانەکانی هەولێر لە ترسی رژێم کەبەردەوام چاودێری ئەم نەخۆشخانەیان دەکردو کارگێری خەستەخانەکەودکتۆرەکانیان ئاگادار کردبۆوەکە ئەم نەخۆشانەی عیلاج نەکەن، دوای چەند رۆژێکیش هەموویان هێنان و لە ناوچەی ( خەلیفان) بەرەڵایان کردنو پێیان راگەیاندن کە بگەرێنەوە گوندەکانی خۆیان٠ شایانی باسە کە داواویان لەم نەخۆشانە دەکرد کە بلێن، ئێمە بە بۆم بارانی ئێران بریندارببووین، بەڵام نەخۆشەکان ئەوەیان رەت دەکردەوە٠ دوای کەس و کاری بریندارەکان ناچاربوون هەندێکیان کە برینەکانیان کاریگەربوون، بیان بەنە ئێران-لە راستیدا کۆماری ئیسلامی ئێران رۆڵێکی باشیان هەبوو لە تیمارکردنی بریندارەکانی بۆردومانی کیمیاوی دا٠ شایانی باسە هەمان ساڵلە ٥ / ٦ /١٩٨٧ بارەگای بادینانی کەرتی پێشەرگەیان، بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کرد، ئەمە هەمان رۆژە کە رژێمی ئیسرائیلی فرۆکە خانەی میسری لە ساڵی / ١٩٦٧ بۆمبا باران کرد و، زۆربەی فرۆکە جەنگیەکانی ئەم وولاتە عەرەبییەی لەناو برد٠ لەسەر ئەم کیمیا بارانەی کەرتی بادینان شتی تریش لە پێشەوەدا نووسراوە٠

لە پێشدا باسی گەرانەی دوا گەرێلامان، لە ناوچەی سەیدان کردبۆ ناوچەی خۆشناوەتی، کە بریاربوو لەناوەراستی هاوین ئەنجام بدەین٠ بەڵام پێش ئەو کاتە لە سەرکردایەت حزبەوە داوایان لێم کرد کە بچمە لایان لەناوچەی خواکورك٠ باش

بوو لەو کاتە هەواڵمان پێگەیشت  کە رژێمی تورکیا رێگادەدا، ماوەی سێ سەعات بە خاکەکەی دا بڕۆین، لە گوندی زیتەوە بۆ گوندی ( دەریاسۆر) کە هەردوو گوند عێراقین، بەڵام لەنیوان هەردوو گوندەکە خاکی کوردستان تورکیا دەکەوێتە نێوایان، کەبەپیادە سێ سەعات رێگایە٠ ئێمەبەچەند رۆژێك لە ناوچەی سەیدان بە رێگای بارزاندا گەیشتینە گوندی زیتی، ئەم گونددکەمتر لە ١٠ کم لە سنووری تورکیاوە دوورە کەگەیشتینە ئەوێ بارەگایەکی حزب الله ی لێ بوو، دیارە رژێمی تورکیا بە رێگای ئەم حزبەوە رێگای دەدا، کە بە خاکی ئەوان دا بڕۆین بۆگوندی(دەریاسۆر) لەگەڵ ئێمە یەك دوو گەریلای پارتیش لەوێ بوون چاوەڕێی پەڕینەوە بوون بۆ دەریاسۆر گوندەکە چۆل بوو ، لە ترسی تۆپ بارانی هێزەکانی رژێز کە زۆر لە ناوچەکەدا نزیك ببوونەوە٠ نیوەڕۆ لەوێ حەساینەوەو نانی نیوەڕۆمان خوارد٠ بۆ ئێوارە بەرەو گوندی (کانیە رەش) بەڕێ کەوتین، کانیەرەش گوندیکی ناسراوی دەشتی – برازگرە کە دەشتێکی بچووکە سەر بە ناحیەی سیدەکانەوەیە  هەمیشە بنکەیەکی پۆلیسی لێبووە، لەکاتی یاخی بوونی خێلی برادۆست لە بەهاری / ١٩٥٩ دا ، نەختێ باسی ئەم گوندەم کردووە٠ شەوێ ماینەوە بۆ رۆژی دوایی بە( گەلی رەش) بەرەوناوچەی( خواکورك) بەرێ کەوتین، گەلی رەش دەکەوێتە رۆژئاوای چیای(ئاودەلکێوی) گەلێکی نەختێ سەختە، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە بارەگای م٠س ٠ لەوێ چەند رۆژێك ماینەوەو هاوڕێیان پێیان راگەیاندم، کەبچمەوە ناوچەی خۆشناوەتی بۆ سەرپەرشتی هێزی پێشمەرگەمان لەوێ٠دەبوایە بەرێگای ئێرانەوە بڕۆم بۆ ئەوەی ٠ هاوڕێ ئەبو ربیعیش لەوێ بوو بریادکەوابوو لەگەڵمدا بێت، بۆ ئەوەی دەورەو تەسلیمم لەگەل دا بکات ئەو رۆژەی هاتین بۆ گوندی شێخان کەئۆتۆمبێلەکانی ئێران دەهاتن بۆ گواستنەوەی ئەو کەسانەی دەرۆیشتن بۆ شاری – شنۆ - ، بەلام ئەم رۆژە تا ئێوەرایەکی درەنگ هیچ ئۆتۆمبێلێکی ئێران نەهاتن، لەبەر جەژن و لە ترسی تۆپ بارانی عێراقەوە، کە ناوە ناوە رێگاکەی بۆردومان دەکرد٠ دوای زەعیم علی و ملازم یونس هاتن جێبێك دوانیان پێبوو، بۆیە چوومە

لای زەعیم و داوام لێکرد کە ئەگەر جێبەکە بگەڕێتەوە بۆ شنۆ لەگەڵ خۆیدا بمان گەیەنێتە وە چونکە ئەمرۆ هیچ ئۆتۆمبێلی ئێرانی نەهاتووە موافەقەتی کرد• بە سواری جێبەکەی ئەو رۆیشتین بۆشنۆ رۆژێك لەوێ ماینەوە، رۆژی دوایی بە رێگای شاری خانە – پیرا شهر – دا بەردو ناچەی سنوری قەزای قەلادزێ کە بنکەی پێشمەرگەی ئەو قەزایەمان لەوێ بۆ رۆیشتین•

بەلام نەگەیشتنە ئەوی. ئەو شەوە لە گوندی ((ئەلۆدتان))ماینەوە لە مالی هاوری نوری، بۆ روژی دوایی چوین بو بنکەکە، کە لە چیای قەندیل بوو، چەند روژی لەوی ماینەوە تا گەریلایەك رێك خرا، بۆ ناوچەی خوشناوەتی کە بنکەی کەرتی هەولێری لێبو . لە ریگا چەند موفرەزیەکی پ.م دیت کە بەرەو سنوری ئیران دەرۆیشتن دیار بوو باشەکشەیان دەکرد.شەوێك هەر لە قەندیل ماینەوە، بۆ رۆژی دوایی گەیشتینە گوندی – فرناقاو – کە دەکەوێتە بناری قەندیل.بە درێژایی روژەکەلەوەی ماینەوە، چونکە دەبو بە شەو لە شەقامی (حافیز – کومتان) بپەرینەوە لەبەر ئەوەی هێزەکانی رژێم ئەو شەقامەیان داگیر کردبوو. بە شەو لەم شەقامە پەرینەوە بەردو چیایی (ماخوبزنان) رۆیشتین، دوای نیوە شەو گەیشتینە هوبەیەکی کوچەریان، شەو لەلای ئەوان ماینەوە. بەیانی بەرەو دۆلەرەقە کەوتینە ریگاو بۆ نیوەرۆ گەیشتینە ئەو جێگایەی کە چەند سەروچاوەیەکی ئاوی لێیەو لەوێ. ماینەوە چونکە لە دولەرەقەش شەقامێکی قیر تاوی لێیە. کە دەبی بەشەو لێی بپەرینەوە بەردو ناوچەی (مەلەکان) کە گوندێکی گەوردی ناوچەکەیە، ئەو رۆژە لەوێ حەساینەوە چونکە شەو نەحسابوینەوە، بۆ شەو چوین بۆ گوندی ((شیرێ)) سەرەوە کە گوندەکە وەکو چولکراو وابو، تەنیا (٤-٥) مالی لێی مابوەوە، چونکە رژێم چەند جارێك دولی بالیسانی بە چەکی کیمیاوی بوردومان کردبوو ماینەوە. دوای بەیانی بەردو بنکەی کەرتی هەولێر رۆیشتین. کە لە چیای هەوری بوو. دوای گەیشتنی ئێمە بە (٢-٤) رۆژ عیراق و ئێران بریاری ئاگر بەستیان لە نێوان خۆیان مۆر کرد. بەم شێوەیە عیراق دەستی بەتال دەبێ بۆ لێدانی پ.م،

هەروەکو چاوەڕێ دەکرا هەموو هێزە چەکدارەکانی خۆی لە بەرەکانی شەرەوە بەرەو کوردستان رەوانەکرد وخۆی بۆ هێرشێکی بەرفرەوان ئامادە دەکرد. ئێمە وەکو کەرتی هەولێر بریارمان دا، کە ئەگەر نەمان توانی ئەو هێرشەی رژێم بشکێنین، روبکەینەوە سەر سنوری ئێران لە ناوچەی خری ناوزەنگ. لەم بەینەدا کۆبونەودی لیژنەی هەولێری بەرەی کوردستانی رێك خرا. شایەنی باسە بەرەی کوردستانی لە (١٢/ ئایاری/ ١٩٨٨) لە نێوان، پارتی و یەکێتی و ل.هەرێمی کوردستانی حشع و سوسیالیست و زەحمەتکێشان و پاسۆك مۆرکرا و راگەیندرا لەم کۆبونەوەی ل.هەولێر بریار درا کە ئەگەر پاشەکشە کرا، دەبێ بە یەکەوە هێزەکانمان بەرەو سنوری پاشەکشە پێ بکەین. ئەو کاتە هێرشەکەی رژێم بۆ سەر ناوچەی – خوا کورك – دەستی پێکردبوو لە روبونەوەی هێرشەکە پارتی هێزیکی زوری ئامادەکرد بوو. ئیمە وەکو حزبی شوعیی بەشداریمان کرد لەروبەرو بونەوەکەدا وهاوکاریکمان بەناوی – مام علی – شەهید بوو کاك مسعود خۆی سەر پەرشتی رووبەروو بونەوەکەی دەکرد، بەلام لەبەر زوری هیزەکانی رژێم و بەکارهینانی توپی دوور هاوێژ و فرۆکەی جەنگی بەشێوەیەکی بەرفرەوان دوای چەند رۆژ هێزی پ.م ناچاری پاشەکشە بوو. سەرکردایەتی ئیمەش بەرەو ئیران پاشەکشەیان کرد. دوای شەرەکانی خوا کورك وەکو چاوەڕێ دەکرا، رژێم هێرشی بۆ سەر ناوچەی خۆشناوەتی دەست پێکرد. ئێمە دوو گەریلامان دەست نیشان کرد بوو، بۆ مانەوە لە ناوچەکەدا بۆ ئەوەی کوردستان بەیەك جاری چۆل نەکری لە پ.م دا. مەسەلەیەکی حاشا هەلنەگرە،کە (پ.م)ی ئێمە بە تەنیا لە توانایدا نەبو بەشێوەی پارتی زانی لە قولای کوردستاندا بمینێتەوە، بۆیە ئیمەش لەگەل لایەنەکانی دیکە پاشەکشێمان کرد. بەلام لە دولە رقەدا وەکو ئابلوقە، ئابلوقەدراین و ، دەرکەوت کە ناتوانین لە شەقامی (حافیز – کومتان) دەربچین، چونکە رژێم هێزیکی زۆری لەسەر ئەم شەقامەدا مۆل دابوو. بویە چەند رۆژێ لە دۆلەرەقە ماینەوە، هەموو دەوروبەرمان کرایە سەنگەری سوپای رژێم. بویە بریاردرا من و ه.حەمە سعید و

ڕەوەنـد بـەرێگای رانیـەوە بـچین بـۆ هـەولێر و ئـەو خێزانانـەی لەگەڵیشمان بـوون ڕەوانەی ناو شارەکانمان کردنەوە، هەر چۆنیکی بوو خومـان گەیانـدە رانیـە. چوینە مالی حاجی نادری باوکی شەهید علی، لەوێوە ئێمەیان برد بۆ (٢ – ٣) ماڵ و ئیمەش نامەمان نووسی بۆ ل.محلی هـەولێر کـە کێشەکەمان بـۆ رون کردنـەوە. دوای چـەند رۆژێ هوگر و شـوان هـاتن ئیمـەیان بـرد بـۆ هـەولێر، لـە هـەولێر نزیکـەی مانگێـك ماینەوە. چاوم بە ماڵەوەکەوت، لـە گەرانـەوەدم دا ئـارامی کوریـشم هـەر لەگـەل خـۆم برد، چونکە ئـەمنی هـەولێر زور فـشاریان خـستبوە سـەری. دیـسان ه.هـوگرو شـوان ئیمـە یـان بـرد بـۆ مالێـك لەسەنگەسـەر، بـۆ ئیـوارە هاوریـانی حزبـی دیمـوکراتی کوردستانی – ئیران هاتن ئیمەیان برد بۆ گوندی – بۆڵی – کە گوندیکی چولکراوی نزیکی سنوری ئیران وگوندی – قرناقاو – بوو. لەو کاتەدا بارەگای سـەرکردایەتی – حدکا – لەوێ بوو، ئیمە لەگەل کۆمەلێکی هاورێیانی خۆمـان و چـەند پ.م یـەکێتی نزیکـەی مانگێـك لـەوێ ماینـەوە، دوای ئیمـەیان لەگـەل گـەریلایکی خۆیـان گەیانـدە گونـدی ((سـونێ)) کـە بنکـە یـەکیان لەوێـدا هـەبوو، ئـەم گونـدە هەرچـەندە چـەند سـەنگەرێکی رژێـم لـەنزیکیوە بـوون، بـەلام سـەربازی حکومـەت نەدەهاتنـە نیـو گوندەکەوە، بازاری خـری نـاو زوەنگیش هـاتبوو بـۆ ئـەوی. ئیمـە بـۆ بـەیانی بـەرەو بنکەکانمان لە خری ناو زەنگ رۆیشتن. کەگەیشتینە ئەوێ دیار بوو بنکەکانمان رێك خرا بوون، چونکە هێزی پێشمەرگەمان دەمێـك بـوو گەیـشتبووە ئـەوێ. بەیارمـەتی برادەرانی حدکا لەو نیمچە ئابلوقەیە رزگاریان بوو، یارمەتیان دابـوون بـۆ گەیـشتنە خری ناوزەنگ. بریار وابوو کە ئێمە بە ناوی ل.محلی هەولێر کار بکەین. بویە خێرا نوسینگەیەکمان پێك هێنا لە من و ه.حمە سعید، دەستمان کرد بـەرێك خـستنەوەی پێـشمەرگەکان. لـەو ماوەیەشـدا کۆبونـەوەی ل. هـەرێم بەسـترا لـە دولـە کوگـا، ریگاکەبەگـەلی – ئالیـەرەش – سـەردەکەوی ریگاکـە زور سـەخت و نـاوخوش و هەڵـدێربوو. لـە کۆبونەوەکـە کەلـە لایـەن هـاورێ ئـەبو فـاروق .عمـر علـی شـیخ بەرێوەبرا، بە درێژی لە هـەل و مـەرجی کوردسـتان عیراقـی کۆڵیـەوە، دوای هێرشـی

بەد ناوی – ئەنفال – کە بوە هۆکاری پاشەکشەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوری ئێران،چونکە دوای شەری خواکورك و کلکەی قەندیل لەگەل پ.م یەکێتی، دەرکەوت ئەگەر هێزی رژێم تەنگەتاوکرا چەکی کیمیاوی بەکار دەهێنی. کۆبونەوە کە گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی، کە هەر چەند رژێمی دیکتاتۆری بەغدا سەر کەوتنیکی کاتی بەدەست هێنا، بەلام رژێم لە ژێر قورسایی ئەو گێرو گرفتانەی لە ئاکامی شەر لەگەل کۆماری ئیسلامی ئیران داهاتنەکایەوە، کە رژێمی بەغدا شەرەکەی هەلگیرساند کاریگەری خۆیان هەر دەبێ هەر چەندە ئەم پاشەکشەیە بۆ سەر سنورەکانی ئیران کاریگەریکی زوری هەبوو لە سەر هێزی پ.م، رژێمیش پەیتاپەیتا لێخۆش بوونی دەردەکرد بۆ ئەوەی پ.م کان خۆیان بدەن بەدەستەوە. بەلام دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی) رۆلێکی گەورەی گێرا بۆ بەرز کردنەوەی وەری هێزی پ.م هەر چەندە کۆبونەوەی سەرکردایەتی بەرە نەختی دواکەوت، بویە ئێمە وەکو حشك تەقلایکی زۆرمان داو، ئەوە بوو کۆبونەوەی سەرکردایەتی بەرە لە زستان (١٩٨٨ – ١٩٨٩) دا رێکخرا، بە ئامادە بوونی کاك مسعود و کاك نەوشیروان، چونکە مام جەلال لە دەرەوەی ولات بوو، لایەنەکانی تریش نوینەرەکانیان ئامادە بوون. شایەنی باسە کە بەرە نوسینگەیەکی هەبوو، بەناوی کارگێر لە گوندی راژانی کوردستانی ئێران، گۆڤارێکیشی دەر دەکرد هەر بەناوی بەرە سەر نوسەرەکەی د.ئەرسەلانی نوێنەری یەکێتی بوو، هەریەکی لە لایەنەکانی تری بەرەش نوینەری خوی هەبوو لە دەستەی نوسینی گۆڤاری بەرە دا. لە مانگی حوزەیرانی /١٩٨٩ چوم بۆ ئێران بۆ چارە سەری نەخۆشیەکەم، بەلأم لەبەر ئەوەی کوری شەهیدێکمان کەببوە – اطلاعات – گوزاریشی لێدام، بۆ ماوەی شەش مانگ لە ئۆردوگای – خۆی – و – کەرەج – دەست بەسەر بووم. دوای رام کرد و گەرامەوە بۆ ناوچەی خری ناوزەنگ دوای ئەوەی چەند رۆژ لە گوندی راژان مامەوە کەوەکو لە پێش تردا ئاماژەم بۆ کرد بوو، کە ئەو کانە – ابو حکمت – نوێنەرمان بو لەکارگێری بەرەدا. تا ئاگاداری بنکەی ناوزەنگیان کردەوە کە بەرگەیەکی چون و هاتنەوەم بۆ بنێرن،

چونکە ئێران لە قاسمە رەشدا خالێکی پشکنینیان هەبوو. دوای هێنانی بەرگەکە بەبێ گرفت لەم خالەدا رەت بوم گەرامەوە بۆ ناوزەنگ.

ئەم شەش مانگە هەر چەندە وەکو بەند کراو نەبوم، بەلام لەبەر بێکاری و نەبوونی پەرتوك بۆ خوێندنەوە، زۆر بێتاقەت بووم. بە تایبەتی لە – خۆی – چونکە لەگەر چی پەرتووك خانەیەك هەبوو. رۆژانە لەوێ خۆم بەپەرتوك خوێندنەوە سەرقاڵ دەکرد. کە هاتمەوە لە کۆتایی ساڵی /١٩٨٩ دا، دیاربوو هاورێ ئەبو فاروق و پ.م کرکوك و قەلادزە هەر هەموویان هاتنەوە بۆ ناوچەی خری ناوزەنگ وناوچەی دولە تویان چۆل کرد. پ.م کانی سلێمانیش لەسەر سنوری نزیك ناوچەی سلیمان بنکەیەکیان هەبوو. دوای هاتنەوەم بە ماوەیکی کەم ئەبو فاروق رۆیشت بۆ هەولێر، کەلەوێ سەر پەرشتی رێکخراوەکانی ناو عیراق بکات. مام قادریش لە دەرەوە گەرابوەوە. بۆیە م.هەرێم لە ه.جلال دەباغ و مام قادر و د.ئەبو یسار ومام صالح و من پێك هات. دوای ماوەیەك ه.جلالیش چووە ناوەوە، مام قادرمان هەلبژارد بە سکرتێرمان لە سەرەتای هاوینی /١٩٩٠ د.ئەبو یساریش رەوانەی ناوەوە کرا.

هاوینەوە مام قادر و مام صالح ومن، بۆ بەرێوەبردنی کاروباری پ.م و بەناوی م.هەرێم کارمان دەکرد، بۆ ئەوەی رژێم هەست نەکات گەل.هەرێم گەراوەتەوە بۆ ناوەوەی وولات. لەماوەیەدا بە هاندانی ئەبو حکمەت، چەند نامەیەك ئاراستەی ل.کرا، لەم نامانەدا ئەو برایە داوای دامەزراندنی – حزبی شیوعی کوردستانیان دەکرد، م. هەرێمی ئەو کات بە بایەخەوە نامەکامی دراسە کردو لەسەر ئەمە بریاری دا، کە نامیلکەیەك بۆ ریکخراوەکان دەربکات، لە نامیلکەکەدا هاتووە کە ئەمە داوایەکی رەوایە، چونکە کێشە گەلی کوردستان، پێی ناوەتە قۆناغێکی نویوە و لەوە دەرچووە، کە کیشەیەکی ناوخۆیی هەریەکی لەو دەولەتانەی، کە بەشێکی کوردستانی پارچە پارچە کراوە نەماوە. بەلکو بوەتە کێشەیەکی نیو دەولەتیەوە. بەلام لە لایکی تریش ئەم پرسە وا بە ئاسانی چارەسەرناکرێ. بەلکو پێویستی بەو هەیە، کە بەرێگای بەستنی کونگرەی رێکخراوەکانی کوردستان و، کۆنگرەی

نیشتمانی حزبی شیوعی عیراقیەوە هەیە، بۆ بریار لەسەردانی. بەلام ئەو هاوریانەو وئەوانی باوەریان بەم بیرۆکەیە هەبوو، کەوتنە جم و جوڵ بۆ سەپاندنی ئەم داوایەیان، هەندێ جار هەرەشەیان دەکرد کە ئەم بیرۆکەیە بە دژی دەستە سەرکردایەتیەکانی حزب وەکو ل.هەرێم و ك.ن.لەهاوینی/١٩٩٠ هاوری کریم لە سوریا وە هات بۆ سەردانمان. هەر خۆشمان بریارمان دابوو کۆبونەوەیك ببەستین بۆ لێکۆلینەوەی ئەم پرسە و هەل و مەرجی کوردستان و عیراق، ئیتر ئەم کۆبونەوەیە بە سەرپەرشتی هاورێ کەریم بەسترا، ئەم پرسە لەم کۆبونەوەیەدا زۆر بە درێژی باسی لێوە کرا، بەلام نەگەیشتینەی دەرئەنجامیکی یەکلا کەرەوە.

لە دوای ئەم کۆ بونەوەیەدا، رژێمی بەغدا کەوتە هەرەشەکردن لە کوێت، ولە (١٩٩٠/٨/٢) سوپای عیراقی پەلاماری کوێتی دا و توانی لە ماوەیەکی کورتدا، ئەم ولاتەی عەرببیەی داگیر کرد، لە پێناو کەلك وەرگرتن لە نەوتە زۆرەکەی کوێت، وسوپا داگیر کەرەکەی رژێمی سەدام، راو روتێکی بێ ئەندازە یان لەم وولاتەدا کرد. ئەمە وێرای دەست درێژی کردنە سەر خەلکی بێتاوانی کوێت، کورەکانی سەدام رۆلی سەرەکیان هەبوو، لە دزی وتالآنی خەلکی ئەم وولاتەدا. هیچ ئەوەیان لەبەر چاو نەبوو، کە کوێت وەکو دەولەت وەکو گەل زۆر یارمەتی رژێمەکەی سەدامیان دابوو، لەکاتی شەری عیراق — ئێراندا. ئەگەر ئەو تاوانانەی رژێم لە کوردستاندا کردی نەتواندرا، لە میدیاکانی جیهان بلاو بکرێتەوە چونکە نەك هەر راگەیاندنی عیراق بەلکو راگەیاندنی دەولەتە عەرەبیەکانیش پەردە پۆشی ئەم تاوانە گیانەوەریانەیان دەکرد. بەلام بەگوێرە کوێت زۆربەی دەولەتە عەرەبیەکان وێرای راگەیاندنی دەولەتی رۆژئاوایەکانیش تاوانەکانی رژێمی عیراقیان ریسوا دەکرد، بەمەش هەموو دونیا زانی کە رژێمی عیراقی چ جۆرە رژێمێکی دیکتاتۆری فاشستیە، کە دەست لە هیچ تاوانێك دژی گەلانی دراوسێ و گەلی کوردستانیش ناگیرێتەوە.

دوای ئەم دەست درێژییە نارەوایەی رژێمی عیراقی دژی کوێت ئێمە وەکو م.هەرێم داوامان کرد، کە سەرکردایەتی بەرە کۆببێتەوە بۆ وەرگرتنی هەلوێستێك لەو دەست

درێژەیەی رژێم هەر چەندە کارگێری بەرە بەیاننامەیەکی لە دژی ئەم دەست درێژیە دەکرد بوو. دیار بوو بریار درا بۆ گرێ دانی کۆبونەوەکە لە گوندی راژان، لەم کۆبونەوەدا کاك مسعود و کاك کۆسرەت ئامادە بوون، لەلای ئێمەشەوە هاوری کریم و من و برای هـ.ردوەند کە نوێنەرمان لە کارگێری بەرە بۆ ئامادە بوین، کۆبونەوەکە هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە درێژەی کێشا. بەلام هەر چەند وەفدی ئێمە زۆر هەولّی دا، کە سەرکردایەتی بەیانێك دەربکات و ریسوای ئەم دەست درێژی رژیم دژی کوێت بکات هەندێ لایەنی بەرە بەتایبەتی پارتی لەگەل دەرکردنی بەیاننامەدا نەبوون بەم شێوەیە کۆ بونەکە بەبێ وەرگرتنی هەلوێستی کۆتایی پێهات.

دوای گەرانەوەمان بۆ ناوزەنگ بە ماوەیەك هـ.کریم گەرایەوە بۆ سوریا بە رێگای ئێران. ئێمە هەر دوای دەست درێژیەکەی رژێم بۆ سەر کوێت، گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەم جارە رژێمی بەغدا بەبێ ئارەق لەم دەس درێژییە دەرنەچێ بۆیە بریارمان دا کۆنفرانسێکی سەربازی ببەستین، بۆ باس کردنی جم و جوولّی پێشمەرگایەتی لەکاتی هەر تێشکانێکی رژێم لەو ماوەیەش پەیوەندیمان لەگەل ناوەوە بە هێز کرد و گەریلایەکمان بە بەرپرسی هاوری جوامێر رەوانەی ناوەوە کرد. هێزی پێشمەرگەمان لە پارێزگای سلێمانی دا، توانیان بنکەیەك لە ناوەوەی کوردستانی عیراقدا بکەنەوە بارودۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە تاهێرشی ئاسمانی فرۆکە ئەمریکایەکان بۆ سەر عیراق دەستی پێکرد. شایەنی باسە کە ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی هێزیکی زۆریان لەسەر سنوری کوێت لەگەل سعودیە کۆکرد بوەوە بەلام هێرشەکەیان بۆ سەر رژێمی بەغدا زۆر دواخست. دیار بوو دەیان ویست رژێمی عیراق سوپاکەی لە کوێت بکێشێتەوە، هەندێ دەولەتی عەرەبیش ئەم داوایەیان لە عیراق کرد لەمانە سەرۆکی کۆماری سوریا (حافظ الاسد). بەلام سەدام بایەخی بەم داوای دلسوزیانە نەدا بۆیە لە ناوەراستی مانگی کانونی دووەم/١٩٩١ بۆمبارانی ئاسمانی دەستی پێکرد. ئەم بۆمبارانەش نزیکە چل رۆژی خایاند پێش ئەوەی هێرشی سەر زەوی دەست پێبکات. ئێمە ئەم جارەش داوای بەستنی

کۆبونەوەی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی – عیراق کرد، دیسان رەزامەندی بۆ بەستنی ئەم کۆبونەوە کرا، لە گوندی راژان ئەم جارە مام قادر و من بەشداریمان کرد لەتەك هاورێ رەوەند لە کۆتایی مانگی کانونی یەکەم/١٩٩٠ دا دیسان کاك مسعود سەرپەرشتی کۆبونەوەی کرد ئێمە لەو کۆبونەوەیەش داوای دەرکردنی بەیاننامەمان کرد، بەلام ئەمجارەش پارتی رازی نەبوو لەسەر دەرکردنی بەیاننامەکە، یەکێتیش لایەن گری دەرکردنی بەیاننامەکە نەبوو، من تا ئێوارە هەر سوور بونی خۆم لەسەر دەرکردنی بەیاننامەکە کرد، کاك مسعود گوتی باشە بەیاننامە دەربکەین بەلاّم رەنگە لەسەر ناوەرۆکی ریك نەکەوین، بەم جۆرە جارێکی تر کۆبونەوە بێ دەرئەنجام کۆتایی هات مام قادر و من گەراینەوە بۆ ناو زەنگ وەکو لە پێشەوە ئاماژەم پێ کرد هێرشی سەر زەوی دژی سوپای عیراق لە کۆتایی مانگی شوباتی/١٩٩١ دەستی پێکرد و سوپای عیراق دوای (١-٢)رۆژ لە دەست پێکردنی هێرشی سەر زەوی رایان کردو بەرەو عیراق گەرانەوە. دوای ئەم تێکشکانە ئابڕووبەرە جەماوەر توانی زۆر بەخێرایی دەست بەسەر شارەکان دابگری، دام و دەزگای رژێم خویان لە بەر هێرشی جەماوەر نەگرت و زوو رایان کرد ئینجا راپەرین لە ناصریە و سەماوە و دیوانیە و کەربەلا و نەجەف و حیلە و کوت سەری هەلداو ئەم پارێزگایانە لە دام و دەزگای رژێم پاککرانەوە شایانی باسە کەلەم راپەرینانە رێکخراوەکانی حزبی شیوعی و ئیسلامیەکان و جەماوەری گەل رولی بەر چاویان هەبوو. لە کوردستانیش لە رۆژی (٥/ئاداری/١٩٩١) لە شارۆچکەی چوارقورنە و رانیە تەقیەوە و جەماوەری ئەم شارە توانیان بەسەر دام و دەزگای رژێمدا زال ببن و پاکیان بکەنەوە، هەروەها سوپای رژێم لە ((قالاوە)) دوای بەرگریکی کەم خۆیان دا بەستەوە و هێزی جەماوەریش بەرێزەوە رەفتاریان لەگەلئەفسەرو پلە دارەکان و سەربازەکان کرد. لەپێش راپەرینی رانیەدا هاورێ شەهید سعدون کەبە بریاری حزب لە ناوەوە دا بۆکاری نهێنی مابووەوە دووجار هات بۆ ناو زەنگ هەرچەکی وردمان هەبوو لە چەند کلاشینکۆفیکی لەگەل خۆی بردەوە بۆ هەولێر، هاورێ

سعدون که هاورێیەکی عەرەب هەر لە ساڵی/١٩٨٢ هاتبوە ریزی پێشمەرگەی حزبمان و چالاکانە بەشداری لە چالاکیەکانی پێشمەرگایەتی دەکرد لەبەر ئازایی وزیرەکی خۆی بۆ دەوردەی ئەفسەری لە ((یەمەنی دیموکرات)) ردوانەکراو بە پلەی ئفسەری گەرایەوە. لە ٧/ئاداری /١٩٩١ کاك مسعود لەگەل هەندێ ئەندامی م.س پارتی هاتە قاسمەرەش ئێمەشیان ئاگادار کرد، کە ئێواردی ئەم رۆژە کۆبونەوەیەی بەرە لەقاسمە رەش دەکرێ من و هاورێ مام صالح بەشداریمان کرد لەم کۆبونەوە گرنگە ی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی کە بریار درا ئەم جارە بەیاننامەکە دەربکەین و جەماوەر لە هەموو کوردستان هانبدەین بۆ راپەرین دژی دام و دەزگاکانی رژێم و لە کوردستان دەریان پەرێنین. نوسینەوەی بەیاننامەبە کاك ئازاد بەرواری و من و هۆشەنگ لە پارتی گەل سپێردرا، ئێمەش هەر بەیانامەکەمان ئامادە کردو لەئێزگەی یەکێتی و پارتی خوێندرایەوە بە بلاو کردنەوەی بەیاننامەکە جۆش و خرۆش ی جەماوەر زیاتر پەرەی سەند هەر بۆ رۆژی دوایی جەماوەری شاری سلێمانی شاری هەلمەت و قوربانی راپەرین شارەکەیان لە دام و دەزگاکانی رژێم پاك کردەوە، شایەنی باسە ئێمە لە ناو زەنگ وەکو حشع لە ١٩٩١/٣/٧ دوو گەریلامان بۆ ناوەوە ردوانەکرد بە بەرپرسی کانبی و ملازم شێرزاد کە بەداخەوە لە شاخی هەیبەت سولتان چوار پێشمەرگەی قارەمانمان شەهید کران لە کاتی شەرکردن دا، لە دژی سەنگەرەکانی رژیم دا، بەم شێوەیە چیایەکە لە هێزی رژێم پاککرایەوە هەر دوو گەریلاکەش لە دەورو بەری شارەکە یەکیان گرتەود بە گەیشتنی ئەم دوو گەریلاش وەردەی جەماوەری کۆیێ کۆل نەدەر بەرز بودوە راپەرینیان بەرپاکرد لە ٦/ئاداریش جەماوەری شاری هەولێر خۆ پیشاندانێکی ئازایانە کرد دژ رژێمی بەغدا، لەم خۆپیشاندانەدا ئومێدی کچم لەسەر پشتی لۆریك چەند جارێ هاواری کرد بەروخانی رژێمی دیکتاتۆری دیارە ئەمەش سەرەتای دەست پێکردنی خۆپیشاندانەکە بوو. دیارە ئەمنەکانی رژێم و چلکاوخۆردکانی پەلاماری جەماوەری راپەریویان بە تەقەلێ کردن دوای رۆیشتنی ماوەیکی باش بلاویان پێی کردبوون.

بەبێ ئاگاداری ئێمە کاك مسعود ونەوشێروان دابەزیبون بۆ ناوەوە بەلام دوایی زانیمان ئێمە هاورێ مام صالحمان نارد بۆ رانیە پێویستە بگوترێ ئێمە زۆر بە پەلە نەبوین بۆ دابەزین چونکە کۆمەلی هاورێ عمر علی شێخ و جەلال دمباغ وابو یسار و دایکی بەهار. دوای دابەزینی مام صالح بە چەند رۆژیش منیش دابەزیم یەك رۆژ لە رانیە مامەود سەردانی مالی سوار اغام کرد لە گوندی (سەرکەپکان) و سوپاسم کرد چونکە لە کاتی ئابلۆقەدانمان لە دۆلە رەقە زۆر یارمەتی داین و لە وێش چاوم بە کۆمەلە ئەفسەرێکی سوپای عیراق کەوت کە لەوێ بوون لەسەربازگای -- قالاوە- بەدیل گیرابوون، گوتیان ئێمە شەرمان نەکرد لەگەل رولەکانی گەل و خۆمان دا بەدەستەوە. منیش گوتم ئێوە ئەم جارە بێ ئومێد بوون لە مانەوەی رژێم ئەگینا جارەکانی تر زۆر بێ بەزەییانە شەرتان لەگەل پ.م دەکرد، بەلام حەز دەکەم پێتان بلێم گەلی کوردستان بیر لە تۆلە سەندنەوە ناکات ئێوەش مامەلەیەکی مرۆڤانەتان لەگەل دەکرێ تارەوانەی لای کەس و کارتان دەکرینەوە. بۆ رۆژی دوایی چووم بۆ شاری کۆیێ لەوێش بارەگای حزب کرابوەوە سەردانم کردن دیار بو هاورێ شێرزادی شەهید خۆی و کۆمەلە پێشمەرگەیەکی چوو بون دەوروبەری کرکوك بۆ بەشداری کردنی لە شەری ئازاد کردنی کە بەداخەوە لەم شەرەدا شەهید بوو. شایەنی باسە کەلە ماوەی هەفتەیەك هەموو کوردستان ئازاد کرا بێجگە لە کەرکوك کە هێزیکی زۆری پێشمەرگە لە دەورو بەری ئەم شارەی کوردستان کۆ کرابوەوە. بۆ ئازاد کردنی ئەم شارەش، چونکە رژێمیش هێزیکی زۆری لەسەر بازگەی خالد هەبوو لەگەل ئەوەش پ.م هێرشی کردە سەر ولە رۆژی نەورۆزی ئەو سالەدا، هێزی رژێمی لەم شارا وەدەرنا. بەلام بەداخەوە رژێم دوای (١٠) رۆژ توانی شارەکە داگیر بکاتەوە من یەك و دوو رۆژپێش نەورۆز گەیشتمەوە هەولێر هاورێیان بینایەی شاردوانیان گرتبوو کردیانە باردگای سەرەکی (٧٦) بنکەی پ.م پشمان هەبوو ژماردیەکی زۆری هاوریانمان ببونە پ.م یەك دوو رۆژ پێش هێرشەکەی رژێم بۆ هەولێر ئەبو فاروق داوای لێ کردم بچمە رەواندوز لە رێگای خۆشمدا سەرێلە رێکخراوی شەقلاوە بدەم

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە چووم بۆ شەقلاوە. بۆ شەو ژمارەیەکی زۆری پ.م کۆکردەوە، لە بارەی هەل ومەرجی عیراق قسەم بۆ کردن، ڕوونم کردەوە کە ڕژێمی بەغدا دوای ئەم تێکشانەی لە کوێتدا هەر دەروخێ، چونکە بەم پەلامارەی کوێت گیرو گرفتی زۆر زیادی کرد. ڕۆژی دوایی چووم بۆ ڕەواندوز. بارەگای حزب لە بینایەی (ئەمن) بوو. کۆمەلی پێشمەرگەمان هەبوو لەوێش دیارە لەو ڕۆژە هێزی چەکداری ڕژێم توانیبوی بەسەر بەرگری‌پێشمەرگە لە ناوچەی (پردێ) و گەیشتبوە هەولێر، ولەم شارە چەند تاوانی ئەنجام دابو، وەکو کوشتنی کەمێك پ.م و خەلکی شارەکە وە ژمارەیەکی دیکەشی دەست گیر کردبوو، کەتائیستاش بێسەرو شوێنن. شایەنی باسە کە چوار پ.می ئێمە لە ناو بارەگا دا شەهید کرد بوو، کە بریتی بوون لە شەهید ڕاوێژ و سێ برای تری وکوڕێکی هـ.علی مەکتەبە لەمالی خۆیان شەهیدی کرد بوو هێرشی ڕژێم بەردەوام بوو، بەرەو هاوینە هەواری پیرمام، ئەو هێزەی لە لایەن فرۆکەی هالیکۆپتر هاوکاری دەکرا، لەبەر ئەوەی دوای (٣٢) ڕۆژ توانی هاوینە هەواری پیرمامیش داگیر بکاتەوە شایەنی باسە کە ئەمەریکا بە سەرۆکایەتی بۆشی باوك، هێرشی هێزە هاوپەیمانەکانی لە پریکا ڕاگرت و بواری بە ڕژێمی سەدام دا، کە هێزی فرۆکەی هەلیکۆپتەر بەکار بهێنی بۆ سەرکوت کردنی ڕاپەرینی جەماوەر لە باشوری عیراق ولە کوردستاندا، ئەمە دوای مۆر کردنی خۆ بەدەستەوەدانی ڕژێم لە لایەن وەزیری بەرگری سولتان هاشم. بە هۆی ئەم هەلوێستەی ئەمریکا ڕژێم توانی هەردوو ڕاپەرینەکە پاکتاو بکات، هەر چەندە لە کوردستان پ.م و جەماوەر داکۆکیان لە کوردستان کرد و توانیان لەدەربەندی کۆرێ و لە ئەزمەردا، هێرشی ڕژێم تێکبشکێنن و زیانێکی زۆری پێ بگەینی. پێویستە لێرەدا کە ئەو ڕاستیە دەربرین کە سەرکردایەتی ئەمریکا نەدەویست ڕژێمی سەدام بروخێنی، چونکە ئەگەر هێرشەکەی ڕانەگرتباو ڕیگای بە ڕژێم نەدابایە فرۆکەی هالیکۆپتر بەکار بهێنی لەچەند ڕۆژێکی تردا، ڕاپەرینی باشور و کوردستان لە بەغدادا یەکیان دەگرتەوە و ڕژێمی سەدامیان دەروخاند، ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمریکا

دۆستی رژێم بوو، لە دوای شەری عیراق و ئێران، پارمەتییەکی زۆری رژێمی داو بڕە پارەیەکی باشی بەناوی قەرز دایە ئەو رژێمە فاشیە، ئەمەش جاریکی تر ئەو راستیە دووپات دەکاتەوە کە ئەمریکا دوستی گەلان نییە، بەلکو تەنیا بە دوای بەرژەندیە سەرمایەداریەکانی خوی دەگەرێ. ئەو لەشکرکێشەشی بۆ ئازاد کردنی کوێت. بەو هۆکارە بوو، کە بۆشی باوك بەشێکێ زۆری هەبوو، لە نرخی ئەو نەوتە کە لە بیرەکانی کوێت دەردەهاتوو لە بازارەکاندا دەفرۆشرا. ئەم جارە بە هۆی ئەو کات کە رژێمی بەغدا هێلە سنورەکەی بەزاند و پەیوەندی لەگەل تاقمی – قاعدە دروست کردبوو، کە ئەمریکا بە دوژمنی هەرە سەختی خۆی دەزانی، بە تایبەتی دوای پەلامار دانی ئەمریکا لە (١١/ئەیلولی/٢٠٠١) دا، دەبێ ئەوەش بگوترێ کە بۆشی باوك لەکاتی هێرشەکەی سوپای عیراق بۆ کوردستان، گوتی یەك سەربازی ئەمریکیش نانێرین بۆ عیراق بۆ داکۆکی کردن لەگەلی کوردستان، بەلام لە دوای کۆرەوە چەند ملیۆنەکەی دانیشتوانی کوردستان، بۆ سەر سنوری ئێران و تورکیا کە بوە هۆکاری مردنی دەیان مندالی ساوا و پیری پەککەوتە، دام و دەزگاو هەندێ دەولەتی ئەوروپا داوایان کرد بریاری دەربچی بۆ پاراستنی کورد، بۆشی باوك بە ناچاری رەزامەندی لەسەر بریاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەولەتی ژمارە (٦٨٨) بکات کە بەشێکی زۆری لە کوردستان کرد بەناوچەی هیمنایەتی (امنیە) وە قەدەغەی کرد کە رژێمی بەغدا، فرۆکە جەنگیەکان و ئالیاتی قورس لەم ناوچەیە بەکار بهێنی و پێویستە لەسەری کە بەهیچ جۆری ئازاری خەلکی ئەم ناوچەیە نەدات بۆیە رژێمیش لە پایزی سالی/١٩٩١ سوپای خۆی لەگەل دام ودەزگاکانی لەم ناوچەیە پاشە کشە پێ کرد، چونکە هیچ دەسەلاتی لەم ناوچەیەدا نەمابوو.

شایەنی باسە کە لەسەر داوای رژێم دوای کۆتایی جەنگ، سەرکردایەتی ... بە ئامادە نەبوونی هیچ نوێنەرێکی ئێمە، لەسەرەتای نیسانی /١٩٩١ دا بریاری ... کە وەفدیکی بەرەبچێت بۆ بەغدا، بۆ گفت و گۆ لەگەل رژێمدا وەفدەکەش ... کرابوو دوای گەرانەوەی وەفدەکە رژێم بریاری دا کە دەبێ بۆ دانیشتنەکانی داهاتوو کاك

مـسعود سـەرکردایەتی وەفدەکـە بکـات، دوای ئەمـە بـە ماوەیـەك هاورێیـانی کـریم ئەحمەد و ئەبو فاروق لە نـاوزەنگ گەرانـەوە دیـار بـوو لەویـشدا س.هـەرێم بریـاری دابـوو کـە ((تحفظ))دەربـبڕێ، لەسـەر بریـاری گفتوگـۆ کـردن لەگـەل رژێـم، بـەلام ناشبینە کۆسپ لە بەردەم ئەم دانوسـتانەدا، شـایەنی باسـە کـە هـاورێ کـریم و ئـەبو فـاروق و دایکـی بـەهار هـاتن بـۆ رەوانـدوز ئـەو شـەوە پـروپاگەنـدیکی زۆر گـەرم بلاوبودوە کە هێزی رژێم گەیشتوتە ((خلیفـان)) بۆیـە شـەو بریارمـان دا کـە ئـەوان بـەرێگای پـشت ئاشـان، لەوپێـشەوە بـچنەوە نـاوزەنگ. منـیش لەگـەل پ.م کـان لـە رەوانـدز بمێنینەوە، ئەگەر هێرشی رژێـم گەیـشتە رەوانـدز منـیش لـە خـەلك و پ.م دەرۆم بۆ ئێران، لەوێشەوە بۆ ناوزەنگ دەگەرێمەوە. بەیانی ئەوان زوو رۆیـشتن مـن کە دوای ئەوان چومە بارەگـای حـزب لـە رەوانـدوز لـەوێ زانـیم کـە هێـزی رژێـم لـە دەربەندی کۆرێ تێکشکاوە وبەرەو هاوینە هەواری پیرمام، ئێمە لە رەواندز چەکێکی زۆرمان دەست کـەوت، لـە ترسـی هێرشـی رژێـم ئێـوارەی پێـشو ئـەو چـەکانەمان لـە محمدی وەستا رەوانەی گوندی (دار السلام) لە ناوچەی گەلالە کرد بۆیە منـیش ئـەو رۆژە لەگەلێ هەندێ هاورێ بە ئۆتۆمبیلی (عبدالله توفیق) بەرەو گوندەکە رۆیشتین. بەلام لەبەر قەلـەبالغی ریگاکـە سـەعات دوازدەو نیـوی شـەو گەیـشتینە گوندەکـە بـۆ رۆژی دوایی چەکەکانم رێك بخەین بەلام بەداخەوە نەم ژمـاردن، ئـەو شـەوەش هـەر لـەوێ مامـەوە، بـۆ رۆژی دوایـی گەرامـەوە بـۆ رەوانـدز هـەر وەکـو لەپێـشیدا باسـم بریاری (٦٨٨)ی لەم ماوەیەدا دەرچوو، تا سنوریکی هەست پێکراو بارودۆخەکە هێور بـووەوە، هاورێیـانیش لـە نـاوزەنگ دا گەرانـەوە دوای ئەمـە بریـاری کۆبونـەوەی سەرکردایەتی سیاسی درا، کۆبونەوەکە لە شەقلاوە بەسترا هـ.کریم و من بەشداریمان تێداکرد، لە کۆبونەوەکە دا کەمام جلال وکاك مسعود ئامادەی بوون ئەو وەفدی چوو بوو بۆ بەغدا باسی سەردانەکەی خۆیان کرد و دووپاتیان کردەوە کـە سـەرانی رژێـم سورن لەسەر ئەوەی کە کاك مسعود خۆی سـەرکردایەتی وەفـدی بـەردەی کوردسـتانی بکـات. هـ.کـریم بـە درێـژی باسـی هەلوێـستی حزبـی کـرد لـە بـاردەی گفتوگـۆ لەگـەل

رژێمدا، گوتی ئێمه وای دەبینین کە ئەو رژێمە ناتوانێ کێشەی رەوای کوردستان چارەسەر بکات، وپێمان وایە گفتوگۆیەکە سەرکەوتوونابێ، بۆیە ئێمە ((تحفظ)) مان هەیە لەسەری، بەلام ناشبینە کۆسپ لەبەردەمدا، بەگوێرەی سەرکردایەتی کردنی کاك مسعودیش، ئێمە پێمان باش نییە بڕوات، دەترسین مەترسی لەسەر ژیانی هەبێ، بەلام لایەنەکانی تر بە گەرمی ئەم چوونەیان پەسەند کرد، دەبێ بگوترێ کە کادریکی پێشکەوتوو زۆر بە توندی وەڵامی ه.کریم دایەوەو گوتی ئێوە دەتانەوێ ئەم دان وستانە سەر نەکەوێ، بۆیە بەراستی نازانن کاك مسعود سەرکردایەتی وەفدی کوردستان بکات، شایەنی گوتنە مام جلال پێش ئێمە وەلامی دایەوە و گومانی خۆی لە ئاکامی دانوستاندنەکە دەربری وگوتی، راستە رژێم موافقە لەسەر دیموکراسی و ئۆتونومی بۆ کوردستان دەکات، بەلام چ جۆرە دیموکراتی و چ ئۆتۆنومی؟! رژێم هەر ئەو دیموکراتیە ئەنجام دەدا کە خۆی باوەری پێهەیە، کەناوەرۆکەکەی هەر دیکتاتۆریە هەروەها بە گوێرەی ئۆتۆنۆمیش هەمان بۆ چونیان هەیە، لەو کاتە دیارە بۆ کادیرەکانی دیکە لەگەڵی دابوون. ئێمە لەم کۆبونەوەیەدا پێشنیارمان کرد، کەدانوستانەکانیش جارێ لە بەغدا و جاری دوایی لە کوردستان بەرێوە ببرێ، بەلام ئەوانەی دی ئەم پێشنیارەیان رەت کردەوە بەو بیانوەی کەهێشتا پێگەی رژێم لەهی ئێمەی کورد بەهێزترە، کەچی ئێمە لەو باوەرە دابووین کە پێگەی بەرەی کوردستان بەهێزترە لەهی رژێم، لەو هەل و مەرجەدا. بەم شێوەیە بریار درا کە کاك مسعود سەرکردایەتی وەفدی بەرە بکات، کەپێك هاتبوو لە کاك کۆسرەت و رسول مامند و کاك سامی. کاك مسعود زۆر هەولی داکە ه.کریمشی لەگەل بروات بەلام ه.کریم رازی نەبولەگەلیدا بروات، چونکە ئێمە وەکو ل.هەرێم لەگەل دا نەبووین. ئیتر دوای چەند رۆژێ وەفدەکە بەرەو بەغدا بەرێ کەوت و ماوەیکی درێژ لە بەغدا مایەوە دیارە لەو ماوەیەدا گەیشتبونە رێك کەوتنێك، لە بارەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بە مەرجێ سەرکردایەتی بەرە لێی رازی بێت، بۆیە دوای چەند رۆژێ لەگەرانەوەی وەفدەکە کۆبونەوەیکی تایبەتی

سەرکردایەتی گرێ درا. لەم کۆبونەوەیەدا هەموو لایەنەکان بێجگە لە پارتی ناڕەزاییان دەربری لەو ڕێکەوتنە، لەم کۆبونەوەدا هاورێ عزیز و من ئامادە بوین، هاورێ عزیز زۆر بە توندی دژی ڕێککەوتنەکە دوا و گوتی ئەم ڕێکەوتنە لەسەر بیرۆکەی دیکتاتۆری نوسراوەتەوە. دوای گفتگۆیکی چرو پر بریار درا، ڕێکەوتنەکە ڕەت بکرێتەوە و کۆبونەوەیەکی تایبەتی تر دوای چەند ڕۆژی دیکە ساز بکرێ. بۆ دەست نیشان کردنی سنوری نزمی(الحد الادنی) داخوازیەکانی گەلی کوردستان لە خۆ بگری کە وەفدی کوردستان بە لەمەکەمتر ڕازی نەبێ و مام جەلالیش ئەم جارە لەگەل وەفدەکە تا هەولێر بروات، بۆ ئەوەی ئەو وەفدەی ڕژێم کەدین بۆ پێش وازی وەفدی کوردستان چاو یان پێکەوێ بۆ ئەوەی واتێنەگەن کە لە ناو بەرەی کوردستان ناکۆکی هەیە بەم جۆرە وەفدەکە گەرایەوە بۆ بەغدا، لەم ماوەیەش شاری هەولێر نیمچە ڕاپەرینێك بەرپابو و کە هێزی ڕژێم خراپ تێکشکاو جەماوەر توانی تاناو مولگەکانی خۆی راویان بنێ دوایش لە کارگێری بەرە بەرێز(فرانسۆ هەریری) خوا لێخۆشبێ حزبی ئێمەی بە بەرپاکردنی ئەم ڕاپەرینە تاوان بارکردو گوتی ئێوە دەتانەوێ ئەرکەکەی کاك مسعود لە بەغدا سەرکەوتوو نەبێ، لە ئاکامی ئەم تاوان بارکرد نەمشت ومریکی زۆر لە نێوان من و فرەنسۆ هاتە پێشەوە، شایەنی باسە کە لە یەکی لە کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی سیاسی بریار درا، کە کارگێرێی بۆ بەرە لە ناوچەی خەلیفان دابمەزرێ بەبەشداری یەك نوینەر بۆ هەر یەکێ لە حزبە بەشدارەکان، من نوێنەری هەرێم بوم لەم کارگێریەدا و فرانسۆش نوێنەری پارتی بوو، نوێنەری یەکێتی زۆر گۆڕانی بەسەرهات، ئەوەی لە یادمە یەکەم نوێنەر کاك قادر حاجی علی بوو. کاك قادر جەباریش نوێنەری سۆسیالیست بوو. لە یەکەم کۆبونەوەدا کاك قادر جەباری بەبریاردەر – مقر – هەلبژێردرا منیش بەبەرپرسی دارایی داندرام لە باروەدۆخێکی هەستیار کارگێری بەرد بۆ ماوەی یەك سال کارو باری کوردستانی بەرێوە برد. کەچی هیچ حساب بۆ نەو کەسایەتیانەی ئەم کارگێرە نەکرا، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ئەم نوێنەرانەی بەبێ موچە سالێك

کاریـان کـرد. شـایەنی باسـە یـەکی لـەو گرفتانـە لەبـەر دەم کـارگێڕدا قـوت بـودوە، ئـاودیوکردنی ئۆتۆمبیـل و جۆرەکـانی تـری ماشـین بـۆ ئێـران، بۆیـە لەسـەر هـەر ڕێگایەکی سەرەکی بۆ ئێران خالێکی گومرگ دانرا، بەلام زۆر جار قاچاغچیەکان بـە دزی یا بە دانی بەرتیل بۆ ئەو کەسانەی لـە خاڵەکانـدا کاریـان دەکـرد هـەر چـەندە زۆر هەولم دا بۆ ئەوەی کـۆنترۆلی ئـەو دیـاردە نایاسایە بکـەم. بـەلام زۆر سـەرکەوتو نـەبووم. چـونکە کارمەنـدەکانمان لـە خاڵـەکانی سـەر سـنوری ئێـران. فێـر بـوون لـە بەرامبەر ڕێگادان بە قاچاغچیەکان بەرتیلیان لێ وەربگرن زۆر جاریش کادری حزبـە دەسـت ڕۆیـشتوەکان، ئـەم ماشـینەیان بـەرێ دەکـرد بـە زۆرە ملـێ بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیان، چەند جاریکیش ئەم کێشەیە لەسـەرکردایەتی بـەرە باسـی لێـوە کـرا، بـەلام چارەسەرێکی ئەو تۆی بـۆ نەدۆزرایـەوە بـەم شـێوەیە ژمـارەییکی زۆری ئۆتۆمبیـل و گەلاب و لۆری جۆرەکانی تری ماشین ئاودیو کران. پێویستە بـوترێ بەرهـەمی خالـە گومرگیەکان مانگانـە کۆدەکرایـەوە وبەسـەر حزبـەکانی بەشـدار بـەپێی خـشتەیەکی دیاری دابەش دەکرا، بەلام گومرگی (ابراهیم خلیل) لە دهۆك یەك فلسی نەدە نـارد، شـایەنی باسـە چـەند جـارێ موچـەی مامۆسـتایان و زانکـۆی سـەلاحەدین لـە لایـەن کارگێڕیەوە خەرج دەکرا.

بەلای من گرنـگ ترین کاریك کە کارگێڕی کردی، بڕیاری ژمارە — ٢ — بوو لە بـارەی گەڕانەوەی جوتیارەکان بـۆ گونـدەکانی خۆیـان، بـەخۆ هەلکێـشانەوەی نـایلیم کـەمن ڕۆلێکی زۆرم گێڕا بۆ دەرکـرد ئـەم بڕیـارە، کـاك قـادر جـەباریش یارمـەتی دام، بـەم شێوەیە کارگێڕی بەرە بڕیاریدا، کۆبونەوەیەکی تایبەتی ساز بکات، بـۆ لێکۆلینـەوەی ئەم کێشەیە، کـە سـەرەتا لـە لایـەن ئاغاکـانی پـشدەر ڕێگایـان نـەدەدا لـە سـالی/١٩٩١، جوتیارەکان بگرینەوە بۆ دیهاتەکانی خۆیان وسەر زەوی و زاری خۆیان خەریك ئـەم کردەوەی ئاغاکانی پشدەر بۆ ناوچـەکانی تـریش تەشـەنەبکات. بـەلام سـەرکردایەتی بەرە لە دژی وەستایەوە و بڕیـارێکی دەرکـرد بـەپێی ئـەم بڕیـارە ڕێگـای لـە ئاغاکـان بـڕی، بـاش بـوو بڕیارەکـە بـەبێ گیروگرفـت جێبـەجێ کـرا. یـەکێکی دی لـە بڕیـارە

گرینگـەکانی بـەرە بریـاری هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی کوردسـتان بـوو، کـە لەسـەر پێشنیاری کاك مسعود ئەم بڕیارە درا لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی بەرەوە، وداوا لە کۆمەلە یاسا ناسیك کـرا کـە یاسـای هەلبـژاردن ئامـادە بکـەن وەك رەش نـووس تـاکو سەرکردایەتی بریاری لەسەر بدا، لەسەر ئەم رەشنووسە مشت و مڕێکی زۆر کـرا لـە سەرکردایەتی بەرە. حزبە زلهێزەکان دەیان ویست هەلبژاردنەکە بـە شـێوازی دائـری بکرێ کەچی حزبەکانی تر دەیان ویست – رێژەیی – بێ دوایی بـە زۆرینـەی دەنـگ بریار لەسەر رێژەیی درا، بەلام لێرە گرفتێکی تر هاتە پێشەوە، ئەویش بـەرزی ئـەو رێژەیـە کـە دەبـێ هـەر لیـستی بەدەسـتی بینـی کـە لـە ٧٪ بـوو، لەسـەر ئەمـەش کێشەیەکی زۆر رووبەرووی حزبەکان بووەوە چونکە رێژەکە زۆر بەرزبوو، بەلام پارتی هیچ ئامادەی بۆ هێنانە خوارەوەی ئەو رێژەیە پێشان نەدا، سوور بـو لەسـەر ئـەوەی کە هەر دەبێ ئەو رێژەیە بـێ، یـا بەشـێوازی دائـری هەلبژاردنەکە بەرێوەبچێ. لـە بارەی ئەو کێشەیە کاك سـامی عبـدالرحمن زۆر هـەولی دا، کـە رێژەکـە هەنـدێ کـەم بکرێتەوە، بـەلام بەهـەموو لایکمـان نـەمان تـوانی ئـەم رێژەیـە کـەم بکەینـەوە. بـەم شـێوەیە بریـار لەسـەر شـێوازی رێـژەیی درا بەمـەرجێ هـیچ حزبێـك بـۆی نـەبێ نوێنـەری لـە پەرلـەمان هـەبێ، ئەگـەر رێـژەی ٧٪ دەنگـەکان نـەهێنی. بـەم جـۆرە هەلبژاردنەکـە لـە رۆژی (١٩٩٢/٥/١٩) بـەرێوە چـوو، لـەم رۆژەدا تزویرێکـی زۆر کـرا لەلایـەن هـەردوو حزبەکـە. بەرادەیـەك کـاك مـسعود نامەیـەکی بـۆ هـەموو رێکخراوەکـانی پـارتی رەوانـەکرد، لـەبارەی ئـەو تـەزویرەی لـە سلێمانی و گـەرمیان کراوە. کـە لەراسـتیدا لـە هـەولێر و دهـۆکیش هـەر کـرا بـەهۆی ئـەو تـەزویرە هـیچ لیستێکی تر بێجگە لـە پـارتی و یەکێتیـدا نـەبێ نـەیان تـوانی ئـەم رێژیـە بەدەسـت بهێنن. لەسەر ئەمەش کێشەیەکی تر هاتەپێشەوە، بۆ چارەسەرکردنی ئـەم کێشەیە، سەرکردایەتی بەرە دوو رۆژ لەسەریەك کۆبونـەوە لـەم کۆبونەوانـەی مـام جـەلالیش دانی بەوە دانا کە تـەزویرکراوە رۆژی سـێیەم پـارتی و یـەکێتی بـە تـەنیا کۆبونـەوە رێککەوتنێکیان لە نێوان خۆیان مۆر کرد کە هـەردووکیان ئەنـدامانی پەرلـەمان بـە

یەکسانی دابەش بکەن بەم جۆرەگرفتی نێوانیان بە شێوەیەکی کاتی چارەسەر کرد بەلام حزبەکانی دی زۆر نیگەران بوون لەم دەرئەنجامە، وەکو کاردانەوەی رەفتاری ئەم دوو حزبە، سۆسیالیست و پارتی گەل و پاسۆك لە نێوان خۆیان رێك کەوتن، کە ببن بەیەك حزب و پارتی ویەکێتی ئەنجومەنێکی هاوبەشیان دامەزراند، بەلام هەندێ نوێنەری حزبەکانی دیکەیان هێنایە نێو کابینەکە ودکو حزبمان و بزافی دیموکراتی ئاشووری، کەئەوانیش توانیان لەو پێنج کورسیەی پەرلەمان کە بۆ کلدو ئاشور تەرخان کرا بوون چوار کورسی بەدەست بهینن بەداخەوە هاوریانی ئێمە لە ریزی کلدو – ئاشور هەولێکی باشیان نەدا ئەگینا دەمان توانی چەند کورسی یەك بەدەست بهێنین. دوای پێك هێنانی حوکومەت (٢-٤) مانگ هیچ پارمەتی حزبەکانی دەرەوەی پەرلەمانیان نەدا، بۆیە حزبمان نەیتوانی ئەو ژمارەی پ.م کە هەمان بوو بهێلیتەوە، لەو ماوەیەدا ئەو هاورێیانەی دوای پێك هێنانی حزبی شیوعی کوردستانیان دەکرد، چالاکیەکانی خۆیان پەرەپێداو زۆر فشاریان خستە سەر ل.هەرێم و ك.ن .ل.هەرێم تەقەلایەکی زۆری دا کە ئەم کێشەیە بە رێگای گفتوگۆ چارەسەر بکات، بەلام لەم تەقەلایەدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە هەندێکیان بە گیانێکی پر توندوتیژی رەفتاریان دەکردو، نەیان دەویست بەم رێگایە کار بکەن، بەلکو دەیان ویست بیرو باوەرەکەی خۆیان بە زۆرەملی بەسەر ل.هەرێم و ك.ن دابسەپێنن. بۆیە لە کۆنفرانسی پارێزگای هەولێر نیازەکانی خۆیان بە ئاشکرا راگەیاندو کۆنفرانسەکەیان تێك دا، ویستیان دەست بەسەر بارەگای ناوخۆیی هەولێر رابگرن بەلام پێشمەرگەکانی هەولێر بە یارمەتی هەندێ پ.م کرکوك کە لە(بنەسلاوە) بوون ئەم ویستە نارەوایەیان پوچەل کردنەوە، شایەنی باسەکە ئەم بزافە نادروستە هەر لە ناو کادرەکانی هەولێر دابوو، لە پارێزگاکانی دیکەی کوردستان نەبوو ئیتر دوای ئەو روداوە لەناو کۆنفرانسی هەولێر خۆیان لە حزب جیا کردەوە و کەوتنە جم و جۆل بۆ پێك هێنانی رێکخراوە کەرتکاریەکەی خۆیان، لەسەرەتا بە ناوی شیوعیە کوردستانیەکان، دوای حزبیکیان پێك هێنا بەناوی

(پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان) من هەر لەسەرەتا لەو باوەڕەدا بووم، کە ئەمانە ناتوانن ماوەیکی درێژ بە یەکەوە کار بکەن، بەلام یارمەتی حزبەکانی نەتەوەیی کوردستان تەنانەت هەندێکیان کە خۆیان بە چەپ دەزانی وای کرد کە نەختێ تەمەنیان درێژ ببێتەوە، کەچی لەم یەك دوو ساڵەی رابردوو دا لەبەر یەك هەلوەشانەوە و کادرە دلسۆزەکانیان گەڕانەوەبۆ ڕێزی حزبی خۆیان حزبی شیوعی کوردستان، پاشماوەکانیشیان کە بریتی بوون لە چەند کەس چونەریزی پارتی دیموکراتی کوردستان - عیراق ئەبو حکمت ئەمە دووساڵە چۆتە ڕیزی پارتیەوە ئەمە چارەنووسی هەموو ئەو تاقمانەیە کە لە حزبی شیوعی عیراقی جیا بۆتەوە.
بە گوێرەی بەرەی کوردستانی، دوای هەلبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەت لەلایەن حزبە زلهێزەکانەوە پشت گوێ خراو بەرەو لاوازی ڕۆیشت، بەلام لە ناو نەچوو بەهۆی دلسۆزی هەندێ کەسایەتی ناو حزبەکانەوە ئیستاش بارەگایەکی لە هەولێر هەرماوە، دوای شەری ناوخۆیی تەنیا پارتی و بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری حشك مانەوە لەناو بەرەکەدا، دوایی روخانی رژێمی دیکتاتۆری بەغداش بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری خۆی دوور کردەوە، هەر پارتی و شیوعی ماونەتەوە لە راستی دا ئەمرۆ گەلی کوردستان لە هەموو کاتی زیاتر پێویستی بە بەرەی کوردستانی هەیە، لەم دوایەدا بە دەست پێشخەری کاك مسعود دەستەیەك لە حزبە کوردستانییەکان پێك هێنراوە بە بەشداری سکرتێری هەریەك لە حزبەکان کە هەر مانگێ جارێ کۆ دەبنەوە بۆ گفتوگۆ کردن لە بارەی پێش هاتەکانی کوردستان وعیراق بەرای من ئەم دەستەیە ناتوانی جێگای بەرە بگرێتەوە بەلکو پێویست بە زیندوکردنەوەی بەرەی کوردستانی هەیە کە بارەگایەکی خۆی هەبێ و کارگێرو دام و دەستگای خۆی هەبێ چالاکی تایبەتی خۆی هەبێ بە پێویست دەزانم بگەرێمەوە بۆ دەرئەنجامی هەلبژاردنی پەرلەمان کە لە ساڵی/١٩٩٢ بەرێوەچوو. بە گوێرەی ئێمە وەکو شتك لە هەل و مەرجێکی نالەبار ئەم هەلبژاردنە کرا، ئەو سەردەم لە مێژنەبوو یەکێتی شورەوی و ئۆردوگای سۆسیالیزم روخابوو، کە کاریگەرییەکی

زۆری لەسەر هەموو حزبە شیوعیەکان لە جیهاندا هەبوو، لەوانەش حزبی ئێمە بوو کە لەگەل ئەوەی خۆی پاراست و ناوی نەگۆری، بەلام کاریگەری لەسەر پێگەی جەماوەری حزب هەبوو ئەو بزاڤە گەرتکاریەش کەرێك لە کاتی هەلبژاردنی پەرلەمان پەردی سەند دوای بۆمان دەرکەوت کە کەسایەتیەکانی ئەم تاقمە بە خەلکیان گوتوە کە دەنگ بۆ شتێك نەدەن بەلکو دەنگی خۆیان بدەن بە پارتە نەتەوەییەکان ئەمانە سەرەرای هەڵسان بە ساختەکاریێکی زۆر لە رۆژی هەلبژاردنەکە کە هەندێ کەس لە دە بنکەی هەلبژاردنەکان دەنگی دابوو ئەمانە بونە هۆکاری ئەوەی کە حزبی شیوعیمان نەیتوانی ٧٪ دەنگەکان بە دەست بێنێ، لەوانەیە بەشداریمان لەبەرەی نیشتمانی پێشکەوتن خواز لەگەل حزبی فاشی بەعسی کاریگەری خۆی هەبێ لەسەر کەمی دەنگەکانمان. چونکە لە سالی/٢٠٠١ دا کەهەلبژاردنی شارەوانیەکان بەرێوەچوو. تەنیا لە هەولێر (١٧) هەزار دەنگمان هێنا لە شاروچەکانی کوردستان پتر لە (٤٠)هەزار دەنگمان هێنا کە دەنگی خەلکی گوند نشینی تێدانەبوو بێگومان دەنگی ناوچەی سلێمانی و گەرمیان و رانیە وقەلا دزێشی لەگەلّ نەبوو، چونکە هەلبژاردنە کە تەنیا لە پارێزگای هەولێر و دهۆك بەرێوەچوو ئەم دەنگانەمان وەرگرت کە لەگەل دەنگەکانمان لە هەلبژاردنی پەرلەمان لەسالی/١٩٩٢ دا جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەل ئەوەش لە هەلّبژاردنی/٢٠٠١ یکیشدا تەزویری زۆر کرا. لەبەر ئەوەی نەختێ باسی داروخانی ئۆردوگای سۆسیالیزمم کرد بە پێویستی دەزانم بۆ چوونی خۆم لە بارەی ئەو دیاردە دەربرم من وا هەست دەکەم کە گورباچۆڤی خائن رۆلێکی گەورەی لە ئەنجام دانی ئەم کارەساتەدا هەبوو دیار بوو ئەم کابرایە بە پێی نەخشەیەکی ژیرانە ئەم خیانەت کاریەی بەرێوە برد لەسەرەتادا لە یەکێتی شورەویدا چەند یاسایەکی باشی دەرکرد بۆ چارەسەر کردنی هەندێ کەم و کوری کە دووچاری سۆسیالزم ببوو لەم ولاتەدا بەم شێوەیە نەختێ خۆی خۆشەویست کرد لە لایەن خەلکی دلسۆز بۆ سۆسیالیزم وەکو ئەو یاسایەی کە ریگا بە جوتیارەکاندا کە زەویەکانی خۆیان بفروشن، کە ئەمە

راستەوخۆ دژی سوسیالیزمە من لەگەل هاوریان زۆر گفت و گومان لەسەر ئالوگۆری یەکێتی شۆرەوی دەکرد کە گۆرباچۆف رۆلی سەرەکی لەم ئال و گۆرانەدا هەبوو هەر ئەو کاتە رام وابوو کە ئەمە لادانە لە سوسیالیزم و هەلگەرانەوە یە بۆ سەرمایە داری لەسەر ئەمە هەندێ هاوری لێم تورە دەبون، دەیان گوت ناگرێ جارێکی تر سەرمایەداری بۆ روسیا و ئۆردوگای سۆسیالیزم بگەرێتەوە من لەو رایە دابوم کە لە توانادا هەیە ولاتی سۆسیالیزم بەردو سەرمایەداری بگەرێتەوە چونکە دەولەتە سەرمایە داریەکان پرو پاگاندەیەکی زۆر گەرم و گور دەکەن دژی سۆسیالیزمی واقعی دەبێ بلێم هاورێ جەلال دەباغیش ئەم رایەی هەبوو ئەو کاتەی لافاوەکە لە ئەوروپای رۆژهەلات هەلسا لە ئۆردوگای کەرەج بووم لە ئێران پێش ئەوەی لافاوەکە هەلستی، گۆرباچۆڤ سەردانی ئەم وولاتانەی کردبوو گوایا هەرەشە لەکار بەدەستانی ئەم وولاتە سۆسیالیزمیانە کردووە کە دەبێ رێگای چاکسازیەکان بدەن. داروخانەکە لە یەکێتی شورەوی نەختێ دواکەوت هەندێ هاورێ وای بۆ دەچون کە لەوەی گۆرانکاری بنەرەتی روو نادا. بەلام من رام وابوو کەلە یەکێتی شورەوەی گۆرانکار یەکە خراپ تر دەبێ چونکە لە بنەرەتدا پیلانەکە دژی یەکێتی شۆرەوی دارێژراوە و پالەوانی ئەم پیلانە گورباچوفە ئەمەرای من نییە بە تەنیا بەلکو رای کۆمەلە کەسایەتیکی تریشە لە ناو ئەمانە هەندێ لەو کەسایەتیانەشە کە دژی یەکێەتی شۆرەوی بوون لێرە ئامازە بەرای دانەری کتێبی ململانێیە نێو دەولەتیەکان لە سەدەی بیستەم دا دەکەم کە نوسیویەتی ((دەتوانین کۆتایی هاتنی شەری سارد بەشێوەیەکی باشتر راڤەبکەین کاتی لە هەرسێ شێوەی هۆیەکان رامێنین خێرا کەرو راستەوخۆ نیوندی و قوول و یەکێك لە گرینگترین هۆیە خێرا کەرەکان لەبەر کۆتاهێنانی شەری سارد کەسێك بوو بەناوی (میکائیل گەرباچوف) لەوانەیە هەندێ کەس بپرسی چۆن تەنیا کەسێك دەتوانی دەولەتێکی گەورەی وەکو یەکێتی شۆرەوی بروخێنێ کە لەلایەن حزبێکی بنکە فراوانی خاوەن ئەزمونێکی دریژ بەرێوە دەبرا بەرای من سکرتێر لە حزبە شیوعیەکان رۆلێکی گەورەی هەبوو لەبەرێوەبردنی

کاروباری دەوڵەت و حزبدا ئەمە لە لایەکی تریش گۆرباچۆڤ پێش ئاشکرا بوونی پێناسەی راستەقینەی توانی هەندێ کەسایەتی هەڵپەرستی وەکو یەڵسن و حەیدەر عەلییێف وهی تریش بۆلای خۆی رابکێشی. گۆرباچۆڤ دەیویست ئەم پیلانە لەسەر ئاگرێکی کز بە ئەنجام بگەینی بەلام هەڵگەرانەوە سەربازیەکە دژی گرباچوڤ بووە هۆکاری ئەوەی کێشەکە زوو یەکلا ببێتەوە. دیار بوو هەڵگەرانەوەکە باش رێك نەخرابوو، سەرکردەکەی دوو دل بوو، دەست پێشخەریکی توند و تیژ دژی ئەو خۆپیشاندانەی کە یەڵسن بەرێوەی دەبرد بەکارنەهێنا. ئەمە بوە هۆکاری سەر نەکەوتنی هەڵگەرانەوە کە گرباچوڤیش لەم هەل و مەجە ناسکەدا، حزبی شیوعی هەڵوەشاندە وخوشی دەستی لەکارکێشایەوە. بەم شێوەیەش رێگای لەبەردەم یەڵسنی هەمیشە سەرخۆش والأکرد کە حکومەتێکی نوێ دابمەزرێنی و خۆشی بکاتە سەرۆك کۆمار. بە داخەوە نە سەرکردایەتی حزب و نە پەرلەمان هەولێکیان نەدا بۆ راگرتنی ئەم دارو وخانەی سیستەمی سۆسیالیزم لە یەکێتی شۆرەویدا. پەرلەمان لە دوای دوو سال ئەنجا پەناگیری دەست پێکرد دژی دەستەلاتە سەرمایە دار یەکەی یەڵسن، ئەویش وەکو هەموو سەرمایەدارێکی داخ لە دل بالەخانەی پەرلەمانی دایە بەر تۆپ و ژمارەیەك ئەندامی پەرلەمانی لە ناو بنایەکە دا کوشت. بەم کردەوە دیکتاتۆریانەشی راپەینی پەرلەمانی روسیای کپ کردەوە شایەنی باسە گرباچوفی خائن بەدەمی خۆی ئاشکرای کرد کە ئەم هیچ باوەری بە بیرو باوەری کۆمۆنیسی نەبوە هەمیشە هەولی داوە ئەم سیستەمە بروخێنی بەم کارەشی دەری خست کە ئەم لە سەرەتاوە تەقەلای کردووە بۆ روخاندنی سیستەمەکە نەك هەولی چاکسازی داوە بەلام بە دەستیەوە نەهاتووە وەکو هەندێ کەسایەتی لەسەر کردەکانی حزبە کۆمۆنیستەکان لێکی دەدەنەوە لە راستی دا روخانی یەکیەتی شورەوی و ئۆردوگای سوسیالیزم لە ئەوروپای رۆژهەلات زیانیکی زۆر گەورەی بە بزافی کۆمۆنیستی و چینی کرێکارانی جیهان و جوولانەوەی گەلانی ژێر دەستە گەیاند، بەلام ئەمە واناگەیەنێ بیروباوەری سۆسیالیزمی هەرەسی هێنا و سەرمایەداری بە نەمری

دەمینێتــەوە، چـونکە تــاکو چەوسـانەوەی مــرۆڤ لــە لایــەن مرۆڤێکــی ترەوەمــاوە بیروبــاوەری سۆســیالیزمیش هــەر درێــژ دەبــێ، لــە نــاو چەوســاوەکانیش تێکۆشــان هــەردەمینێ لــە پێنــاو ژیــانێکی باشــتر و ســەر بەرزانــەتر (بیروبــاوەری مارکسیز - لێنینیــزم)ش وەکــو زانســتی شــۆڕش و بنیــات نــەری سیســتەمی سۆســیالیزم بــردوی زانســتی خــۆی هــەرگیزاو هــەرگیز لــە دەســت نــادات. بەتایبــەتی ئەگــەر گۆڕانکاریــە سیاسی و سەربازی و ئابووریەکان لە روانگەیەکی واقع بینیــەوە بخوینینــەوە، بۆمــان دەردەکەوێ کە سەرمایەداری دوای رووخانی ئۆردووگای سۆسـیالیزم کـە جـارێکی تـر بودوە سیستەمێکی جیهانی هیچ خێرو بێریکی پێشکەش بـە کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی نــەکردووە بــە پێچەوانەوە شــەرو شــۆر زۆر زیــادی کــردەوە و قوربانیــەکانی جەنگــە هەرێمایــــەتی و خۆجێیــــەکان لــــە ژمــــاردن نایــــەت، رژێمــــە دیکتاتۆریــــەکان و عەسکەرتارییەکان لە جاران درندانەتر رەفتار لەگەڵ گەلانی خۆیان دەکەن مەترسی تیرۆریش بومتە مەترسییەکی جیهانی و مەترسی ئەوە هەیە کە جـەنگێکی جیهـانی نــوێ بــەرپابکرێ، ئەگــەر نــەختێکیش بــۆ دواوە بگەرێنیــەوە بۆمــان دەردەکــەوێ کــە زۆرینەی ئەم تاقمــە تیرۆریــستانە کــاتی خــۆی ئــەمریکا دروســتی کــردون و یارمــەتی داون دژی وولاتە سۆسیالیستەکان وەکو تاقمەکــەی قاعیــدە و تاڵبــان لــە ئەفغانــستان لەروی ئابوریش وێرای ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیــە مەزنــەش دواکــەوتنی ئــابوری و هەژاری لە پانتایەکی فراوانی جیهاندا تەشــەنەی کــردوە لــەو بــەجیهانی بونەشــدا - عەولەمــە - بــە تــەنیا دەوڵەتــە ســەرمایەدارە گەشەســەندوەکان و کۆمپانیایــە مۆنۆپۆڵەکانیان کە سنور بەزینن کەلکیان لێ وەرگرتــوە لــە ســەر حیــسابی هــەژاری و بەشمەینــەتی ولاتــە دواکــەوتودەکان و چــینی کرێکــاران لــە هــەموو جیهانــدا. دوای هەلبژاردن کە وەکو باســم کــرد تــەنیا دوو حزبــە زلهێزەکــە دەنگــی پێویــستیان هێنــا ئەوەی کە پێویستە بزانــرێ بــزاڤ دیمــوکراتی ئاشــوری تــوانی چــوار کەســایەتی خــۆی بگەیەنێتــە پەرلــەمان و دوای رێکەوتنــە دوو قوڵییەکــەش هــەر دوو حزبــی زلهێــز نەختێ لەخۆیان بایی بوون وایــان دەزانــی کــە ئیــتر هــیچ کەندوکۆســپ لەبــەر دەمــی

گـەلی کوردسـتان نـەماوە، کـە وبگـات بـە ئاواتـەکانی و کیـانێکی سـەربەخۆ بەسـەروکایەتی ئـەوان دابمـەزرێنی بۆیـە تـا سـنورێکی هەسـت پێکـراو بـەرەی کوردستانی و حزبەکانی دیکە یان پشت گوێ خست، بەلام بەداخەوە زۆری نەبرد کە ناکۆکیەکانیان سەریان هەلدایەودو روداوی دلتەزینی قەلادزی بوبە هۆکاری داگیرسانی شەری ناوخۆیی ئەو شەرە نەگریسەی کە زیانێکی گەورەی بە هەردوو حزبەکە و هەموو بزافی ئازادیخوازی گەلی کوردستان گەیاند.حزبی شیوعی کوردستان لە یەکەم رۆژی هەلگیرسانی ئەم شەرە ناوخۆییە کەوتە جم و جوولێکی گەرم و گوور بۆ راگرتنی شەرەکە بەلام بەداخەوە شەرەکە وێرای هەول و تەقەلای حزبە کوردستانیەکان هەر درێژەی کێشا، چونکە دیاربوو دەولەتە هەرێمایەتییەکان و رژێمی دیکتاتۆری بەغدا و هەندێ کەسایەتی لە سەرکردایەتی هەردوو حزب ئاگری شەرەکەیان خۆش دەکرد تەنانەت هەولی هەندێ دەولەتی زلهێزیش وەکو فەرنسا و ئەمریکا نەیان توانی کارگێریکی زۆر بۆ راگرتنی شەرەکە بکەن. شەرەکە ماوەێکی درێژ خایاند هەر لەسالی/١٩٩٤ رەوە تا سالی/٢٠٠٠ بەلای کەمەوە لە ئاکامی ئەم شەرەش کە هەموو گەلی کوردستان لێنارازی بوو کوردستان بەسەر دوو هەرێم دابەش کرا هەرێمی سۆران وهەرێمی بابان هەندێ کات شەری راگەیاند رۆلێکی زۆر نزمی بە خۆوە دەبینی کە ببوە چێگای بیزاری خەلك هەر بە هۆکاری ئەم شەرە هەندێ جار هەریەك لەم حزبە هەلویستی وایان لە خۆیان نیشان دەدا کە زیان بەخش بۆ بەناوبانگی نەتەوەکەمان، وەك رێگادان بە سوپای ئێران بۆ هێرش بردنەسەر بارەگای حدکا لەلایەن یەکێتی بە رێگای سلێمانیەوە بەردو دەوروبەری کۆیی لە هاوینی سالی/١٩٩٦ دا هەر چەندە ئەم هێرشە نەیتوانی زیانێکی ئەو تۆ بەم حزبە بگەینێ هەروەها هەلسانی پارتی بەهێنانی سوپای داگیرکاری رژێمی بەعس بۆ داگیر کردنەوەی شاری هەولێر و دەرکردنی یەکێتی لەم شارەدا کەبووە هۆکاری دانەبەر تۆپی بالەخانەی پەرلەمانی کوردستان ە تالان کردنی بارەگای هەندێ حزبی کوردستانی لەوانە بارەگای م.س حزبی شیوعیمان لە راستی دا ئەم دوو هەلە

گەوردیە ئازارێکی دەرونی قولیان لە دل و هەناوی گەلەکەمان پەیدا کرد ئەم ڕووداوەش هەر لە سالی/١٩٩٦ هاتە پێشەوە دوای هەلگیرسانەوەی شەری ناوخۆیی لە نێوان هەردوو حزبەکەوە مەبەستم لە تۆمار کردنی ئەم دوو ڕووداوە ناخۆشە ئەو نییە کە برینە کۆنەکان بکولێنمەوە، بەلکو بۆ ئەوەی نەوەکانی دوا ڕۆژمان پەند و عیبرەت لەم دوو هەلە گەوردیە وەربگرن و جارێکی تر ڕێگا نەدەن هەلەی لەم جۆرە دووبارە ببێتەوە. هەر لەسالی/١٩٩٦ دا ڕژێمی بەغدا موافقەتی کرد لەسەر ئەو بریارەی ئەنجومەنی ئاسایشی نیو دەولەتی کە ڕێگا دەدا نەختێ نەوتی عیراق بفرۆشرێ بۆ دابین کردنی ئازوقەو دەرمان بۆ گەلی عیراق شایەنی باسە ئەم بریارەی نەتەوە یەکگرتوەکان لە سالی/ ١٩٩١ ەکەوە دەرچوو بوو، بەلام ڕژێمی دیکتاتۆری بەغدا بەوە ڕازی نەبو کە بریارەکە لە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان بەرێوەچێ، بەلام دوای تێپەر بوونی ئەم چەند سالە کە گەلانی عیراق بە گەلی کوردستانیشەوە دووچاری هەژاریکی قورس و برسیەتێکی ڕاستەقینەوە بونەوە ڕژێم ناچار بوو سەر بۆ ئەم بریارە بنوێنی لە ڕاستیدا جیبەجێ کردنی بریارەکە بووە هۆی بو ژیاندنەوەی خەلکی هەژاری عیراق کە بەشێکی باشی خۆراك بەم پارەیە دەکراو بەسەر دانیشتواندا دابەش دەکرا بێجگە لەمەش هەندێ پارە دەمایەوە درا بە ڕژێمی بەغدا و بە حکومەتی هەرێمی کوردستانیش کە موچەی کارمەندانی لێی دەدرا دابین کردنی بەشە خۆراکێکی بۆ دانیشتوانی عیراق تا ئیستاش هەر ماوە هەر چەندە دابەش کردنەکە ڕێك و پێك نییە ئیستاش کرینی ئازوقەو دەرمان دەبێ بگەرێمەوە بۆ سالی/١٩٩٣ لەو سالەدا کۆنفرانسی کۆمیتە خۆجیەکان کۆتاهات بۆیە لە مانگی حوزەیرانی ئەو سالە کۆنگرەی دووەمی ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی عیراق لە هەرێمی کوردستان بەسترا، دوای ئامادەکردنی بەلگە نامەکان لە لایەن م.هەرێمی کوردستانەوە کۆنگرەکە زیاتر لە دە ڕۆژی خایەند و گفت وگۆیکی تێرو تەسلی بەنگەنامەکان و هەل و مەرجی کوردستان و ئەو بیرو باوەرانەی دوای ڕوخانی ئۆردوگای سۆسیالیزم هاتبونە پێشەوە ڕێگا بە هەموو ئەندامانی کۆنگرە درا، کە بەو

پەری ئازادیەوە بیروڕایەکانی خۆیان دەربڕن لە لایەن زۆربەی ئەندامانی کۆنگرە ڕەزامەندی دەربڕا، لەسەر بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆیی حزبی شیوعی کوردستان هەلبژێرامەوە، بەلام لەبەر نەخۆشی نەمتوانی لە کۆنگرەی هەشتەمینی دا بەشداری بکەم، و نامەیکم بۆ کۆنگرە نووسی و هۆکاری ئامادە نەبووم روون کەردوە و دەرم خست کە خۆم بۆ ئەندامیتی ک.ن ناپالیوم بە هۆی تەمەن و نەخۆشیم. لەو کاتەی ئەندامی م.س بەم لە چەند بوارێك دا کارم دەکرد وەکو ڕاگەیاندن کە ماوەیکی درێژ سەر نووسەری ڕێگای کوردستان بووم دوای بە پرسیەتی لێژنەی ڕێکخستنم پێسپێرا دوای ئەویش بومە بەرپرسی لێژنەی هزری کە لەو ماوەیەدا بەرێك و پێکی گۆڤاری هزریمان دەردەکرد دوا پلەشم لەم س.بەرپرسی پەیوەندیەکان بوو، لەم هەموو بوارانەدا بەو پەری توانامەوە کاروباری سەر شانم بەرێوە دەبرد. لەم ماوەیەدا وێرای ئەرکە حزبیەکانم لە بوارەگشتیەکانیش کارم دەکرد بۆ نمونە تەفقەلایکی زۆر دلسۆزانەم دا، بۆ راگرتنی شەری ناوەخۆیی لەگەل کەسایەتیەکانی حزبەکانی دیکەوە کە لە شەری ناوخۆیی دا تیوەنەگلا بونی هەروها بەشداریم لە کۆنگرەی کۆمەلە حزبیکی شیوعی وەکو حزبی شیوعی یونانی و سوری – کۆمەلەی خالد بگداش – و حزبی پێشرەوی سۆسیالیتی لە وولاتی رۆژئاوا – مغرب – لە کۆنگرەی حزبی شیوعی سوریا و لە سەر داوای نوینەرە کوردەکان، کە لە نیوەی ئەندامانی کۆنگرە زیاتر بوون محازرەیکم لە بارەی تاقیکردنەوەی کوردستانی عیراق پێشکەش کردن کە جێگای رەزامەندی ئامادەبوان بوو لەو کۆنگرەش کە وتاری یکشم خوێندوە چەپلە رێزانێکی زۆریان بۆ کردم ئەمە وێرای بەشداریم لە کۆنگرەی حزبە کوردستانیەکان وەکو پارتی و یەکگرتوی ئیسلامی و بزوتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستان و کۆنگرەی یەکەمینی یەکێتی لەسەرەتای سالی/١٩٩٢ دا شایەنی باسە کە لەسەفەرەکانم بۆ سوریا هاوڕێ ئەبو داود سکرتیری داوای لێی کردم کە لە قامیشلی چاوم بە حزبە کوردستانیەکانی سوریا بکەوی هەل و مەرجی عیراق و کوردستانیان بۆ باس بکەم یەك دوو جاریش لەگەل ھ.کریم

چاومان بە سەرکردایەتی ئەو حزببانە کەوت و بە درێژی باسی هەل و مەرجی کوردستان و عیراقمان بۆ کردن ولەیەك لەسەردانەکانمان لەسەر داوای بەرێز عبدالله ئۆجلان ٢-٣ جار لەگەڵی دانیشتین زۆر رێزی لێنان، بەلام وام هەست کرد کە ریکخراودکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، راپۆرتی دا بۆ سەرکردایەتی خۆیان دنوسین و من پێم گوت کە هەر حزبێکی کوردستان تەنیا مافی ئەودی هەیە کە لە وولاتی خۆی رێکخراوە دابمەزرینی بۆی نییە لە بەشێکی دیکەی کوردستان ریکخراوە خۆی دابمەزرینی، چونکە هەر یەکەلە بەشەکانی کوردستان رێکخراوە خۆی دابمەزرێنی، چونکە هەر یەك لە بەشەکانی کوردستان هەل ومەرجی سیاسی و ئابووری خۆی هەیە کەبە هۆی ئەوسنورە دەست کردانە بۆ ماوەیەکی درێژ هوریەکە لەم بەشانە هەل ومەرجی تایبەتی خۆی بۆ دروست بووەحزب ورێکخراوی تایبەتی خۆیان دامەزراندوە. هەر ئەوە کەگەلی کوردستان وحزبو رێکخراوە سیاسیەکانی پێویستە لەسەریان یارمەتیو کۆمەکی براکوردەکانی خۆیان بدەن لەهەربەشی کەلێی بقەومێ. وەفدەکەمان زۆر هەولی دا کە پەکەکە. کە پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ هەمووحزبە سیاسیە کانی کوردستانی بەشەکانی دی ئاسایی بکاتەوە بە تایبەتی لەگەڵ حزبەکانی کوردستانی باشوردا، هەروەها داوامان لێی کرد پەیوەندی پەکەکە .کە لەگەڵ حزبەچەپەکانی تورکیا دروست بکات بۆ ئەوەوی داکۆکی لە مافە رەواکانی گەلی کورستانی تورکیا بکەن، دیارە ئۆجەلان ئەم داوایەی زۆرپەسند کرد. ئەم سەردانە لە هاوینی/١٩٩٧ دابوو. بەلام ئێمە هێشتا نەگەڕابووینەوە کوردستان کە سوپای تورکیا لەشکرکێشی بۆ ناو کوردستانی باشوور کرد، بەەبەستی راونانی پێشمەرگەکانی پ. کە . کە بەلام سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. من وای بۆ دەچم کە جەنراڵەکانی سوپای تورکیا کە ئەوەندە سوورن لەسەر لەشرکێشی بۆ کوردستانی عێراق دا، چونکە لەم کاردیاندا دەتوانن پاردو پولێکی زۆر بدزن. هەر ئەمەش هۆکار ، ئەو قەیرانە ئابووریانەیە کە تورکیا دەمێکە دووچاری بۆتەوە. لەم ٣ — ٤ ساڵەی دوایش کە وئابووری تورکیا لەژێر

دەسەڵاتی حزبی دادو پەرەسەندن ( العدالة والتنمية) دا بوژایەوە، یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی وەستانی لەشرکێشی بۆ کوردستانی عێراق.
دیارە هێشتاش قەیران لە تورکیا درێژەی هەیە، لە نێوان حزبی داد وپەرەسەندو ئەوانەی ناویان لە خۆ ناوە عیلمانی مشت ومڕێکی زۆر هەیە وای بۆ دەچم کە – ئوردوگان – لەترسی عیلمانیە کمە لیستەکان ئەوم بڕیاردی لە پەرلەمان تورکیا وەرگرت بۆ بەزاندنی سنوری هەرێمی کوردستانی عێراق . چونکە لەگەڵ ئەوەی پارتەکەی - ئۆردۆگان - زۆرینەی دەنگی گەلی تورکیای وەرگرت، بەڵام هێشتاش لە سوپای تورکیا دەترسێ. نەوەك کودەتای سەربازی لە دژی بەرپابکەن، لەبەر ئەوەی سوپای تورکیا لە ژێر دەسەڵاتی جەنرالەکمالیستەکان دایە. ئەمەو وا هەست دەکەم کەسەرکردایەتیەکانی حزبی – داد و پەرەسەند – تورکی نەژاد بەرستن، زۆررقیان لە گەلی کوردستانی هەر چوارپارچەکەدەبێتەوە، نەك ئەمانی بەڵکو لە هەردوو سەردەمی عوسمانلی و کۆماری تورکیا هەمیشە دژی مافەرەواکانی گەلی کوردستان وەستاونەتەوە، لە هەموو ئەو رێکەوتنانەی کەدەوڵەتە کۆنەپەرستەکان پێکیان دەهێنا بەشداریان کردووە هەروەکو پەیمانی سعد ئاباد لە ساڵی / ١٩٣٧ داو پەیمانی بەغدای گورکراو لەساڵی / ١٩٥٥ دا هەروەکو کاربەدەستانی تورکا دەیانەوەێ کەڵك وەربگرن بۆ دەست خستنە ناو کاو باری ئێراق و بەتایبەتی کوردستان، ئەوەتا بەئاشکرا رایدەگەیەنێ کە رازی نابێ‌پارێزگای کەرکوك بخرێتە سەر هەرێ ی فی ڵی کوردستان ، بێئەوەی هیچ شەرم لەرای گستی جیهان بکات، کاربەدەستە ئانی تو یا هرە بە عەقلیەتی سەردەمی عوسمانی بیر دەکەنەوە و رەفتاتر دەکەن، کا ەم هەڵس وکەوتانەی رژێمی تورکیا بە توندی لەلامیەن رای گشتی جیها ، ەت دەکرێتەوە. بەڵام جەنەراڵە تورکەکان زۆر کەم بایەخ بە رای گشتی جیهان .د .ن.
دیارە ئەم لەشکرکێشانەی پارەیەکی زۆری تێدەچێ، کەچی جەنەراڵەکان ە ڤویی بەم حەقیقەتە نادەن، لەبەر هەندێ لەوپاردو پولە دەکەوێتە دەستی ڕیان. بۆ نموونە تورکیا لە ساڵی ١٩٨٤ تا ئیستا٢٠٠٠ - ملیار دۆلاری زیانی لێکەوتووە بە هۆی

ئەو جەنگانەی دژی پە٠کە٠کە- بەرپاکردووە هەروەك رۆژنامەی میللەتی تورکیا لەزاری چیچەکەوە بلاوکردۆتەوە کە جێگری سەرۆك وەزیرانی تورکیا تەئکیدی لەسەر کردۆتەوە٠

لە ماوەی دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم، کە دوای راپەرینە مەزنەکەی/ ١٩٩١ وەهاتەپێشەوە، ئێمە وەکو شیوعیەکان ئێراق و کوردستان گەڕاینەوە بۆ شارەکانی کوردستان بۆناو باوەشی جەماوەری خۆمان، بوارێکی باشمان رەخسا بۆ پەیوەندی بەم جەماوەری کە پێش راپەڕین ، پەیوەندیکردن پێیانەوە زۆر ستەم بوو ٠ لەوپێناوەش چەند کادیرێکی کارامەمان لەدەست دا کەناوی هەندێکیان لەم نوسەنەمدا هاتووە٠ بەلام بەداخەوە هەندێ دیاردەی نەریتی لە ناو کۆمەلگاکەمان سەریان هەلدابوو، وەك ئەوەی کەکارکردن لەناو حزبێ بە خۆ بەخش کردن زۆر کەم ببوو هەندێ کەس کە داوات لێ دەکرد بێتە ریزی حزب یەکسەر داوای پارەی لێ دەکردی، ئەم خەسلەتە حزبی بەعسی فاشی دایهێنابوو٠حزبە زلهێزوکانی کوردستانیش درێژەیان دا بەم خەسلەت ناشارستانیەوە٠ چونکە لە راستیدا کار کردن لە حزبدا دەبێ بە خۆبەخشین بێ ٠تەنیا بۆ ئەو هاوڕێیانەی‌نەبێ کەرۆلی کادیری لە ریزی حزبدا دەگێڕێن، دەبێ بلێم ئەمە لەسەردەمی پاشایەتی و قاسم و هەردوو – عارف – وبەعسیش ژیانێکی زۆر کولەمەرگیان دەبردەسەرو، هەمیشە پرۆژەی گرتن و دەربەدەر کردن و کوشتن بوون. لەگەل ئەوەش زۆر بە گورج وگرتن کاریان دەکرد ژمارییکی زۆریشیان لە حزبی ئێمە دا دوجارێ شەهید بوون، لەژێر ئەشکەنجەدانێکی درندانە لە ژیاندانەکاندا هاتن بەتایبەتی لەسەر دەمی کۆتای رەشی هەشتی/شوبات/١٩٦٣و، کودەتای سالی/١٩٦٨وە بەتایبەتی دوای سالی ١٩٧٩ – ١٩٨٠ دا، بەلام لەدوای راپەرین کادرەکان داوایان زۆرە بۆ کە حزبی تووشی قەرانی مالی دەکرد. بە تایبەتی ئەو حزبانەی سەروچاوەیکی دارایی باشیان نییە وەکو حزبی شیوعیمان کە داوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێم لە هاوینی/١٩٩٢دا، کە شەکەی لە گومرك دا بیبەش کرا ئەمەش هۆکارێ بوو کە حزب نەیتوانێ لە

هەلبـژاردنی پەلـەمانی سـالی/١٩٩٢ دا رێـژەییکی باشـی دەنـگ بهێنـی ئـەم شـێوازە لـە حزبایـەتی دانـەك هـەر زیـان بەحزبـە دەرامـەت کەمـەکان دەگـەیێنێ، بـەلکو خـووره شتێکی خراپ رەنگ رێژ دەکات، کە گیانی شۆرشگێری و قوربانی دان لە ناو جەماوەر دا نـزم دەکاتـەوە حزبایـەتی لـە مەیـدانی قوربـانی دان لـە پێنـاوی مافـەکانی گـەل تاسنوریکی مەترسیدا دادەبەزینێ بەپێویستی دەزانم کە ئاماژە بە دیاردەیکی تریش بکەم کە لە ناو حزبەکانی شیوعی سەری هەلدا داوای روخانی شـوردوی و ئۆردوگـای سۆسیالیزم، لە ئەوروپای رۆژهەلات و بوە هۆکاری کال بونەوەی زۆر حزبـی دیکـەش ئەو دیاردەش بەناوی نوێخوازی ناوی دەکرد. راستە بیرو باوەری مارکیزم — لێنینـزم پێویستی بە خۆ نوێکردنەوە هەیە دەبێ ناوە ناوە چاو بە بەرنامەو پێرەوی ناوخۆو رێبازی خۆی بگێرێتەوە ئەگەر هەستی کرد ئەم بەلگە نامەنە کۆن بوون بەلام دەبێ ئـەم گۆرانکاریانـە لـە سەردەسـتی سـەرکردایەتی و کـادیرە لێهاتوەکـان دەسـتمان بـۆ بخەنە سەر کەم و کوریەکان هەر خۆشیان چارەسـەر بـۆ ئـەم کـەم و کوریانـە دەسـت نیشان بکەن ئێمەش بێ بیرکردنەوە ئەم جارە سـەریانە وەربگـرین لـە رێـزی حزبـە شـیوعیەکانمان هـەولی کـار پێکردنیـان بـدەین مـن وا هەسـت دەکـەم کـە زۆرێـك لـەو چارەسـەریانەی هەنووکـە لـەگۆری دان لـە لایـەن ئـەم جـۆرە زانایانـە دەسـت نیـشان کراون، چونکە لەو تەکانەی لە کۆتایی سەدەی بیـستەم دژی بیروبـاوەری سۆسـیالیزم بەتەنیا تەکانیش تونـدو تیـژ نـەبوو بەلکو هێرشیکی ناردواش بـۆ سـەر سۆسـیالیزمی زانستیانە لە یەکێتی شوردوی و ئۆردوگای سۆسیالیزم دا پێردو دەکرا. بۆ نمونە لـەم هێرشدا ناراستەی لێنینزم کرا، گوایا بیرو باوەری لێنینزم توندو تیژ تێدایەوە بەلای دیموکراسـی دانەرویـشتوە پێـشان هێـرش دەکرایـە سـەر سـتالین وبـە بـەکار هێنـانی توندو تیژی تومەت بار دەکرا، بەلام ئەمجارە هیرشەکە لێنینی گرتەوە هـەر چەنـدە ئەوەی بـاش لێنینزمـی خوێندبێتـەوە دەزانـی کـە لێنـینی لـە بـیرو بـاوەری مارکـسی لاینەداوە راستە هەندێ داهێنـانی خـۆی هەیـە لـە تاقیکردنـەوەی حزبـە کریکـاری و کۆمەنیستیەکان لە ماوەی نزیکەی سەدەیەك راستی سەرکەوتوی خۆی سەلماند وەکو

دامەزراندنی حزب بەرێوەبردنی بۆ ماوەییکی درێژ بێگومان حزبە سەرمایە دارەکان لەبەر ژەندیاندا نییە ئەم جۆرە حزبە کریکاریانە لە گۆرەپانی خەباتدا تێبکۆشن، چونکە مەترسی لە دەست دانی دەسەلاتی خۆیان دەکەن لە هەمان ئەو چارەسەرەی کەلێنین بۆ کێشەی نەتەوەکان کە بریتی یە لە داننان بە بریاردانی چارەنووسی خۆیان بە مافی جیا بونەوەش و دامەزراندی دەولەتی سەربەخۆی خۆیان دەربارەی دیموکراشیش لێنینی دەنوسی کە (هەر کەسی وا بیربکاتەوە کە دەتوانی سۆسیالیزم بە شێوەیەکی نا دیموکراسانە دابمەزرینی هەلەیەکی زۆر گەورە دەکات) ئەم نوسینینەی دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری گەورە نووسیوە لە کتیبە بەناو بانگەی (دوو پلان بۆ شۆرشی نیشتمانی دیموکراتیەوە) من لێرە دابەم بیتوانیەم وەکو تاکە کەسی بۆم ناکرێ ردی هەموو نوسەرە بر جوازیەکان بدەمەوە کە هێرشێکی نارەوا یان بردوتە سەر ئەم مامۆستایە لێهاتوەی چینی کریکار بەلکو ئەمە ئەرکی حزبە کۆمونیستی ئەو چەند دەولەتە سۆسیالیزمەیە، کە ئیمپریالیزم جیهانی نەتیوانیوە لە نیو ببات وەکو چین و کۆریای باکورو ڤیتنام و کوبا.

من وام هەست کرد کە روخانی یەکێتی شوردەوی و ئۆردوگای سۆسیالیزم لە ئەوروپای رۆژهەلات، بەشێوەیکی زانستیانەو لەبەر رۆناکی میتودی مارکسەوە دراسە نەکراوە، بەلکو وەکو بومەلەرزەیەکی ناکاو هەلسو کەوتی لەگەلدا کرا ئەوە بوو کە هەندێ لەسەر گردەی ئەو حزبانە روخان بەیەك جارەکی لە گۆردپانی خەباتدرایان ئیستاش هەندیکیان رۆلی گرباچوفی خاین وەکو پێویستە هەلیانە سگاندوە، بەلکو هۆکاری سەرەکی داروخانەکە بۆ کەم و کوری یەکێتی شوردەوی دگەرێنیتەوە، من نکولی لە بوونی کەم و کوری لە یەکێتی شوردەوی ناکەمەوە، بەلام وای بۆدەچم کە رۆلی سەرەکی لەم داروخانەدا بۆ گۆرباچۆف دەگەرێتەوە خۆشی دانی نا بەوەی کە هەر لە سەرەتای هاتنی بۆ نیو رێزی حزبی شیوعی یەکێتی شورەویەوە هەولی داوە یەکێتی شوردەوی بروخینی هەر ئەوەندەی نەگوتوە کە نووکەری ئەمریکابووە. ئیستاش وەکو راپرسەکان پیشانی دەدەن زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی روسیا پشتگیری

سۆسیالیزم دەکەن، چونکە لە ژێر سایەی سۆسیالزم دا باشتر لە هەنوکە ژیانیان بەسەر دەبرد، بەلام پشتگیری ئەمریکا و هەموو دونیای سەرمایە داری وای کردوە کە رژێمە کە نەروخێ ئەمە وێرای ئەوەی کە حزبی شیوعی یەکگرتوی روسیا نەیتوانیەوە هەموو سۆسیالیست و شیوعیەکان لە دەوری خۆیدا کۆ بکاتەوە سەرەرای هەندێ هەلەی کە کردی وەکو پەیوەندی بەستن لەگەل هەندێ دەولەتی دیکتاتۆری وەك رژێمە لە گۆرنراوەکەی سەدام لەمەدەر دەکەوێ کە سەرمایەداری نەیتوانیوە کە گیروگرفتی کریکاران و گەلانی دواکەوتو و درێژە کێشانی جەنگە خۆ چییەکان کە قوربانیکی زۆری لێکەوتۆتەوە چارەسەر ئەمە جارێکی تر ئەو راستیە دوو پات دەکاتەوە کە تەنیا سیوسیالیزم جێگای ئومێدی گەلانە بۆ دوا رۆژێکی پر لە خۆشی و دیموکراسی وپێشکەوتنی کۆمەلایەتیەوە.

لە سالی/١٩٩٨ دا ئەمریکا لەگەل سەرکردەی هەردوولا پارتی ویەکیەتی دا لەولایەتە یەکگرتوەکان کۆبوەوە بۆ ئەوەی رێکیان بخاتەوە و کۆتایی بەم شەرە نیوخۆیەی کوردستان بهێنی لەوەی هەردوکیان رێکەوتنیکیان لە ناوخۆیاندا مۆر کرد بەم شێوەیە شەرەکە کەمێ هێور بووەوە، بەلام بەیەك جاری نەوەستا بارو دۆخەکە ئاسایی نەبوەوە تاکو سالی/٢٠٠٠ کە دەستیان کرد بە کۆبونەوەی دوو قۆلی لەنێوان خۆیاندا، کە هەندێ جار هاورێ عزیز محمد لەم کۆبونەوانە ئامادەدەبوو دوای روداوە دلتەزینەکەی نیویۆرك لەلایەن تاقمەکەی قاعدە ئوسامە بەرێوە برا ئەمریکا بریاری دا کە عیراق و چەند ولاتێکی تریش بخاتە ناو لیستە رەشەکەوە کە دەبێ لە نیودا ببرێن، چونکە بە بۆچونی ئەمریکا ئەم ولاتانەی بە مەبەستی لەسەر ئاشتی جیهاندا تاوان باردەکرد ئەوە بۆ ئەمریکا لە مانگی ت١ / ٢٠٠١ دا هێرشی کردە سەر ئەفغانستن و توانی لە ماوەی ٢-٣ مانگدا رژێمی تالیبان بروخێنی کە رژێمیکی زۆر کۆنە پەرست و دواکەوتوبو رێگای بە لاوازترین هەناسە دیموکراسی نەدەدا و ببوە مەکوی کۆبونەوەی تیرۆرستان لە هەموو جیهانداو محمد نجیبی سەرۆك کۆماری دیموکراتی ئەفغانستان کە دەست گیر کرابوو بە شێوەیکی درندانە لە سیدارەدا هەر

چەندە لە پاراستنی نەتەوە یەکگرتوکان دابوو، بەلاّم رژێمی سەرمرۆی تالیبان هیچ بایەخێکی بەنەتەوە یکگرتومکان نەدا و هیچ نرخێکی بۆ بریارمکانی دانا ئەنا نابێ ئەو راستیەش لە بیر بکەین کە ئەمریکا یارمەتیکی زۆری داوە بە تاقمە ئیسلامیەکانی کە پێش تالیبان دمستیان بەسەر ئەفغانستان داگرتبو، تەنیا چەکی قورسیشان ددانی ودك گوللە تۆپی ستینگەر و چەکی خستنە خواردوەی فرۆکە جەنگیەکان کە پێی ددلێن (ستینگەر) تەنانەت حکومەتی ئێران کە ددولەتێکی ددولەمەند و دانپیا نرا بوو، ئەم چەکانەبی نەبو، بۆیە ددچو لە تاقمە ئیسلامیەکان دەکریەوە لەمە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمریکا تا چ سنوریك چەکی قورسی داوەتە ئەم تاقمە ئاژاوە گیرانە، کە هەر ئەوە بوو هۆکاری روخاندنی دەسەلاتی حکومەتی دیموکراتی ئفغان دەبێ ئاماژەش بەو راستیە بکەم کە ئەم تاقمە ئیسلامیان لە پێناوی ئایینی ئیسلام ئەم جەنگەی دژی کۆماری دیموکراتی ئەفغان هەلنەگیرساند بوو یا بە مەبەستێکی نیشتمان پەروەری هەلگیرساندبێ بەلکو ئەم جەنگە دژی یاسای چاککردنی کشتوکالی بەر پاکرا، چونکە سەرکردەی ئەو تاقمانە بریتی بوون لە دەرەبەگە هەرە گەورەکانی ئەفغانستان کە دژی یاسای کشتوکال بوون ئەم جەنگە بۆ هەلوەشانەوەی ئەم یاسایە بوو ئەمە بۆ چونی رۆژنامەی – اطلاعات – ی ئێران بو کەکاتی خۆی بە زنجیرەك وتار بلاوی کردوە لەمەش دەردەکەوێ کە بنەچی هەموو جەنگەکان بە جەنگی یەکەم و دوومی جیهانیش هۆکاری ئابووری لە دواوەیە، جێگای دلخۆشی زۆربەی لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و جەماوەریش کە کۆتایی بەم شەرە ناوخۆیە نەگریسەوە هات، هەر چەند نەختێ بەسستی بوو، بەلام یەکخستنەوەی رێزەکانی گەلی کوردستان جێبەجێ کردنی مافەرەواکانی گەلی کوردستان بو لە پێشەوەی ئەو مافانەش گێرانەوەی پارێزگای کرکوك و کۆمەلە قەزاو ناحیکی دیکەیە بۆسەر هەرێمی کوردستان و پەیردوکردنی پەیوەندیکی برایانە لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی فیدرالی لە بەغدا دا جێگای ئاماژە پێکردنە کە پێویستە ئەو یەکگرتنەوە هەر لە نێوان هەر حزبە

فەرمان ڕەواکە قەتیس نەکرێ، بەڵکو حزبەکانی دیکەش بە تایبەتی ئەوانەی لە شۆڕشی گەلەکەمان بەشدار بوون و قوربانیان داوە، بۆ هێنا گۆڕی ئەم بارودۆخەی هەنوکەی کوردستان و عیراق دا، بۆیە بواردان بەم حزبانەش بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری کوردستان کاریکی بە نرخە چونکە متمانەی جەماوەری کوردستان بە حکومەتەکەی خۆی بەهێز دەکات و دەبێتە هۆکاری چارەسەرکردنی کەم و کوڕیەکانی حکومەت بە تایبەتی گەندەڵی کارگێری و دارایی کە دەردێکی کوشندەیە، ئەگەر بە خێرایی چارەسەر نەکرێ دەبێ ئەو ڕاستیەش هەرگیز لە بیر نەکرێ کە هێشتاکوردستان دوژمنی لە ناوەوەی عیراق و دەرەوەی دا زۆرن تەنیا ڕیگاش بۆ پوچەل کردنەوەی پیلانەکانی ئەم نەیارانە یەکێتی ڕیزەکانی گەلی کوردستانەو وای بۆ دەچم ئەگەر یەکیەتیە لەسەر بنەمای دانانی بە مافەکانی هەموو لایەنەکان و بەڕێوەبردنی لەسەر شێوازێکی دیموکراتیانەبێ ئەم گەلەی ئێمە ئامادەیە بۆ داکۆکی کردنی لە قەوارەی سیاسی خۆی و جێبەجێ کردنی گشت مافەرەواکانی من ڕەخنەشم هەیە لەو پروگرامە ئابوریانەی حکومەتی هەرێم، چونکە ئەگەر نەڵێم پرۆژەی بەرهەمهێنەری هەرتیا نییە، بە دڵنیاوە دەڵێم لەم جۆرە پرۆژانە لە پرۆگرامەکانمان زۆر کەمن بۆیە پێویستە بایەخی زۆر بەم پرسە بدرێ لەگەل بایەخ دان بە کەرتی کشتوکاڵ لە ڕێگای بەشداری کردنی جوتیارە خەبات گێرەکان لە دارشتنی پرۆگرامە کشتوکالیەکان و بەڕێوەبردنیان و دوور خستنەوەی حزبایەتی بەر تەسك لەم بوارە و بوارەکانی تریش وە. هەروەها بە پێویستی دەزانم بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و بوژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری بە پلە یەکەم بەهێزو وزەی جەماوەری کوردستان ببەسترێ بە پلەی دومیش پشت بە سەرمایە دارانی ناوخۆی ببەسترێ وە ئەوەندە بایەخ بە سەرمایەی بێگانە نەدەن چونکە سەرمایە و کۆمپانیە بێگانەکان ئەوەندە بە تەنگ ئاوەدان کردنەوەو بوژاندنەوەی کوردستان نین، بەڵکو ئەو چینەی دڵی بە ولاتەکەی دەسوتێ هەر چینەکانی چەوساوەن با ئەوەندەش پابەندی ئامۆژگاریەکانی سەندوقی دراوی جیهانی نەبین، هیچ ولاتێك

کەلکێکی ئەو تۆیان لە ئامۆژگاریانەی ئەم سندوقە وەرنەگرتوە، ئەوەتا لەوکاتەوەی عیراق و هەرێمی کوردستان پابەندن بەم سندوقەو دراوی نێو دەولەتی بوون و ئامۆژگاریەکانی جێبەجێ دەکەن گرانیکی قورس دووچاری عیراق بە کوردستانیشەوە بۆتەوە. بەراستی نە لە سەردەمی رژێمی سەدام وەنە لە تاقیکردنەوەی بەرێوەبردنی خۆ خۆیی کوردستان ئەم جۆرە گرانیەی بە خوود نەدیوە کە لە کاربەدەستان دەپرسی هۆکاری ئەم گرانیە چییە؟!! لە وەلامدا دەلێن ئەمە بازاری ئازادە. هەر چەندە من لەگەلبازاری ئازاد دا نیم، بەلام لە ولاتە پێشکەوتوەکانی سەرمایەداریش بەم جۆرە دەرگا لە بەردەمی بازاری ئازاد دا نەکراوەتەوە کە بەم شێوەیە یاری بە قوت و جل و بەرگی خەلکی هەژار بکەن بەلکو جۆرە چاودێریك – سانور – لەسەر بازار هەر هەیە بە بۆ چونی من ئەمە بازاری بەرەللایە نەك ئازاد، هەروەها زۆر لە بەرپرسە گەورەکان دەبیستم کە ئەوان لاینگیری بە جیهانی بوونن رونیشی ناکەنەوە کامە بە جیهان بوون – عەولەمە – یان مەبەست بە جیهان بوونی ئاسایی کە بەرەو بە جیهانی بۆنیکی درندا نەببەن ئەوەی من تێبینی دەکەم ئەوەی دەبوری بە جیهانی بوونی ئەمریکیە کە هیچ خێرو بیری بۆچینە چەوساوەکان و گەلانی دواکەوتوی تێدا نییە، بەلکو بە تەنیا لە بەرژەوەندی کۆمپانیا مونۆپۆلەکانی سنور بەزین دایە وەوای بۆ دەچم ئەم جۆرە بە جیهانی بوونە هیچ بەرژەوەندی ولاتێکی وەکو کوردستان تێدا نییە کە وولاتێکی دواکەوتوە لە رووی تەکنولۆژیای سەردەم و خاوەن ژێر خانێکی ئابووری داروخاوە بە پێویستی دەزانم دوو قسە لەسەر خوێندنی بالاَ بکەم ئەوەی من لە هەندێ مامۆستای زانکۆی (صلاح الدین)م بیستوە رادەی زانستی قوتابیان زۆر نزمە لە ئاستی دا هۆکاری ئەم رادە نزمیەی خوێندنی بالا هەر بە تەنیا ناکەوێتە سەر شانی میری وکارگێری زانکۆ بەلکو بەشیکیشی لە ئەستۆی قوتابیان دایە بەلاَم پێویستە لەسەر میری هەموو پێداویستەکانی زانکۆ دابین بکات بایەخیش بدرێ بە ژیان و گوزەرانی خوێندنی بالاَ زیاتر چاودێری پرۆسەی خوێندن بکات چاودیری لەسەر

مامۆستا و قوتابی خەم سارد دابنرێ وە بەپێی یاسای زانکۆ لێکۆلینەوە یان لەگەل دابکات دوا قسەم ئەوەیە کە پێویستە زۆر بە توندی حزبایەتی تەسك لە ئامادەیەکان و زانکۆ دوور بخرێتەوە، چونکە ئەگەر شرە بیانویك بۆ حزبایەتی بەر تەسك لە بواردکانی دیکە کاری کۆمەلایەتی داهەبێ لەبواری خوێند بەهیچ شێوازیك حزبایەتی بەر تەسك قەبول ناکرێ ئەوەی جێگای داخیشە ئەم حزبایەتیە بەر تەسکە لە زانکۆکانی کوردستان هەیە نمونەی زۆریشم لەبەر دەستە لەم بارەیەوە. دیارە حکومەتی هەرێم لە بواری خزمەت گوزاریە کانیش کەم و کوری زۆری هەیە لە پێش هەموو یانیش تاکو ئیستا کەئەمە ۱۷ سالە نەیان توانیوە ئاریشەی نەبونی کارەبا چارەسەر بکەن، هەروەها دابین کردنی سوتەمەنی لەولاتێکی وەکو عێراق و کوردستان کە لەسەر دەریاچەیێکی نەوت و گازی زۆر گەورەیە، هەروەها ئاوی خواردنەوەی پاك بۆ هەندێ شارو شارۆچکەکان دابین نەکراوە ئەمە وێرای گوندەکان کەم و کوری بورای خزمەتگوزاری زۆر هەیە لە سالی/۲۰۰۲ دا بە دەست پێشخەری هەندێ لایەنی بەر هەلّست کاری رژێمی سەدام و رازی بوونی ئەمریکا بریاری درا، لە کۆتایی/۲۰۰۲ کۆنگرەی بەرهەلستکاری عیراق ببەسترێ شایەنی باسە کە حشع بەشداری لەم کۆنگرەیە نەکرد بەگوێرەی مشت و مرێکی لەسەر بانگێشی پارتی و یەکێتی و دوای مشت و مرێکی توند لە کۆبونەوەی ك.ن بریاری درا بە زۆرینەی دەنگ بەشداری لەم کۆنگرە دا بکەین من و هاورێ ابراهیم صوفی دەستنیشان کراین بۆ بەشداری کردن لەم کۆنگرەی کەلە لەندەنی پایەتەختی ئینگلیز لە کۆتایی سالی/۲۰۰۲ بەسترا لەم کونگرەیەدا هەموو لایەنەکانی بەر هەلستکاری رژێم ئامادە بوون حشع نەبێ گوایا بە درەنگەوە بانگێشت کراوە و لە هیچ چالاکیکی خۆ ئامادە کردنی ئەم کۆنگرەیە رۆلی بۆ داندراوە وام هەست دەکرد کە رێکخراوی حشع لە بەریتانیا رۆلی سەرەکی هەبوو لەم هەلویستەی سەرکردایەتی حشع دا من لەگەل وەفدەکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە رێگای تورکیا رۆیشتم هاورێ براهیمیش لە سویدەوە هات کۆنگرەکە لە یەکێك لە هوتێلە گەورەکانی

بەستراو چوار رۆژی خایاند لەم کۆنگرەی بە درێژی هەل و مەرجی عیراق خرایە بەر باسی و گفت و گۆدا بەرپرسی هەموولایەنە کوردستانی و عیراقیەکان وتاری خۆیان پێش کەش لە وتارەکان ئاماژە بە چۆنیەتی روخاندنی رژێمی سەدام و ئەو سیستەمەی کە دەبێ بۆ عیراق دوای روخاندنی دەست نیشان کرا، لایەنە ئیسلامیە شیعەکان دوو پاتیان کرددوە کە لەگەل ئەوە دانین رژێم بە رێگای هێرشی بێگانە بروخێ بەلکو رایان وابوو کە هێزەکانی بەرهەلست کاری عیراق ئەم رۆلە بگیرن بە یارمەتی و پشت گیری وولاتەکەی دۆستەکانی گەلانی عیراق من وتاری حزبم خوێندەوە کە تەنیا وتارێك بوو کە داوای کرد پارێزگای کرکوك وقەزای ناوچەکانی کورد نشین بخرێنەوەسەر هەرێمی کوردستان کەجێگای رێزو پەسەندکردنی هەموو وەفدە کوردستانیەکان بوو. بە تەنیاوەفدیبەرەی تورکمانی نارازی بوون لەم داواکاریە دا . پێویستەبگوترێ کەخلیل زادەی نوێنەری ئەمریکا ماوەی کۆنگرەلە ئوتێلەکە جێگیربوو، بەلام لە هەمووکۆبوونەوەکا ئامادە نەدەبوو. لە دواکۆبوونەوەی کۆنگرەکە چەند بریارێك وەرگیرا لەمانەپێکەونانی کۆمیتەیەك بۆ بە دوا داچوونی بریارەکانی کۆنگرە، بۆ ئەم کۆمیتەیە هاورێ کەریم ئەحمەد دەست نیشان کرا. بەم شێوەیە کۆنگرە کۆتایی هات.

من کە حەزم دەکرد بچمە وولاتی سوید بۆ دیدەنی مندالەکانم لەوێ ، لەگەلّ کە مام جەلالیش یارمەتیدام بە رێگای سەفارەت خانەی سوید لە لەندەن دا. حکومەتی سوید رێگای پێنەدام بچمە وولاتەکەیان. بۆیە لە ٢٠٠٢/١/١٩ دا ویستم بگەرێمەوە کوردستان، بۆ ئەم مەبەستە فیزای قونسل خانەی تورکیام لە لەندەن دا وەرگرت . کە گەیشتمە فرۆکە خانەی – ئەستەمبۆل – کاربەدەستانی فرۆکەخانەکە رێگەیان پێنەدام بگەرێمەوە کوردستان بەلکو بریاریاندا بمگێرنەوە لەندەن هەرچەندە نا رەزاییم دەربری رۆژی دووەم منیان گەراندەوە بۆ لەندەن، منیش زۆر قسەم لەسەر رژێمی رەگەزپەرستی تورکیا کرد بە رژێمێکی دکتاتۆری نژاد پەرستم تۆمەت بار کردن پێم گوتن بە رێگایەو فرۆکە خانەیە چووم بۆ لەندەن ئێستا بۆ رێگام نادەم

بگەڕێمەوە وولاتەکەی خۆم ؟! هیچ گوێیان پێ نەدام مەفرەزەیەکی پۆلیسیان هێناو پەلکێشیان کردم بۆناو ئەوفرۆکە دەرۆیشت بۆ لەندەن سواری فرۆکەیان کردم. من گومان لە وەفدەکەی بەرەی تورکامانی دەکەم کە لە فروکە خانەی ئەستەمبۆل گوزارشیان دژی من دابێ پێشتریش ئاماژەم بەوە کرد کە باندەکەی بەرەی تورکمانی زۆر دلگران بوون لەو ووتاردی لە کۆنگرەی بەرهەڵستکارانی عیراقم خوێندەوەو داوام کرد کە دەبێ دوای روخانی رژێمی سەدام، پارێزگای کرکوك بخرێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

لە فرۆکەخانەی (لندن) یش تا شەو دوایان خستم بۆ زانینی هۆکاری گەراندنەوە لە فرۆکەخانە – ئەستەمبول – ناردیان بە دوای وەرگێر – مترجم – یك، بە رێگا ئەو هۆکاری هاتم بۆلندن بە رێگای تورکیا بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی بەر هەلستکاری عیراق دوایی ویستم بگەرێمەوە بۆ کوردستان، بەلام کاربەدەستانی رژێمی تورکیا لە فرۆکەخانە رێگایان دام بگەرێمەوە بۆ کوردستان وەبە خورتی منیان گەراندەوە بۆ ئیرە، ئەوانیش جانتای منیان پشکنی پاش ئەوە بەر پرسی ئەم پرۆسەیە گوتی چۆن دەگەرێیەوە بۆ کوردستان ئەگەر دەتەوێ ئیستاکاری پێویستت بۆ دەکەم بۆ وەرگرتنی مانەوەت – اقامە – لیرە لە لندن، بەلام رازی نەبووم بۆ وەرگرتنی مۆلەتی مانەوە گوتم هەول دەدەم بەرێگای سوریا بگەرێمەوە هەر بەم شەوە تەلەفۆنم کرد بۆ هاورێ عباس رۆستەم ئەویش پیاوانە هات بەدواما بردمیەوە بۆ مالی خۆیان لێرە پێویستە زۆر سوپاسی ئەم هاورێیە بکەم کەلەم گەشتەدا ماوەیەکی درێژ لە مالی ئەو مامەوە هەر لە رۆژی دوایدا تەلەفۆنم کرد بۆ هاورێیانی حشع لە لندن کە لەگەل هاورێیانی م.س حشع هەول بدەن بۆ گەرانەوەم بە رێگای سوریا دا هەروەها ئەم رەفتارەی کار بەدەستانی تورکیام بە هەردو سەرکردایەتی حشع و حشعم راگەیاند بەرامبەر ئەو رەفتارە نا مرۆڤانەیەی کار بە دەستانی تورکیا لە هەمان کات دا ئەم هەوالەم لە رۆژنامەی مۆرنینگ ستارو رۆژنامەی حزبی شیوعی قوبرسی بلاوکردەوە دیارە رێگای کوردستان ئەم هەوالەی بلاوکردەوە یان

نا؟! لەو ماوەیەش دا کە مانگ ونیویکی خایاند دوای بە مۆری وەزیری ناوخۆیی سوریا موافقەت کرا لەسەر گەرانەوەم بۆ کوردستان بە ریگای سوریا لەم ماوەیەدا هەر لە مالی کاك عباس و بنەمالەی کاك روف معروف و مالی کچی برام زلیخا مامەوە لیرە بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی ئەمانە بکەم بە تایبەتی خوشکە گەلاوێژی خێزانی کاك روف و زاواکەیان میردی ئاشنا زۆر پیمەوە ماندو بوون ئیتر لە ٢٠٠٣/٣/٤ گەرامەوەی بۆ سوریا لەوێش سەردانی سەرکردایەتی هەردوو حزبی شیوعی سوریام کرد هەردوکیان داوایان لێ کردم ئەگەر ئەمریکا هێرشی کردە سەر عیراق ئێمە وەکو حزبی شیوعی کوردستان و عیراق لایەن گیری حکومەتی عیراق بکەین دژی سوپای داگیر کەری ئەمریکا شەر بکەین منیش لە ولامدا پێم گوتن کە هیچ هاورێیەك بەم پێشنیارەی ئێوە رازی نابێ لەبەر ئەوەی رژێمی بەعس تاوانی زۆر گەورەی دژی گەلانی عیراق بە تایبەتی لە گەلی کوردستان و حشع کردوە نەك وەکو حزب بەلکو وەکو خەلکی بێتاوانی گەلانی عیراق و دەیویست گەلی کوردستان جینوساید بکات؟! بە داخەوە سەرکردایەتی هەردوو حزب ئەم هەلویستەیان هەبو لە سەردانەکەم بۆ لای حزبەکەی یوسف فیصل، کاك یوسف فیصل خۆی هات بۆلام و ئەو پێشنیارەکەی پێشکەش کرد لە قامیشلۆش چاوم بە سەرکردایەتی حزبە کوردستانیەکانی سوریا کەوت ئەوان پشتگیری هەلویستی حشك و حشعیان کرد کە بریتی بو لەوەی کە بە چاکی ئەدەزانی سوپای ئەمریکی بێت و رژێمی سەدام بروخێنی و عیراق داگیر بکات بەلام ئەگەر ئەم کارەی هەر کرد، ریکخراوەکانی حزبمان دەست وەستان ناوەستن بەلکو تێدەکۆشن بۆ رزگار کردنی هەندێ ناوچەی لە ژێر چەپوکی رژێمدان ئیتر ئەوە بو رێکخراوەکانمان لە پارێزگاکانی کوردستان چالاکانە بەشداریان کرد لە رزگارکردنی کرکوك و ناوچەکانی گەرمیان وەکو خانقین و مەندەلی و قەرەتەپەو جەلەولاو گوێرو دیبەگەو مخمور لە پارێزگای هەولێر دا.

وەکو ئاشکرایە لە ماوەی کەمتر لە مانگێ رژێمەکەی سەدام روخاو مـن لـە ٢٠٠٣/٣/١٠ لە سـوریا بـە رێگای فامیشلو گەرامـەوە هێرشـەکەی ئـەمریکا و هاوپەیمانـەکانی لـە ٢٠٠٣/٣/٢٠ لە سنوری کوێتەوە دەستی پێکرد لـە بەسـرا نـەختی بـەرگری هێرشـەکە کرا بۆماوەی چەند رۆژێك لە شوێنەکانی تـر هـیچ بەرنگاریـەکی وای سـوپای ئێـراق نەکرا کە شایانی باس بێت ، لە ٢٠٠٣/٤/٩ دا بەغدای پایتەختی رژێم دەستی بەسەر دا گیراو رژێم روخا.

بەم شـێوەیە ئـەو رژێمـەدکتاتۆرە رەفتـا فاشـی یـە روخـا کـە ٣٥ سـاڵ بـوو کاروبـاری وڵاتی بەئاگرو وناسن بەرێوەبرد، دووجەنگی نا رەوای بەسەر گەلانی ئێران و کوێـت دا سەپاند کە زیانێکی زۆری بـەم دوو گەلـە و گـەلانی ئێـراقیش گەیانـد ، لـە بـواری مرۆڤـی و ئابووریـیـەوە ئەمـە بێجگـە لـەو جەنگـە نارەوایـەی کـە بەسـەر گـەلی کوردسـتانی دا هـەر لەسـاڵی /١٩٧٦ وەسـەپاند بـوو بەهـەموو توانـای دارایـی زۆروزەبەنـدەوە وێـرای توانـای سـەربازی و جاشـە کوردەکـان. کـە لـەم جەنگـەدا هەمووشـێوازی نـا مرۆڤانـەی دەکـار دەهێنـا بـۆ تێکـشکاندنی داکـۆکی پێـشمەرگەی کوردستان کە وڵاتـی خۆیـان ومافـە نەتەوەیـە رەواکانی نـەتوەی خۆیـان دەکـرد. بـە راستی داکۆکیەکی دلێرانەبوو. چونکە نا بەرامبەریـەکی هەسـت پێکـراو هـەبوو، لـە نێوان ووزەو توانـای، پێـشمەرگە بەتایبـەتی بـەکار هێنـانی فرۆکـەی هێلـی کۆپتـەری جەنگی وچەکی کیمیایی ، کە پێشمەرگە بەرامبەر بەم دووچـەکە کوشـەندەیە هـیچ چـەکێکی بورنگاربوونەوەیـنـەبوو. تـەنیاباوەری بـە هێـز نـەبێ بـە مافـە رەواکـانی نەتەوەکەیەوە.

حزبی شیوعی ئێراقیش دوای شـاڵاوە درندەانەکـەی رژێـم لـە نێـوان هـەردوو سـاڵی/ ١٩٧٨، ١٩٧٩ دا دژی رێکخراوەکـانی حزبمـان لـە هـەموو ناوچـەکانی عێـراق دا، بـەبێ ئـــەوەیحزب هـــیچ رەفتـــارێکی دوژمنانـــەی دژی رژێـــم کردبـــێ، حزبیـــشودکو کاردانەوەوداکۆکی کردن لەخۆی وەکو حزێکی دێرینـی ئێراقـی و لـە ئاکـامی فـشاری رێکخراوەکانی حزب کە دووچاری شاڵاوێکی نارەوا بوەوە . ئەمەش راستی ئـەو بـیرو

باوەڕایەی کە مایەتیك لە حزب و جەماوەری گەلەکەومان بوو، کە دەیزانی ئاکامی ئەم بەرە بێبناخەیە بووکە حزب لەگەل حزبی بەعسی ڕەفتار فاشی لە ساڵی / ١٩٧٣ دا مۆری کردبوو. دام دەستگا جاسوسەکانی بەعس و ڕژێمەکەی هەر لە سەرەتاوە کەوتنە کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ڕێکخراوەکانی حزبمان کە بە نیمچە ئاشکرایەك کاریان دەکرد. بۆر ئەوەی ڕژێم هەرکاتێ ویستی پەلاماری ڕێکخراوەکانی بدات، بە ئاسانی بتوانێ پاکتاویان بکات. بەلام بە داخەوە سەرکردایەتی حزب هیچ بایەخی نەدا بە بیرو بۆچوونی کۆمەلە کادیرێکی و جەماوەر کە هەر زوو هەستیان پێکرد، تا هێرشە نا ڕەوایەکە دەستی پێکردژی ڕێکخراوەکانی حزب، ئەو کاتەیش هەندێ کادیری سەرکردایەتی حزب وەکە – ئەبو خەولەو عامر عبداللە رایان وا بوو کە ئەم شاڵاوە هەر کۆتایی دێت و بۆئەم مەبەستەش هەول و تەقەلایەکی زۆری لەلایەن سەرکردایەتیەوە درا بەلام نەگگەیشتنەن دەرەنجامێك لەگەڵ سەدام و دام ودەستگاکەی.
چەنکەدەرکەوت سەدام لەسەر پیلانێکی دارێژراو کاری دەکرد بۆ پاکتاو کردنی ڕێکخراوەکانی حزب و،لەم پلانەشی تا سنورێکی هەست پێکراو سەرکەوتنی بە دەستهێنا. من بەشێکی زۆری ئەم دەرەنجامە دەخەمە سەر شانی حزب کە نابوو بە هیچ شێوەیەك بەرە لەگەڵ حزبی بەعسی ڕەفتار فاشی دا ببەستێ چونکە ئەم حزبە مێژوویەکی درێژی هەیە لە چەوسانەوەی گەلی ئێراق. هەمیشە لەسەر ڕێبازێکی دڕندانە هەلس و کەوتی لەگەڵ گەلانی ئێراق کردووە بە داخەوە تەلەکەبازی ڕژێم سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کە بریتی بوو لە ڕاکێشانی حشع بۆ لای خۆیدا تا پاکتاوی بزافی چەکداری گەلی کوردستان دەکات، ئینجا پەلاماری حشعیش دەدات. چونکە ئەم ڕژێمە دکتاتۆریە و حزبی بەعسی ڕەفتار فاشی ئامادە نەبوو بۆ حزبێکی تر بدات کە بە ئاشکرا ڕەخنە لە هەندێ کارو کردەوەی بگرێ.
لەراستیش هەر وەکو هەندێ کادری حزبی و جەماوەر بیریان لێکردبۆوە ئەوەها ڕژێم هێلی بۆ کێشابوودەرچوو.ڕژێم کە هەستی پێکرد بزافی چەکداری گەلی

کوردستان توانای ئەوەی نەماوە درێژە بە خەباتی خۆی بدات ، دەستی کرد بە پەلاماری حشع لە ناوراستی ساڵی / ١٩٧٨ دا ٠ ئینجا سەرکردایەتی حزب هەستی بە هەڵە گەورەکەی خۆی کردن، کەبریتی بوو لە هاوکاری کردنی لەگەل حزبی بەعسی فەرمان رەوادا، دوای دەرکەوت رژێم دەیزانی لە جەنگێکی جەبهەوی رووبەرووی هێزی ئەمریکا ببێتەوە بۆیە هێزی چەکداری رژێم زوو وازیان لە روو بەرو بونەوەی جەبهەوی هێنا دوای ماوەیەك رێکخراوی بەعس و بەشێك لە هێزی چەکداری رژێم دەستیان دایە شەری پارتیزانی هەلوێستی ئەمریکاش بەو ساردو سریە بەرامبەر رێکخراوەکانی حزبی بەعسی و ئەفسەرەکانی پایە بەرزی سوپای عێراق رێکخراوەکانی بەعس لەناو خەلك سوپا دا خۆیان رێکخستەوەو دەستیان کرد بە پەلاماردانی دام و دەزگاکان لەولاشەوە رێکخراوی قاعدەی سەر بە ئوسامە بن لادن بە هاوکاری لەگەل پاشماوەکانی بەعس ئەوانیش دەستیان کرد بە هێرش بردنە سەر دام و دەزگاکانی سیستەمی نوێ عیراق کە راستەوخۆ لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە بەرێوە دەبرا بەپێی بریاری ئەنجومەنی ئاسایشی نیو دەولەتی ژمارە - کە ئەمریکا بە داگیرکەری عیراق دانا تەنانەت بریمەری حاکمی عیراق وگارنەری پێش ئەو هیچ بە هایکیلیان بو حزبە بەرهەلست کاریانی عیراق و کوردستان دانەنا تا شەری ناوخۆیی دەستی پێنەکرد بوو، بەلام سەر هەلدانی ئەم شەرە ناچاری کردن کە بایەخ بەو حزبانە بدەن ئەوە بو کە ئەنجومەنی حوکمیان لەو حزبانە پێك هێنا، هر چەندە بریمەر بیرو رای خۆی بەسەر ئەم ئەنجومەنە دەسەپاند لەگەل ئەوەش کە کار بەدەستانی ئەمریکا هەولیان دەدا کەمولکێکی عیراقی بخەنە سەر بەرێوەبەرایەتیەکان هەر لە ئەنجومەنی حکمەوە تا هەلبژاردنی پەرلەمان و پێکەوە نانی ئەنجومەنی وەزیران لەو حزبانەی کە لە هەلبژاردنی پەرلەمان زۆربەی دەنگەکانیان بە دەست هێناوە کە بریتی بوو لە هاوپەیمانی کورد و شیعە هەر چەندە ئەمریکا بۆرە لایەنگریکی بۆ – سنە – هەبوو، چونکە نەیدەویست شیعە حوکمی مۆنۆپۆلی لە عیراقدا جێگیر بکەن، چونکە بە لێکدانەوەی ئەمریکا دەبێتە

هۆکاری زیاد بونی رۆلی ئێران له عیراقی داهاتوو ئەم کارەش بەلای ئەمریکاوە مەسەلێکی مەترسیداره لەبەر ئەوەی ئەمریکا دژی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە نایەوێ دەسەلاتی ئێران له رۆژهەلاتی ناوەراست دا پەره بسێنی، بەلام لەم دوایە دا پەلامارەکانی سنه بەهاوکاری لەگەل چەکدارانی قاعده خەتی سووریان بەزاندو پەلامارەکانی خۆیان زیاد کردو له دژی سوپای ئەمریکاش زیدەرۆیان کرد بۆیە ئەمریکا ناچار بوو له گەرەکی ئەعظمیة و دوایش له پارێزگای دیاله چەند کوتەکی قورسی ئاراستەی هێزەکانی قاعیده و تاقمه چەکدارەکانی سنه کرد هەر ئەمەش بووه هۆکاری کەم بونەوەی هێرشەکان له بەغدا و عیراق به گشتی ئەمەش وا ناگەینێ که تاقمه چەکدارەکان بەرەو لەناوچون دەرون، چونکه له وانەیه ئەم کەم کردەوەیە تاکتیکێك بێ بۆ ئەمریکا پەله بکات له بەجێ هێشتنی عیراقدا، گوایا تاقمه چەکدارەکانی دژی سیستەمی نوێ ی عیراق بەرەو نەمان دەچن من وا هەست دەکەم که هێزه چەکدارەکانی عیراق ئەو توانایان نیه که روو بەرووی تاقمه چەکدارەکانی دژ ببنەوه بەتایبەتیش دەر دەکەوی که تاکو ئیستا نەتوانراوه رێزەکانی سوپا و پۆلیس سیستەمی نوێ پاکبکرێتەوه له کەسانی سەر به رژێم پێشودا له لایکی تریش له ناوەوەی ئەمریکادا فشاریکی زۆر له سەر حکومەتەکەی — بۆش — هەیه که هێزەکانی ئەمریکا له عیراق پاشەکشه پێ بکات، چونکه ژمارەیکی زۆری ئەم سوپایه له عیراقدا دەکوژین و ئەمریکاش پاره وپولێکی زۆر بۆ سوپاکەی له عیراق و ئەفغانستان خەرج دەکات - بۆشیش — ماوەی حکومەتی زۆر کورت بۆتەوه لەبەر به دووری نازانم که ئەمریکا زۆرینەی هێزەکانی له ماوه ی سالانی ۲۰۰۸ و ۲۰۰۹ پاشه کشه بکات.

له بەهاری/۲۰۰٤ کۆنگرەی سێیەمینی حشك له شاری سلێمانی گرێ درا دیاره له راپۆرتی کۆنگرەدا ئال و گۆرێکی زۆرکرا بۆ له باردی رێکخستنی حزب له هەموو یان دیار تر ئەوه بوو که له جیاتی ئەوه بوو که له جیاتی ئەوه بگوتری حزب له سەر رێبازی(مارکسیزم — لێنینزم) نوسرا بو لەسەررێبازی مارکسیزم خەبات دەکات دیاره

ئەمە چاو لێکەری حشع بوو چونکە حشع لە کۆنگرەی پێنجەم لـە سـالی/١٩٩٢ دا ئـەم گۆرانکاریەی کرد گوایا ئەمە نوێ کردنەوەیە لە ریبازی حزبدا من زۆر ووت و ویـژم لەسـەر ئـەم خالـە کـرد نزیکـەی یـەك لەسـەر سێی ئەنـدامانی کـۆنگرە لـە دژی ئـەم خالەدا دەنگیان دا، بەلام زۆرینەی دەنگ لەگەل گۆرینەکە بوو. من وا هەست دەکـەم ئەو حزبانەی ریبازەکەیان گۆری خۆیان توشی هەلەیکی گەورە کرد چونکە لێنینـزم تەواوکـەری مارکیزمـە و زۆر جـار ئـەو حزبانـە بـە ناچـاری ووتەکـەکانی لێنینـی دەهێننـەوە بـۆ پـشت گـیری بـۆ چـونەکانیان وام دێتـە بەرچـاو کـە ئـەم حزبانـە دەیانەوەێ بر جوازیەت لە خۆیان رازی بکەن بۆ ئـەوەی کـە حکومیـان بـە دەسـتەوە دویان نەنین، مـن وابـۆ دەچـم بـە جوازیـەتی ئەگـەر بـەزەبرو زەنـگ دژیـاتی حزبـە شیوعیەکان نەکەن بە زۆر شێوازی تر دژایەتیان دەکەن بۆیـە خـۆم بـۆ ئەندامیـەتی ك.ن نەپالاوتـەوە چـونکە وەلانـانی لێنیـزم و هەنـدێ دەسـت کـاری تـر لـە پێـرەوی نـاوخۆیی حزبـی لـەریبازی شۆرشـگێری دوور خـستەوە ئەمـەش لـەکارو کردەوەکـانی حـزب دەردەکـەوێ دوای کـۆنگرەی سـیەمین زۆر خـەلکی دۆسـتی حـزب و خـەلکی دیمـوکرات خـواز هەسـت بـەم رۆلـە حـزب دەکـەن کـە وەکـو پێویـستە داکـۆکی لـە داخوازیەکانی خەلکی ستەم لیکراو ناکەن و ریگای کوردستان لە بەرامبـەری هەنـدێ لەم داخوازیانە دا بێدەنگە لەم کۆنگرەیەدا لێژنەی چاودێر ناوەندی هەلبژێرا لەبەر ئەوەی کە لە کۆنگرەدا هەلبژێرا دەبێ دەسەلاتی زۆر کەمتر نەبێ لە دەسەلاتی ك.ن. بـەلام ك.ن زۆر بەکـەمی بـواری پێـی دەدا کـە ئەرکـەکانی خـۆی جێبـەجێ بکـات لـە کۆنفرانسی ناوەندی لێژنەی چاودێری راپۆرتێکی پێشکەش کـرد کـە هەنـدێ کـەم و کوری ك.ن لـە خـۆی گرتبـو هاورێیـانی ك.ن بـەم راپۆرتـە قـەلس بـوون و سـکرتێر رەدیکـی درێـژی دایـناوە کـە هەنـدێ برگەیـدا هێرشـی هێنـا بـوو بـۆ سـەر لێژنـەی چاودێری دوو سال بە گەرمی کـارم لـەم لێژنەیـەی چـاودێری بـەلام بـە هـۆی تـووش بونم بە نەخۆشی بربردی پشت – فقـرات – نـاتوانم وەکـو پێشان ئـیش و کاردەکـانم هەلسورینم بۆیە نیازم نییە لە کۆنگرەی چوارەمین خـۆم کاندیـد بکەمـەوە شـایەنی

باسە کە بەهۆکاری ئەم نەخۆشیە نەمتوانی بەشداری لە کۆنگرەی هەشتەمینی حشع دا بکەم خۆشم بۆ ك.ن حشع نەپالاوتەوە هەر بەهۆی نەخۆشیەکەمەوە، چونکە ناتوانم ئەرکەکانم جێبەجێ بکەم.

# ئەو بابەتانەی بلاْو نەکراوەتەوە

## (ئەنفال)وەکو نەخشەیەکی رەگەز پەرستی

پێشەکی: رژێمی دیکتاتوری بەغدا وەکو هەر رژێمێکی رەگەز پەرستی سەر ڕوی زەوی. هەر لەورۆژەی کە کاروباری عێراقی بەریگای کودەتاییکی سەربازی دەست بە سەرداهینا, لەبەر روشنایی پیتولی (حزبی بعپی عربی) هەمیشە بیری لەوە کردۆتەوە کەنەتەوەی کورد , لە کوردستانی عێراقدا جینوسایدبکات و موکەنەتەوەیەکەی بسرێتەوە. مێژوە دوور و درێژەکەی کە پڕ لە لاپەرەپرشنگدارەکانی خەبات بشیوینی , بەلاْم ئەم جارە بەنەفەسیکی درێژو پلە بە پلە دژایەتی ئەم گەلە ستەم لیکراوەی توندو تیژتر دەکرد لە پێناوی پاکتاو کردن نەتەوەکەمان یا نواندنەوەی لە ناو بوتەی نەتەوەی عەرەب دا .

چونکە ماوەیەکی درێژە (میشیل عفلقی) دامەزرێنەری ئەم حزبە گوتویەتی پێویستە ئەوکەمە نەتەوانەی لەسەرخاکی عەرەب دەژین بتوێنەوەبەدوورێگا:

**یەکەم** : دەبی بە هێمنی پەیرەو بکری بەلاْم دریژەی پی بدری.

**دووەم** : ئەگەر بەرگریان لە خویان کرد دەبی زەبرو زەنگ بەکار بهینین بو تاواندەویان .

بیگومان عفلق وای بۆ چووە کە کورد کە مەنەتەوەییە و نیشتمانی نییە لەسەر خاکی عەرەب دەژی. لەبەر رۆشنایی ئەم بیرو باوەرە شوفینییتە دوا کەوتوەدا.

بەعسیەکان ئەم جارە دوای کوتایی تەموزی/١٩٦٨ حوکمیان گرتەوە دەست کەوتنە پلان داڕاشتن بۆ لە ناو بردنی گەلی کوردستان .

شالاوی (ئەنفالیش) یەکێك لەو نەخشەو پیلانە گلاْوانەی بوو ئەم بۆ ئەم مەبەستەشوفینیەی بوو لە ١٩٨٧/٣/٢٩ هیلە سەرەکیەکانیان داریشتن و (علی حسن

مجيد) يان به مرسوميكى كومارى كردەبەر پرسەى ئەنجام دانى ئەم ئەم نەخشەيە كە دواتريش كرايە وەزيرى داكوكى (دفاع) بەپى ئەم مرسومە دەسەلأتى سەربازى و ئاسايشى و هى تريانداية هۆكارەكانى پەنابردنى رژيم بۆ دارشتنى ئەم نەخشەيە:

شايانى باسەكە رژيمى بەغدا هەردواى سەرهەلدانەوەى شورشى خەلكى كوردستان لەناوەراستى سالى /١٩٧٦وە .

چەندين نەخشە و پيلانى جۆراو جورى بەكار هينا بو پاكتاو كردنى شورشى گەلى كوردستان .

بەلأم بەوەدەست هينانى هەندى سەركەوتنى كاتى , نيتوانى مەبەستى سەرەكى كە پاكتاوكردنى شۆرشە وەدى بهێنى , ويراى بەكار هينانى هەندى جۆرە چەك و تەكنيكى جەنگى مۆدێرن , بە تايبەتى فرۆكەى هەلێكوپتەرى جەنگى و ڕاگواستنى دێهاتە سنوريەكانى كوردستان بەقولاى (٢٠)كم لە سنورى ئيران و توركياوە .

بە پێچەوانەى نەخشەو پيلانە دوزەخيەكانى ڕژيم بە تايبەتى نانەوەى ناتەبايى و دووبەرەكى وشەڕى ناوخۆيى .

سالْ بە سالْ بەرەى شۆرش خواز فراوان و پتەو تردەبوو , بونمونە لە كوتاى سالى / ١٩٧٨دا , حزبى شيوعى بريارى دا لەو بەرەيە بكشێتەوە كە لەگەل حزبى بەعسى فرمان ردواى بە ستبوو پيگەى خوى بو ناو شورشى كوردستان بگوازيتەوە .

بەم هەنگاوەش رژيمى بەغدا زياتر دورە پەريز وەتاق كەوت لە ناوەو دەرەوەى عيراق و , شۆرشى گەلانى ئيرانيش هۆكارێكى ديكە بوو بۆ هيزبوونى شورش .

چونكە رژيمى پاشايەتى ئيران فشاريكى زورى خستبوسەر هيزە شورشگيرەكانى كوردستانى لەو چياى و دولە سەختانە سەر سنورى خوێ ى لەگەل كوردستانى عيراق دا .

رژيم كە نەيتوانى شوفينيستيەكەى خوى دژى شورشى كلپە سەندوى كوردستان بەو هەموو هيز زور زەبەنددى خوى بە ئەنجام بگەينى .

بـەلگوهێزو, ولایەنـە کوردسـتانیەکان  ئەگـەر شـەری نـاوە خـۆی نـەگریس نەبوایـە دەیان تواندی هەندی شارو شارۆچکەش ئازاد بکەن کـار بەدەسـتانی رژێـم بیریـان لـە نەخـشەییکی ترسـناك ترکـردوە بـو قەلاچـۆکردنی  گـەلی کوردسـتان ولـەناو بردنـی شورشە ئازادی خوازەکەی بۆ نمونو ئەو بڕیارەی سەرکردایەتی شۆرشی بەناو بەغـدا دوایـی  دەسـت بەسـەر داگیرتنـی شـاری هەلبجـەی شـەهید دەرچـووکە هـەموو دەستەلاتیك درابە (علی حسن مجید) لەوانەش بوردومان کردنی ئەم شارەکولنەدەرە بەچەکی کیمیاوی قەدەغەکراو سەرەتای دەست پێکردنی ئەم نەخشەیە بێت .

## نەخشەی (ئەنفال) وەکو تاوانیکی جینۆساید

ووشەی (ئەنفال) کە لە قورئاندا هـاتووە بوهانـدانی موسـلمانەکانی یـارانی پێغمبـەر بووە تا گەرم تر دژی قوریشە نەیارەکانی ئیسلام بچەنگن .

بەلام بەداخەوە ئەم وشەیە لەلایەن رژیمی بەغدا و سەروکە رەگەزپەرستەکەی وەکو سەردێڕی نەخشەییکی تاوان بارانەی بێ بەزیانـە و درندانـە دژی گـەلی کوردسـتان و شورشەکلپەسەندوەکەی بەکارهینرا.

کە ئەمەش لەراسـتیدا کـەلك وەرگرتنـە لـە ئـاینی ئیـسلام بـو کـاریکی جانەوەرانـە , کەنـەك بـە تـەنیا ئـاینی ئیـسلام بـەلکو هـەموو ئـایین و ئایـدیولوژیای مرۆڤانـە قەدەغەی کردوە .

رژێمی سەرەڕۆی بەغدا لـەکات و سـاتێکی دیـاری کـراویش ئـەم نەخـشەدۆزەخیانەی داڕیشت ئەویش ئەوکاتە بووکە لایەنە سیاسـیەکانی سـەر گۆرەپـانی کوردسـتان دوای ئەوەی هەستیان بە بـی هـودەیی شـەری  نـاوخۆیی کـردو ئاشـت بوونـەوەو خـەریکی گفت و گۆ بوون بۆ دامەزراندنی بەرەی کوردستانی .

جونکە باش دەزانی ئەگەر لایەنە کوردستانیە نیشتمان پەروەرەکان , لـە نـاو خویـان داڕیك بکەون و بەرەیەکی کوردستانی دابمەزرینن کە خەباتی چـەکداری و سیاسـیان بە تێکراێی ئاراستە بکات .

دەتوانن بە شیکی فراوان کوردستان بە هەندی شاری گەورەشەوە ئازاد بکەن , بەتایبەتی دوای سەرهەلدانەوەی خۆپیشان دان و راپەرین لە هەندی شارۆ چکەی کوردستان وەکو شەقلاوە و رواندوز و هیران چەند شارو چکەی تر ئەمەش مەترسیکی زور توقینەری لەدل و دەرونی سەرانی رژیم دروست کرد .

بویە رژیم هیچ ریگاییکی دیکەی بەدەستەوە نەماوە , ڕێگای پەردان بە زەبرو زەنگ نەبێ .

زور لە لێتو تیژەرەو. کوردو بیگانەکان دوای تیخوندنەوەیکی بابەتیانەی هەمەلانەی شالأوی ئەنفال گەیشتونەتە ئەو دەر ئەنجامەی کە ئەم شالاوانە دەچنەخانەی ریکەوتنامە نیو دەولەتیەکان بە تایبەتی ئەو ریکەوتنامەیەی لەلایەن کومەلەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان کە لە سالی ۱۹٤۸ دەرکراوە هەروەهاریکەوتن نامەی (حرام)کردنی پاکتاوی رەگەزی ئادەمیزادی سالی ١٩٥٤ کە دواتر عیراق مۆری کردوە .

بە پێ ئەو نەخشەیەی ریگا دەدا بەسەربازو هەموو چەکدارەکانی رژیم کەدەست لە کوشتنی رولەکانی گەلی کورد و یران کردنی شارو شاروچکەو دیهاتەکانی نەپارێزن .

تەنانەت چیاو کیلگەو باغ و ڕەزی کوردستانیش بسوتێنن .

راستی لیکدانەوەی ئەم لێتوژە رەوانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەردەکەوی چاو خشانێك بەو تاوانەی کە لە ژێر ناوی ئەنفال دژی گەلی کوردستان ئەنجام درا پتر درندایەتی ئەم نەخشەیە ساغ دەکاتەوە .

بەتایبەتی ئاویتەکردنی شالأوەکانی بەبەکارهێنانی چەکی کیمیای دژی پێشمەرگەو شاری هەلەبجەی دووچارو شەید کراو و دانیشتوانی بێتاوانی گوندەکانی کوردستان , ئەو چەکەی کەهەر لە سالی ۱۹۲۵ وە بە پێ پرۆتۆکۆلی جنیف قەدەغەکراوە , کە نابێ لە جەنگە نیودەوڵەتاندا بەکار بهێرنرێ ,کەچی رژێمی بەغدا لە گەل ئەوەی ئەم پرۆتۆکۆلەی مۆرکردوە .

دژی گەلەکەی خۆشی بەکاری هێنا , ئەمەش تاوانە کە گەورەتر دەکات .

دەریش کەوتوە کە ئەم رژێمە کەبناغەکەی لەسەر تاوان دامەزراوە هەر لەسالی ١٩٨١ وەخەریکی بەدەست هێنانی ئەم چەکە کۆکوژەبووە .

دیارە کومپانـایی ئیتـالی بـەناوی (مـونتی دیـون) لـەم سـاڵەدا لـە ناوچـەی عکاشـاتی سنوری سوریا کارگەیەکی بوبەرهەم هێنـانی دژەژیاریـەکان و ژەهـر دروسـت کـردوە لەسەر داوای رژێمی عێراق .

رۆژنامە ئینگلیزیەکانیش هەوالی دروست کردنی کردنـی دەمارەکانیـان لـەم کارگەیـە دووپات کـردەوەو لـە ١٢ کـانونی یەکـەمی سـالی ١٩٨١ پـشدا رژیـم بـو یەکـەم جـار ئـەو چـەکە کیمیایـەی کـە گـازی دەمارەکانـە بـەریگای تـوپی دوورهاویـژ لـە ناوچـەی (هیلالی) سنوری دژی سوپای ئیران بەکار هینا .

و لــە ١٩٨٤/٥/١٦ پــشدا دەرکــەوت کــە کومپانیایــەکی ئــەڵمانیای رۆژئــاوا کومەڵــە کەرەسەییکی کیمیایی داوەتـە عـیراق کە بـو دروسـت کـردن وپەیـدا کردنـی چەکی کیمیایی لەگەل دەیان کومپانیای نەمساوی و و فەرەنسی و ئـەلمانی رۆژئـاوا و ئیتالیـا و ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا چەند دەوڵەتیکی دیکە کـردوە بـەپێ ئـەو لیـستەی کـە لـە پەروەنــدەکانی (امـدیل ایـست داتـا پـروچـکت) وەرگـیران پیـشتر ئاماژەمـان بەوراستیەکرد کە رژیمی عـیراق هەرلـە سـالی /١٩٧٤ وە بگـرە پێشتریش هـەولی داوە نوێ ترین چـەك و تـەکنیکی چـەنگی دژی گـەلی کوردسـتان و شورشـەکەی کـە شـیوە خەبانی چەکداری لەسەر ریبازی پارتیزانی بـە خـۆوە گرتوەبـو بـەکار هێنـاوە وەکـو تۆپی دوور هاویژ وتانك و فەرۆکەی جەنگی کە بومپای (ناپالم و هیشوی) بەسـەر دیهـاتی کوردسـتان دەبارانــد. ئــەم دووبۆمبایــەش بــە بریــاری نیــو دەولــەتی قەدەغەکراون.

بـەلام رژیمـە سـەرەرۆیەکان هـەرگیز بایـەخیان بـەبریاری نێـو دەولەتەیـەکان ورای گشتی جیهان نەداوە , لەسالی ٩٧٤ بەداودوە رژیمی بەعس بەپلە سەرەکی بایەخی بە بەکارهینانی هەلیکوپتـەری جـەنگی داوە , چـونکە لـە ڕاستیدا چـەکیکی کاریگـەرە دژی شەری پارتیزانی بەوپیێ و دانگەی کە پارتیزان چەکی دژە کۆپتەریەکانییە ؟

بــەلام دواى پێــشمەرگە قارەمانــەكان بــە R.B.G هەلیكوپتــەرەكانیانى رژێمیــان دەدایەوە .
بویە رژێم لە هەشتاكاندا كە بۆى دەركەوت هەلیكۆبپتر ئەوەندە كارى گەرى بەسەر شەرى پارتیزانى دا نییە پەناى بو چەكى كیمیاوى برد سەرەتاى دژى سوپاى ئیران خەلكى بێتاوانى گوندەكانى كوردستان بەكار هێنا .
یەكەمین جار لـە ناوچەى خوشناوەتى بـە تایبـەتى لـە گونـدى (شێخ وەسانان) دا لەمانگى نیسانى ١٩٨٧ دا.
دواى ئەوەش لە ٩٨٨/٣/١٦ لە شارى هەڵەبجەى شەهید بەخەستى بەكارى هێنا و ئەو كارە ساتە دل تەزینە لە مێژووى رژێمى بەعسى خوێن ریژ تومـاركرد , كـە چووە پال تاوانەكانى دیكەى دژى گەلانى عیراق بەگشتى و گەلى كوردستان بە شـیوەیەكى تایبەتى , بوە پەلەیكى شەرمەزارى كـە هـەتا دنیـا مـابێ لـە ناوچاوانى ئـەم رژێمـە دەمێنیتەوە دواتریش لـەكاتى شالاوە درندانـە پـەك لـەدواى یەكانیـدا لـە ژێـر نـاوى ئـەنفال بـەفراوانى لـە دولى جافـەتى و گونـدى سیوەسـینانى قـەرەداغ و گوكتەپـەى دەشتى كۆیە دووبارە لە خۆشناوەى و مەلەكانود و دواتر لە ناوچەى بادینان شـایانى باسە هەر لە سالى ١٩٨٧ وە لە ٥/ حوزیران لە دژى بارەگاكانى كەرتى بادینانى حزبـى شـوعى بەكارهێنابـەپێ ى تـرین سـەر مـیر, رژیـم (٣٩) جـار ئـەم چـەكە بـە كومـەل كوژەى دژى پێشمەرگەو شارى هەلبجەو دیهاتەكانى كوردستان بەكارهیناوە .
پـەنابردنى رژیمـى بەغــدا بوبــەكار هینــانى چــەكى كیمیــاویى دژى شورشــى و دێهاتــەكانى كوردســتان رژیمەنــەیتوانیوە ئــەم شورشــە بــەرێگاى جـەنگى تقلیـدى پاكتاوبكات و هەمان كاتیش ئامادە نەبوە دان بەمافە رەواكانى گەلى كوردستان دابنى و دیموكراسى بو عیراق بەگشتى فەراهەم بكات , بویە هەمیشە بـیرى لـە چـەكى كۆ كوژ كردوتەوە بو پاكتاوكردنى شورش و مل كەچ پێ كردنى ئەو خەلكەى كوردستان كەلە پەراویزى ئەنفالدا دەمێننەوە .

چونکه رژیم باشی دەزانی کەهەرچەندە نەخشە و پیلانی پرزەبرو زەنگ دابرێژێ ناتوانی هەموو ڕۆلەکانی گەلی کوردستانی باشور لە ناو ببات  کە ژمارەیان نزیکەی پێنج ملیون مرۆڤن .

بۆیە بیری لە ئاخانینی ئەو دانیشتوانەی لەپەراوێزەی ئەنفالدا دەمێنەوە لە ئۆردوگای زۆرەملی و لە دوایشدا شوشتنەوەی مێشکی ئەودانیشتوانەو لەوێشدا مل پێ کەچ  کردنیان و خەیالی خاوی خویی ناجارکردنیان بە هەلگەرانەوەی لە نەتەوەی خۆیان و ڕازی بوون بەوەی  کە خویان بکەن بەعەرەب , لەسەر بنەمای پاکتاوی رەگەزی  کە ئیستا رژیمی  بەغدا بەفراوانی لە پاریزگای کرکوك  وخانقین و مەندەلی و شارەبان و جەلەولاو و مخمور و ژنگار و شێخان و ناوچەکوردیەکانی دیکە پەیڕەوی دەکەن .

ڕێبازی (ئەنفال) هەربەتەنها بریتی نەبوو لە بوردمان کردنی زوربەی ناوچەکانی کوردستان دانیشتوانی ئەم ناوچانە بۆ خۆ بەدەستەوەدان بەلکو هێرشێکی فراوانو بەر بلآویان دەستی پێ کرد دژی ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان هەر لەمانگی ئاداری ١٩٨٧ وە , بەلآم لەم سالەو سەرەتایی سالی ١٩٨٨ دا , نەیان توانی هێرشکە زۆر فرەوان بکەن , بەهۆی جەنگی عێراق – ئیران و سەرقالی  سوپای عێراق بەو جەنگە دەست دریژکاریەوە .

بەلآم هەرلە بەهاری ١٩٨٨ واتا پایزی ئەم سالە لە ئاکامی کۆکردنەوەی هەموو سوپای عیراق لەسەر سنور ناوچەکانی کوردستان و مۆل دانی  هەموو ئەو چەکە جوراو جورەی کە بۆ جەنگ دژی ئیران ئامادەکرابوون .

وێرای  ئەمەش رژیم بریاری دابوو لە هەر جێگایەك پێشمەرگە بەرگریکی بەهیز بکات ئەم شوینە بەچەکی کیمیایی کوشندە بوردومان بکات .

ئەم نەخشە تاوانباردی رژیم توانی پێشمەرگەی بەردی کوردستانی , باشەکشە پێ بکات بوسەر سنوردکانی کوردستان لەگەل ئێران و تورکیا .

ڕاسته له جەنگدا یاسای توندو تیژبەکار دەهێنرێ لەلایەن هەردوولای بەگژیەکدا چوودا .

بەلام کومەلگەی مرۆڤایەتی بە تایبەتی لەسەردەمی بیستەوە کومەلە بریاریکی بەریگای کۆمەڵەی نەتەوەکان دوایش نەتەوە یەکگرتوەکان داوە .

له پیناو سووك کردنی قورسای جەنگ لەسەر دانیشتوانی مەدەنی بەلأم ڕژیم، بەلأم ڕژێمی ڕەگەزبەرستی بەغدا، هەموو ئەو بڕیارانەی پێشێل دەکردو بەهیچ شێوەیەك بۆیان مل کەچ نەبووە، دەستی لە هیچ تاوانێك دژی کورد وەکو گەل نەدەپاراست٠ بەداخەوە لەو سەردەمەش کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ودەوڵەتە زلهێزەکان لەبەر بەرژەوەندی تەسکی خۆیان ئەوتاوانانەی ڕژێمی عێراقیان ڕیسوا نەدەکرد٠ تەنانەت بەرامبەر تاوانی کیمابارانی شاری هەڵەبجە ، بەو هەموو درندایەتییەی وەکو پێویست ریسوا نەکرا٠ خۆ ئەمریکا دوای ئەو پرۆسە بە ناوی (ئەنفال)یش هەر درێژە بەیارمەتیە لۆجستیەکانی خۆی بۆ عێراق دەدا٠

## قۆناغەکانی ئەنفال

دەتوانین بڵێین کە شاڵاوی (ئەنفال)هەر بە دامەزراندنی عەلی کیمیاوی بە حاکمی سەربازی لە کوردستان لە ٢٩ / ٣ /١٩٨٧ دا دەستی پێکرد٠ بەلأم شاڵاوەکان بە کردەیی لە ١٩٨٨/٢/٢٣ وە، لە دۆڵی جافایەتی دەستی پێکردماوەیەکی هەست پێکراوی خایاند و بەهۆی داکۆکی کردنێکی ئازایانەی پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە بارەگای سەرکردایەتیان٠ ڕژێم بە فراوانی چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە، وێرای پێشمەرگەکان ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی گوندەکانی ئەو ناوە بەم چەکەکوژران و بریندار کران٠ بەرادەیەك بەشداربووە ( زێباری) یەکان لەو هێرشەدا بۆ پشتگیری سوپای عێراق ، لەناوخۆیان نارەزاییان لەم هێرشە جانەوەرانە دەردەبڕی٠ چونکە بەچاوی خۆیان چەند ژن و منداڵی کوژراویان بەم چەکە کوشندەیە دیت بوو٠

شالاوی دووەم بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ بوو،لەم شالاوەشدا چەکی کیمیاوییان بەکار هێنا لەو بۆردوومانە کیمیایانە بۆردومان کردنی گوندی(سیوسینان) بوو کە ژمارەیەکی زۆری خەلکی ئەو دێیە کوژران و بریندار بوون ئەو خەلکەی رزگاریش بوو دەربەدەربووشایانی باسە پێشمەرگەکانی هەموو لایەنەکان بەتایبەتی پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆلێکی بەرچاویان هەبوو لە داکۆکی لەناوچەیە کە بە خوێنی پاکی دەیان شەهید قارەمان چەند شەڕێکی قارەمانانەرەنگ و ڕێژکرا چونکە گەلە گورگەکانی رژێم دوای بۆردومان کردنی خەست زۆردڕندانە هێرشیان دەبرد٠

**قۆناغی سێیەمی:**

ئەم شالاوە ناوچەی گەرمیانی گرتەوە کە زۆر فراوان بوو رژێم لە چەند لایەکەوە شالاوی هێنا بۆ سەر پێشمەرگەو دانیشتوانی دێهاتەکان لەمشالاوەدرندەیەشدا هەرچەند پیشمەرگەکانی هەمولایەنەکانی بەری کوردستانی قارەمانانە دا کوکیان لە ناوچە رزگارکراوەکرد .

بەلام بەهوی ژمارەی زۆری سوپاو ملیکاو خورەکانی رژیم و بالادەستی رژیم لە بواری چەك و تەکنیکی جەنگی و تواناى لوجستی پیشمەرگەقارەمانەکان .

رژێم لە ماوەی ١٢-١٣ رۆژ توانی دەست بەسەر زوربەی ناوچەی گەرمیان دابگریتەوە , لیرە رژیم هەربە دەربەدەرکردنی خەلکی خۆڕاگری گەرمیان رانەوەستا , بەلکو ژمارەیەکی زورلێ دەست گیر کردن دوای ئەوەش باش لیك جیاکردنەوەی ژن و مندال لە پیاوەکان .

هەموویان بەرەو شوینی نادیار بەرێ کردن , کەدوای ماوەیەك دەرکەوت بو بیابانەکانی رۆژ ئاواو خواروی عێراق رەوانەکراون لەویش بەشی هەرەزۆریان لە زیخ وچەوی ئەم بیابانە زیندە بەچال کراون بە شێکی کەمیان لە ژن و پیاوی بە سالا چوو بۆ زیندانی بەناو بانگی چالێ سلێمان (نقرە سلیمان) براون بۆ ئەودی لەوێ بەکولە مەرگی دوای ماوەیەکی کورت ژیان لە دەست بدەن. لەراستیدا زوریان

لەبرسان و پیس و پوخلیا ژیانیان لە دەست دا. بەلام هەندیان نەماوە بو ئەوەی بو هەموو دونیا باسی درندایەتی بەعس وەکو حزب وەکو رژیمیکی فاشی بکەن .

**قۆناغی چوارەم :**

لەدەشتی کۆیە و ناوچەی شوان دەستی پێ کردود لەم ناوچەش تاوانی زۆر گەورە لەلایەن سوپای عێراق و جاشەچلکاو خورە کوردەکانی دەرحەق بە دانیشتوانی هەژار و بێتاوانی ناو چەکە کراو'گوندی گوک تەپەبە بەچەکی کیمیایی بوردومان کراو ژمارەییکی زۆر ژن و مندالّ و پیرو پەکەوتە کوژران. ئەوانی دیکەش وەکو دیل دەستگیرکران و بەرەو شاری کۆیە رەوانەکران. ئیستاش ناوەبەناوی لەگوندی گوک تەپە گورستانی بەکومەل دۆزێتەوە لەگەلّ ئەم هەموو تاوانانەش رژێم ناوەناوەلافی ئەوە لێ دەدا کە ئوتونۆمی بەگەلی کوردستان بەخشیوە. بەڕاستی بێ ئابوڕوی ئەم رژێمە بەتایبەتی سەرۆکەکەی گەیشتۆتە رادەیەکی وا کە شەرم لە هیچ درۆو دەلەسە نەکاتەوە , ئەمەش خوردوشتی هەموو رژێمێکی دکتاتۆری تاك ڕەو دژی گەلەکە هەولّ دەدەن مێژووی گەلان وەکو خۆیان دەیانەوێ وای بنوسنەوە. بەلام پەتی چەواشەکاری کورتە و راستیەکان هەردەردەکەون هەرچەندەماوەیەکە درێژیان بەسەر دابڕوا.

**قۆناغی پێنجەم:**

لەناوچەی لۆلان : خواکوڕك بەرپاکرا . رژیم هێزیکی زوری سوپاو چلکاوخوران بۆمۆلّدابوو. هەر لەناوەراستی مانگی تەموزی/١٩٨٨ وە , هیزەکانی رژیم کەوتنە توپباران و پەلاماردانی ناوچەکە. پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شویوعی عیراق و پێشمەرگەگیان لەسەر دەستە کانیان بەرەنگاری هیزەکانی رژیم بونەوە .
کاك مسعود خوی سەربەرشتی بەرگریەکەی دەرکرد. لەچەند نەبەریکی پالّەوانە هێزەکانی ڕژیم شکستیان خوارد. ورەی پیشمەرگەکان بەرز بوو و ماوەیکی زور

داکوکیان له ناوچەکە کرد قوربانی زۆریان دا یەکیك لە شەهیدەکان پ.م حزبی شیوعی بووبەناوی (مام علی) کە کورد یکی کوردستانی ئیران بوو . بەلآم بەهۆی زۆری هێزی رژیم و بەکارهینانی نوێترین چەك وەکو فرۆکەی جەنگی جوراو جورو توپی دوور هاوێژ و درێژە کێشانی پەلامارە یەك لە دوای یەکەکانی هێزەکان رژیم لە کوتایدا هێزەکانی رژیم توانیان پاشەکشە بەهیزە هاوبەشەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شوعیی بکەن. بەتایبەتی دوای راگرتنی جەنگی عیراق – ئیران ,لەبەرەکانی شەردژی کۆماری ئیسلامی ئیران بکێشیتەوە و لە دژی ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان ئاراستەی بکات. بەلآم ئەو بەرگریە ئازایانەی پ .م لە ناوچەی لولان و خواکورك هەمیشە وەکو لاپەرەیەکی پرشنگ داری بەرگری گەلی کوردستان دژی داگیر کەراندەمینێتەوە.

**قوناغی شەشەم:**

لەناوەراستنی مانگی ئابی ١٩٨٨ وە بەسەر دولی خوشناوەتی و دولی مەلەکان و دولی شاورە بوو . رژیم لەچەند لایەکەوە پەلاماری ئەم ناوچانەی دا دوای مولدانی هیزیکی زوری سوپاو جاشە چلکاو خورەکان . هەرپیش پەلاماردانە کە جارێکی دیکە ناوچەکانی بەخەستی بە چەکی کیمیایی لە رۆژی ١٩٨٨/٨/٢٥ دا بوردمان کردەوە بەژمارەیەکی زۆری جوتیارەکانی ئەم ناوچانەکە لە ئاکامی بوردومانەکانی پیشو ناوچەکانیان جول کردبوو , بوردومانەکە زیانی زۆری گیانی نەبوو , هیزی پێشمەرگەش لەسەر چیایەکان بوو بوبە زیانی پێنەکەوت .

دوای ئەم بوردمانەخەستەش پەلامارەکە دەستی پی کرد . ئەو کاتە پێشمەرگەی هەموولایەنەکەکانی بەرەی کوردستانی کراو بریاردرابەرگری لە ناوچەکە بکری بە تیکرایی توانای ئەگەر توانای بەرگریش نەما پاشە کشە بکەین . چونکە ئەوزانیاریانەی کەلەسەر چاوەکانمان لەناو رژیم بریاری بەکارهینانی چەکی

کیمیایی داوەلەهەر جێگایەك کە پیشمەرگە بەرگری بکات. بۆیە لە کۆتایی مانگی ئاب هێزەکانمان دەستیان بە کشانەوەکرد بەرەو سنوورەکان لەگەل ئێران داو• ئێمە وەکو حزبی شیوعی عێراق چەند گەرێلایەکی پارتیزانیمان لە ناوچەکە هێشتەوەو ، بۆ درێژە دان بە شەڕی پارتیزانی دژی رژێم چونکە وای بۆدەچوین کە رژێم هەر ناتوانێ ئەو هێزە بەربلاوە لەم شاخ و ودۆلانەی کوردستان چۆل بکات لەو کاتەش دەتواندرێ گیانی بەرگری لەناو گەلەکەماندا بپارێزین•

**قۆناغی حەوتەم:**

لەناوچەی بادینان بەرپاکرا بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی لەلام هەیە لە ٢٥ / ٨ / ١٩٨٨ دا دەستی پێکرد و لە ئاکامی چۆل کردنی زۆربەی ناوچەکانی ڕزگارکراوی کوردستان، هێزە پێشمەرگە نەیتوانی بەرگریەکی درێژخایان بکات• لەهەمان کات چەکی کیمیاویی یە بەفراوانی و خەستی رێگای بە هێزی پێشمەرگەنەدا کە بۆ ماوەیەکی درێژداکۆکی لە ناوچەکان بکات• لە بانگەوازی کاك مسعود دا باسی کارەساتی گەلی بازی دەکات کە لە رۆژی ٢٩ / ٨ / ١٩٨٨ بووە هۆی لەناو بردنی(٢٠٠) خێزانی کورد بە چەکی کیمیایی کە لەلایەن فرۆکەکانی رژێم بەسەر ئەو خێزانە لێقەوماوانەی دا باراند• کە بەراستی بەلگەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر دڕندایەتی رژێمی دکتاتۆری بەغداو سەدامی خوێن رێژ کەدەسەلاتی تەواوی بە کوڕە مامە تاوان بارەکەی کە نەك رۆلەکانی گەلی کوردستان جینۆساید بکات بەلکو دارو بەردی کوردستانیشی بیوتینی بە چەکی کیمیایی و بۆمبی فسفۆری یەکێك لە تاونە چانەوەرەکانی رژێمی سەرەڕۆی بەغدا جینۆساید کردنی دیانەکان ( مسیحی) یەکان و ئێزیدیەکان بوو• کە هەر چەندە خۆشیان دا بەدەستەوە هەر هەموویان لەناو بران لە ناوچانەی تا ئەوکاتەی لە ژێردەسەلاتی رژێم دابوو بۆیە وێرای هێزی پێشمەرگە ژمارەیەکی زۆری خەلکی مەدەنی لە ژن ومنال و پیرو پەککەوتە لە

ئاکامی ئەم پەلامارە بەرفراوان و دڕندانە لەلایەن رژێمەوە رژێمەوە (قتل وعام ) کران. ئەمە بەو گیانە رەگەزبەرستیە ئەنجام درا کە ئەمانەئیسلام نین.

**قۆناغی هەشتەم:**

دواین بۆ سەر ناوچەی ناوددشت و پشت ئاشان و قرناقاو بوو کەلەویش بەرگرییکی ئازایانە کرا لەلایەن پێشمەرگەکانی هەموو لایەنەکان بەتایبەتی پێشمەرگە ئازاکانی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و حزبی شیوعی عیراق بە تایەبەتی لە (کونە کتری)یەکیك لە کلکەکانی چیای قەندیلی سەربەرز , پێشمەرگەکان نەبەردیکی قارەمانانەیان تومارکردو زیانێکی گەورەیان بەهێزە پەلامارە دەرەکەی رژیم گەیاندوسەوەریکی نوییان لە مێژووی گەلە کولنەدەرەکەمان نوسیەوەکە بە خوینی شەهیدی قارەمان (ئازاد هەورامی) یەکیك لەسەر کردەکانی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان ڕەنگ رێژکرا. ئەم هەشت قۆناعەی شالاوە درندانەکانی ئەنفال کەلەلایەن سوپای داگیر کەری رژیمی (بەعسی عەفلەقی )لەنیوان ٢٣-٢-١٩٨٨ وە تا ١٩٨٨/٩/٦ درێژەی کێشا . لەگەل ئەوەی توانی هیزی پیشمەرگە بنکەو بارەگاکانی پاشە کشاوێ بکات بۆ سنورەکانی کوردستان عیراق – ئیران و عیراق تورکیا- بەلام بەزیان وزەریکی زوری هێزەکانی ڕژیمیش کۆتای هات و بەکار هێنانی چەکی کیمیابی بەو فراوانیە بەیەکجاری ناوبانگی رژیمی بەغدادی وەکو ڕژیمیکی دیکتاتوری ڕەفتارفارشی هەموو دونیادا رسیوا بکات .

هەندی دەرئەنجامی شالاوەکانی ئەنفال :

١- دەرپەراندنی بنکەو بارەگاکانی هیزی پێشمەرگە لە زوربەی ناوچەکانی کوردستان کە هەندێکیان لە قولای کوردستان دا بوون و چەند شاروچەکەی کوردستانیش کەوتبوە بەردەستی پیشمەرگەوەکو هیران وقەرەداغ , نەو چول

٢- لە ناوبردنی وزیندە بە چال کردنی نزیکەی (٢٠٠) هەزار لە ژن و مندال و پروپەککەوتەو لاوی کورد بە هەشت هەزار لە بارزانیەکان و ئەو ژن و مندالانەش

کەلـە ناوچـەی بادینـان لـەناو بـران بـە تایبـەتی لـە ئێزدیـی و مەسـیحیەکان. ئـەم ڕەشەکوژیەی بە فرۆکەجەنگی و تۆپی دوورهاوێژ ئەوانـەی مانـەوەش لـە بیابانـەکانی ڕۆژئاواو باشووری عێراق زیندە بەچاڵ کران. کە تا ئەمڕۆش چارەنووسـیان بـۆ گـەل و کەس و کاری لێقەوماوەکان دیار نییە. دیارە لە کاتی گفـت و گۆیەکـەی لایەنـەکانی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ڕژێم لە هاوینی / ١٩٩١ دا (عەلی حسن المجید) تورە بـوو لـە هێنانە گۆڕی ئەم تاوانە، چـونکە ئـەم تاوانـە ئـابڕو بـەرە ئـەو بـە فـەرمانی سـەدامی ئامۆزای جێبەجێی کردووە. و لـە وەڵامـی پرسـیاری لایـەن کوردسـتانییەکان گوتویـە (٢٠٠) هەزار کەس نەبوو تەنیا (١٠٠) هەزار کەس بوون.

ئەم کـردەوە چـەپەڵەی ڕژێـم زۆر بـە ئاشـکرا ئـەو ڕاستیەی دەردەخـات کـە ڕژێمـی عێراق ژمارەیەکە زۆری خەڵکی (مەدەنی) کوردو نەتـەوەکانی تـری کوشـتووە وەکـو کلد و ئاشوور و تورکمان. ئەمەش بێ هیچ پەنا یاسا نێودەوڵەتییـەکانی بـە سـەردا ( تگبیـق) دەبـێ کـە پـەنای بـۆ جینۆسـاید بـردوەو گـەلی کوردسـتانمان بکـات. بـەڵام بەداخەوە دوای تێپەڕبوونی (١٤)ساڵ بەسەر ئەم تاوانـە هێشـتا بـە لێبـڕاوی بڕیـاری دادگایی کردنی سەرانی ڕژێمی بەغدا نەدراوە. تەنانەت ئەگـەر ئـەم دادگـایی کردنـە بە ئامادەنەبوونی ئەم تاوانبارانەش بێت. بۆ ئەوەی ئەم دادگایی کردنە ببێتە بەڵگە نامەیـەکی مێـژوویی بـۆ داوا ڕۆژی گـەلی کورسـتان کـە تـوانی دەسـتگیرکردنی ئـەم تاوانبارانە ڕەخسا. ئەمە لەلایەکی دیکەش دەبێتە هۆکارێ بۆ زیاتر ڕیسواکردنی ئەم ڕژێمـە، کـەوا لەوانەیـە لـە کۆتـایی سـەدەی بیسـتەم دا تـاوانی وا گـەورە درندانـە نەدەرهەق بە هیچ گەلێکی دیکەنـەکرابێ، ئەگـەر بێـت و هـەموو بەڵگەنامـەکان لـەم دادگایە نێو دەوڵەتییـە گفـت و گۆیـان لەسـەردا بکرێ. زانراویـشە. کەبەتـەن بەڵگـە نامە لەبەردەست دایە بۆ داسەپاندنی ئەو تاوانە بەسەر سەرانی ڕژێمدا

٤- تونـدکردنی دانیـشتوانی شاروشارۆچـکەکانی کوردسـتان وەکـە ( هەڵبجـە و قـەڵادزەو چـۆمان و گەلاڵـە و سـیدەکان و مێرگەسـوور و شـێروانی مـەزن وهـیران و پێنجوێن و ماوەت و سەنگەسەر و خەلەکان و دیبەگە و چەندانی تر وێرای هـەزاران

گونـدی ئـاوەدانی تـر. لەچـەند ئۆردوگـای زۆرەملـێ دا. کەلـە راسـتیدا وەکـو ئـەو ئۆردوگایانە بوون کە کاتی خۆی هیتلەریـەکان لـەخوارووی ئـەفریقیا رەگەزپەرستدا بۆبە خەڵکی دەربەدەرو راگوێزراو لەوێش وەکو زیندانی هـەڵس و کـەوتیان لەگـەڵدا دەکرا. ئەمـەش خـۆی لی خۆیـدا تـاوانێکی دیکـەی رژێمـی بەغدایە. کـە ئـەم هـەموو خەڵکە بێتاوانەیان لە زێدی باوك و باپیرانیان هەڵتەکاندو لە ئۆردوگایانە قایم کران و بـێ ئـیش و کـار لـەوێ کـەوتبوون و لـە ژێرچـاودرێری رژێمـدابوون. ژیـانێکی کۆلەمەرگیان بەسەر دەبرد.

ئەمانەی خوارەوە هەندێ دەرەنجامی شالاوەکانی (ئەنفال)ن بە ژمارە:

أ- کاول کردنی (٣٨٩٣) شارۆچکە و گوندی ئاوەدان. لەمانەش کۆمەڵە گوندێکی کلدۆ – ئاشووربوون، لـەم شارۆچکەو گوندانـە (١٧٥٧) قوتابخانـەی سـەرەتایی هـەبوو لەگەڵ (٢٧١)بنکـەی تەندروسـتی و ژمـارەی ئـەو خێزانانـەش دەربـەدەرکران گەیـشتە (٢١٩٨٢٨) خێزان.

ب- پانتیی کوردستانی عێراق کە (٨٦٠٠٠) کم٢ یە . بـەڵام دوای شالاوەکان ئـەم پێنج ملیۆن کوردەی کوردستانی عێراق لە پانتاییکی زۆرکەم کە (٨٠٠٠)کـم٢ بـوو لـە شارو ئۆردوگاکان.

ج- رژێمـی عێـراق (٣٩) هێرشـی لیـك جیـاوازی بـە چـەکی کیمیاوگـازە ژەهراویەکانکردە سەر کورسـتانی عێـراق لـە مـاوەی هـەردوو سـاڵی (١٩٨٧ – ١٩٨٨) دا ئەمە وێرای کۆمەڵە تاوێنێکی دیکەی ترسناك کە لە دوو تـوێ ئـەو تاوانە دا ئاماژەیان بۆ کراوە.

**ئەرکەکانی لایەنە کوردستان بەرامبەر قوربانیەکانی (ئەنفال):**

أ- درێژەدان بەسەرژمێری و تۆمارکردنی ناوی هەموو قوربانیەکان شالآوەکانی ( ئەنفال) چ ئەوانەی لە کاتی هێرش و پەلاماری هێزەکانی زەمینی و ئاسمانی رژێمی عێراق. چ ئەوانەی کە دەست گیرکران و لە بیابانەکانی رۆژئاواو باشوری عێراق و هەندێ ناوچەی تر لە کوردستان خۆی دا. چ ئەوانەی لە زیندانیدان و گرتوخانەکانی رژێم لە ژێر ئەشکەنجەدا ژیانیان لە دەست دا.

ب- درێژەدان بە ریسوا کردنی ئەو تاوانە بە هەوو شێوازێ لە ناوەو دەرەوەی کوردستاندا.

٢- دەربەدەرکردنی دانیشتوانی (٤٤٨)گوند دوای کاول کردنی گوندەکان کە ژمارەی دەربەدەرکراوەکان(١٠٠)هەزار کەس زیاتر بوون. ئەم دەربەدەرانە لە ژێر زەبری تۆپی دوورهاوێژو فرۆکە جەنگیەکانی رژێم و پەلاماریبێبەزیانەی سوپاو جاشە چلکاوخۆرەکانی رژێم بەرەو سنورەکانی ئێران و تورکیا رەویان کرد. چونکە ئامادە نەوون خۆیان بەدەستەوە بدەن. دوای ئەو تاوانە جانەورانەی کە بە چاوی خۆیان دیتیانو لە مێژووی گەلانی ئەم سەردەمە وێنەیان زۆر کەمە. پەنابەرەکان لە ئێران بەبێ کۆسپ و تەگەرە وەرگیران. بەلاّم رژێمی تورکیا هاوپەیمانی رژێمی بەغدا ئامادە نەبوو رێگا بەو لێقەومانە بدات بچنە ناو خاکی کوردستانی تورکیا. تا لەلایەن (U"N) ورای گشتی جیهان فشارێکی زۆر خرایە سەر ئەم رژێمەی تورکیا. دەبێ ئەوەش بلێین کە ئەم پەنا هەندانە لە تورکیاو ئێران دووچاری ژیانێکی زۆرسەخت بوونە چونکە (U"N) و رێکخراوە خێرخوازەکان هیچ یارمەتنیەکی ئەو لێقەومانەیان نەدا کە شایەنی باس بێت. تەنانەت رژێمی تورکیا رێگەیان بە کرێگرتەکانی رژێمی بەغدا دا کە

نـانی پـەنا بـەرکان ژەهـراوی بکـەن. ئەمــەش تـاوانێکی دیکـەی رژێمـی بەغدابوو بەیارمەتی رژێمی تورکیا دژی گەلی کوردستان بەگشتی.

ج) هەڵسان بـە هەڵمـەتێکی تیکـرای هـەموو لایەنـە کوردسـتانیەکان بەهـەموو ریگایکی ئاسایی بۆداواکردنی دادگای کردنـی سـەرانی رژیمـی دیکتـاتوری بـەغـدا لەسەر ئەنجام دانـی ئـەو تاوانانـەی لـە ژیـر نەخـشەی ئـەنفال جیبـەجی کـران , دریـژەدان بـەو هەڵەتەتائـەو رۆژەی ئـەم دادگـای کردنــە لەلایــەن نەتــەوە یەکگرتوەکان بریاری لەسەردەدری .

ء) هەلسان بەرهەڵمەتێکی بـەرفراوان بـو قەرەبوکردنـەوەی زیـان لیکـەوتوەکان لەخـەلکی کوردسـتان بـەهوی شالاوەکانی ئـەنفال ووە , لەلایـەن ئـەو کومپانیـە بێگانانەی چەکی کیمیایان بەرژیمی دیکتاتوری بەغدا فروشتوە.

ه) هەوڵدان لەگەڵ رێکخراوی نەتەوەیـەکگرتوەکان بـۆ تـەرخان کردنـی بەشیك لـەو رێژەیـەی داهاتـەی نـەوتی عـیراق , بـو قەرەبووکردنـەوەی ئـەو زیـان و زەرەرانەی لەخەلکی کوردستان کـەوت لـە ئاکـامی تاوانـەکانی رژیمـی دیکتـاتوری بەغدا دژی گەلی کوردستان بە تایبەتی تاوانـەکانی (ئـەنفال) . لێرەدا دەپرسین بـوچ کومپانیـا و ئەوکریکارانـەی لـەو کومپانیانـە کاریـان دەکـرد لـە ئاکـامی هیزەکانی رژێم بوسەر

پەلاماردانی ئەمەنزیکەی شەش سال ئەو پارەیە و پولە زور وزەبەنـدەی داهاتی نەوتەکەمولکی خەلکی عیراقـە بویـان خـەرج دەکـری کەچـی خـەلکی کوردسـتان کەبەشـیکە ئـەو مافـەیان نـەبێ ئـەوەی راسـتی بیـت خـەلکی زیـان لیکـەوتوی کوردستان لەهەموکـەس ولایـەنیك زیـاترە مـافی قـەرەبو کردنـەوەیان هەیـە لـە داهاتـەی نـەوت . بەتایبـەتی کـەبریکی زوری ئەونەوتـە لـە خـاکی کوردسـاتان دەردەهینری .

و) بایـەخ دانیکـی تایبـەتی بـە ئـاوەدان کردنـەوەی شـاری هەڵبجـەی شـەهید لەلایـەن هـەردوو بەریوەبەرایـەتی کوردسـتانەوە جونکـە هەڵبجـە شـاری

هەمووکوردیکی دلسوزە و ئەرکی هەمولایەکە بایەخ بە ئاوەدان کردنـەوەی ئەو شارە بدات . بو ئەوەی ببیتە چقلی چاوی رژیمی دیکتـاتوری کـە ئـەو تاوانــە گەورەیــەی دژی ئــەم شــارە خــۆراگرە ئــەنجام دا . بــابیرەوەری شالاوەکانی ئەنفال هاندەری هەمولایەنە کوردستانەیەکانی بیت بو کوتـایی هینـان بـە چەسپاندنی یـەکریزی گەلـە کـەمان و لـە دەست نـەدانی ئـەوە دەرفەتەی چاوەروان دەکری بو ئایندەی کوردستان کەبە شیکە لە عـیراق بـا هەمووڵایەکان بە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی نیشتمان پەروەریش لـە ژێـر ئـاڵای روخانــدنی رژێمــی دکتــاتۆری دادەمەزنــدنی سیــستەمێکی دیمــوکراتی پەرلـەمانی کـە فیـدرالیزم لـەم ساتەدا بـۆ گـەلی کوردسـتان دابـین بکـریّ کۆبێتەوە.

باشــەهیدانی کوردســتان و عێــراق دڵنیـا بکـەین لـە ئارامگاکانیــان کەهــەموو لایەنەکانیانی کوردستان خوێنی ئاڵی بەناهەق رژاوی ئەوانیان لە بیرنەکردوە.

ملا حسن

٢٠٠٢/٣/٢١

## سەرچاوەکان

١- شارەزا لە زانستی لە میرات مانەوەی ئینگلیزی د. کریستین عوسدین کە ماموستا لە زانکوی لیفرپول – بریتانیا – گوفاری پیشرەو ژمارە ١٣٢ / ١٩٩٨/٥/٣.

٢-هەفتەنامەی خەبات بەزمانی عەرەبی ژمارە (١٠٦٩) لە ٢٠٠٢/٣/١٥ .

٣- ریکەوتننامەی نەتەوە یککرتووەکان لە سالی / ١٩٤٨ داو ریکەوتنی قەدەغەکردنی کومەلی لە نیوبردنی رەکەزی مروڤ لە سالی / ١٩٥٤/. کە دوایی حکومەتی عیراقیش موری کرد کومەلی نەتەوەکانیش دوای جەنگی جیهانی یەکەم دامەزرا.

٤- بانگەوازی مسعود بارزانی بو ئازادیخوازانی جیهان لە ١٥ / ١٠ /١٩٨٨ .

٥- هەمان سەرچاوەی ژمارەی یەکەم.

٦- ئەم ژمارانە لە (ریکخراوی – میدل ویست ووچ -) کەلە ١٨ /٢/ ١٩٩٢ دا بلاوکردەوە وەرگیراون.

٧- ئەم ژمارەیە لەلایەن ( ئان کلوویدی) پەرلەمانتاری بەریتانی لە سەر لیستی حزبی کریکارانی بەریتانیا و دوستی گەلی عیراق و گەلی کوردستان. بلاوکراوەتەوە

**ڕۆڵی ڕۆژنامەی ئازادی لە گۆڕەپانی ڕۆژنامەوانی کوردیدا:**

ڕۆژنامەی ئازادی کە لە ناوەڕاستی ساڵانی چلدا بەبڕیاری کۆنگرەی یەکەمی حزبی شیوعی عێراق بڕیاری لەسەر دراوە، تێکۆشەری هەمیشە زیندو مەلا شەریف ڕەنگریژانی بە ڕاسپاردەی سکرتێری دامەزرێنەری حزبی شیوعی عیراق شەهید یوسف سلمان یوسف ((فهد)) کرایە بەڕێوەبەری ئەم ڕۆژنامەیە هەر وەکو مامۆستا صالح حیدری لە هەڵبژاردەی یاداشتەکانی دەنووسی، (( لەمەودواش ملا شەریف ئامادەی کۆنگرەی یەکەم بوو، کە حزب لە ساڵی١٩٤٥دا بەستی و ملا شەریف بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا، هەرچەندە لە ساڵێ زیاتر نەبوو کە هاتبووە ریزی حزبەوە، لە هەمان کاتدا ئەندامێکی نوێ بوو لە ڕادەی ئەندامیەتی کۆمیتەی ناوەندیدا نەبوو، دەرکردنی ڕۆژنامەی ئازادی پێپێەرا، کە دوایی بووە ئورگانی لقی کوردی حزبی شیوعی عێراقی. ڕۆژنامەی ئازادی لە هەل و مەرجێکی زۆرسەخت و تایبەتی بڕیاری لەسەر درا. لە هەلو مەرجێك کە هیچ ڕۆژنامەی کوردی دەرنەکراو. ئامادەکردنی چاپخانە و کەرەستەی چاپ کردن زۆر بە زەحمەت پەیدا دەکرا، نووسەرو تایپێست زۆر دەگمەن بوون،لەم بڕیارەی زایانەشیدادوربینی هاورێ (فهد)وە دەکەوێ. کەلەم سەردەمەدا بایەخی ڕۆژنامەی لە ژیانی خەبایەتی زانیووە و. ڕەنگە دەست نیشان کردنی مەلا شەریفیش هەر لە ئەوە هاتووە کە لەو کاتەدا. نووسەرێکی کوردی زانی لەو باشتر لە حزبدا نەبووە بە هۆی تازە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی سوسیالیزمی زانستی لە کوردستان دا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بیروباوەردوە دەمێك بوو لە زۆربەی وڵاتانی جیهان و لە عێراقیشدا سەری هەڵدابوو. بەڵام بە هۆی دواکەوتووی کوردستان لە بواری زانیاری بە گشتی و زانیاری سیاسی بە تایبەتی، لەبەر بەکارهێنانی زەبروزەنگ لەلایەن حکومەتی بەغداوە دژی هەموو بیروباوەڕێکی نیشتمانی و نەتەوەیی بە گشتی و بیروباوەڕی مارکیزم- لینیزم بە تایبەتی. و نەبوونی پەرتووك و گۆڤاری پێشکەوتن خواز بو زامنی کوردی، هێشتا هەلگری ئەم جۆرە بیروباوەرە لە نێو خەلکی روشن لە

کوردستاندا بەم شێوەیە بڵاونەبوبووەوە. لەم بارودۆخە دواکەوتووەشدا. هوشیاری سیاسی بە تایبەتی هوشیاری چینایەتی لە پلەیەکی زۆر نزمدابوو، سەرچاوەکانی زانستی لە بارەی مارکیزم و سۆسیالیزمی زانستی ئەگەر نەڵێم هەر نەبوو زۆرکەم بوو ئالەم بارە ئالۆزدو سەختەدا ڕۆژنامەی ئازادی. هاتە گۆڕەپانی ڕۆژنامەوانی کوردیەوە، دیارە یەکەم ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە لە مانگی گوڵان ((نیسانی))/١٩٤٥ دەرچووە. بە گوێرەی لێکدانەوەی بەشی هەرە زۆرینەی لێکۆڵەرەوەکانی بواری ڕۆژنامەوانی و هاوڕیانی دێرینی حزبی شیوعی عێراق. بەم دەست پێشخەرییە گرینگەش ڕۆژنامەوانی کوردی هەنگاوێکی گەورەی بەرەو پێشەوە بڕی و. ئەگەر هەڵ و مەرجی عێراق و کوردستانی- عێراق نەختێ لەبار بووایەو بەم شێوە توند و تیژییە سەرۆکوتانەی سیاسی لە گۆڕێ دانەبوایە ڕەنگە ڕۆژنامەی ئازادی بیتوانیایە ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری لە بواری ڕۆژنامەوانی ودەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی بەوشەو وزاراوەی سیاسی و زانستیانە هەبوایە. بە تایبەتی دوای سەرکەوتنی حزب لە هێنانی کومەڵێك لە تێکۆشەری شیوعی کوردستانی بوریزەکانی خۆی . هەروەکو بەرێز صالح حیدری لە یاداشتەکانی دا باسی دەکات. دیارە دوای دەرچوونی چەند ژمارەیەك لە (ئازادی) لە ساڵانی/ ١٩٤٥، ١٩٤٦ کە من هیچ یەکێکم لەم ژمارانە نەدیوە. لە سەرەتای ساڵی/ ١٩٤٧ کە هاوڕێ (فەهد) لەلایەن دەستگای سیخوڕی رژێمی پاشایەتی دەستگیر دەکرێ، هەموو دام و دەزگای حزب تووشی شلەژان دەبن. و مەلا شەریفیش چالاکی سیاسی خۆی رادەگری و رایدەگەینێ کە تا سەرکردە مەزنەکەی (مەبەستی هاوری فەهدە) ئازاد نەکرێ . صالح حیدری لەم بارەیەوە دەنووسی (لە ساڵی ١٩٤٧ دەستی لەکاری حزبیدا کێشایەوە و، ئەم هەنگاوەشی بەوە پاساو دایەوە کە باوەڕی بە سەرکردایەتی نوی نییە (سەرکردایەتی مالك سیف- یهودا صدیق) نەشگەرایەوە بۆ حزب لە سالی/ ١٩٤٩شدا چەند ساڵێك زیندانی کرا)ز بەم هۆیە بەبۆچوونم ئازادی ڕادەگیرێ. لە پاییزی ساڵی/ ١٩٤٨ دا، چاوم بە ژمارەییەکی ڕۆژنامەی ئازادی کەوت و لە بیرمە کە یەکی لە وتارەکانی لە بارەی

کێشەی زەوی و زار بوو، لە نێوان جوتیارەکانی (عەربەت) و خاوەن زەوی و زارەکانی ئەو گوندە کە ئەو کات گوندبوو، وتارەکە داوای دەکرد ئەم کێشەیە بۆ بەرژەوەندی جوتیاران چارەسەر بکرێ. من لەگەڵ ئەم ژمارە بەسەرهاتێکی کورتم هەیە، حەز دەکەم بۆخۆشی روداوێك لە بارەی ئەم ژمارەیەی ئازادی بۆ خوێنەرە بەرێزەکان بگێرمەوە. لە مانگی ت١/ ١٩٤٨ لە هەولێر بووم. هاوڕێیەك ی ئەو سەردەمەم دیت لێی پرسیم کە ئایا ئەگەرێمەوە بۆ رواندز؟ منیش گوتم بولی هەر ئەمرۆ ئەگەرێمەوە، گوتی کەواتەوەرە بەریدێك هەیە، لەگەڵ خۆتدا بیبەرەوە بۆ رێکخراوی ئەوێ. منیش گوتم باشە و بەیەکەوە چووین بۆ گەرەکی عەرەبان، لەوی بردمی بۆ ماڵێك زەمبیلێکی لە گەڵای خورما دروست کراوی دایە دەستم و گوتی ئەمە بەریدەکەیە منیش هاتم بۆ گەراج، ئەو کاتە تەنیا باصی تەختە لە نێوان هەولێرو رواندز ئیشیان دەکرد و دوای نیوەرۆ بوو، پاسەکە کەوتەرێ تاگەیشتینە گەلی _علی بگ) شەو داهات و لەوێ بنکەیەکی پۆلیس هەبوو . پۆلیسێك سەرکەوتە سەر پاسەکەو دەستی کرد بە پرسینی ناوی سەر نشینەکان و پشکونینی ئەو شت مەکەی پێمان بوو، لەمن نزیك کەوتەوەو فانۆسێکی بە دەستەوە گرتبوو، منیش زەمبیلەکەم لە ژێر خۆمەوە دانابوو، بە رێکەوت ئەفسەرێکی سەربازی لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. دیارە بوو لەم کردەوەی پۆلیسەکە زۆر تورەبوو. بە عەرەبی پێی گوت ئەمە تۆ چی دەکەی؟ کابرای پۆلیس سەری هەڵنەبڕی بزانێ ئەمە کێیە قسەی لەگەڵ دەکات. بۆیە بەوشکی وەڵامی دایەوەو گوتی نایبینی پاسەکە دەپشکنم. ئەفسەرەکە زۆر تووڕەبوو پێی گوت دابەزە هەی والێکراو. ئینجا پۆلیسەکە سەری هەڵبڕی و دیتی کەئەمە ئەفسەرەو یەکسەر سلاوێکی عەسکەری بۆکرد و داوای لێبوردنی کرد وازی لێ هێنانین و رۆیشت.، بەم شێوەیە لەم پشکنینە رزگارمان بوو، زەمبیلەکەم هێنایە رەواندز و دامە دەست هاورێیەکی بەرپرس. ئەمە یەکەم ناسینم بوو لەگەڵ رۆژنامەی ئازادی چونکو رۆژی دوایی ئەو ژمارەی ئازادیم بە دەست گەیشت. کە ئەختێ پشت و باسم کرد.

ئامـاژەم بـەو ڕاسـتیەکرد، کـە دوایـی دەسـت گیرکردنـی هـاوڕێ (فەهـد) هـەموو دەستگاکانی حزبی دووچاری شلەژان بوون، لەمانەش دەستگای ڕۆژنامەی ئازادی بـە تایبەتی دوای دەست کێشانەوەی ملا شەریف لەکاری حزبیدا. بۆیە ڕەنگە ئـازادی ماوەیـەك وەسـتابێ. بـەلاَم دوای سـەرکەوتنی ڕاپـەڕینی ك٢/ ١٩٤٨، کـە حزبـی شـیوعیمان ڕۆڵـی سـەرەکی لـەم ڕاپەڕینـە مەزنـەدا گێـڕا. کۆمەڵـە دەسـتکەوتێکی سیاسی- دیموکراتی بە دەست هێنران و ژیانی حزبایـەتی گورج وگۆڵێکی بەرچاوی بەخۆیـەوە دیـت و، ئـازادیش جارێکی تردەسـتی کـردەوە بـە دەرچـوون و، وەکـو لـە هاوڕێ عزیز محەمەدم بیست یەکێك لەوانەی لەوکاتـەدا لـە ڕۆژنامـەی ئـازادی کـاری کردووە، هاوڕێ ئەحمەد غەفور بووەکە دوای شۆڕشی/١٤ی تەموزیش یەکێك بوو لە نووسەرانی ئـەم ڕۆژنامەیـە. شـایانی باسـەکە ڕژێمـی پاشایەتی لـە پـاییزی /١٩٤٨دا. هێرشـێکی فراوانـی کـردە سـەر ڕێکخراوەکـانی حزبمـان. ئـەم هێرشـە تـا ناوەڕاستی/١٩٤٩ش درێژەی هـەبوو و بـەهۆی خیانـەتی مالك سـیف زیـانێکی زۆر بـە زۆربەی ڕێکخراوەکانی حزبمان گەیشت و ڕژێم ئەم خیانەتەی قۆستەوە. بۆ دووبارە دادگای کردنەوەی هاوڕێ ((فەهد)) و هەردوو ئەندامی م.س ئەو سەردەمە، صارم و حازم بوو، کە لە ئاکامی ئەم دادگای کردنە ناڕەوایە، کە لە مێژووی دادگایـدا وێنـەی زۆر کەمە. چونکە ئەم هاوڕێیانە لە کاتی خۆیدا، لە سالێم١٩٤٧ دادگایی کرابـوون. تـا ئەو کاتە هەرلە زیندان دابوون، بۆیە بە پێی هـیچ یاسایێك ڕەوانییـە، جـارێکی تـر بە هەمان تومەتەکانی پێشوو دادگای بکرینەوە. بەلاَم ڕژێمی پاشایەتی ئـەم تاوانـە مەزنەی ئەنجامداو ئەم هەرسێ هاوڕێیە و چەند هاوڕێیەکی تریشی بەلەسێدارەدان حوکم دان و ئەم حوکمە قەرەقوشیەشی لە ١٤،١٥/٢/١٩٤٩ جێبەجێ کرد، بە هۆی ئـەو هیرشـە بەرفراوانـەش زیـانێکی زۆر گـەورە بـە حزبـی گەیـشت و جـارێکی تـریش ڕۆژنامەی ئازاد لـە دەرچووندا وەستایەوە. وادەر دەکـەوێ کـە دوای هێوربوونـەوەی بارودۆخی سیاسی بەشێوەیەکی ڕێـژەیی بـە گوێرەی حزبـی شـیوعیمان، لـە سـالآنی ١٩٥٠، ١٩٥١دا پاش ئەو پەلامارە دڕندانەوە کرایە سەری لە سالآنی ١٩٤٨، ١٩٤٩ دا. بیرلە

دەرکردنەوەی ئازادی نەکراوەتەوە.چونکە(بهاء الدين نـوری) کـە ئـەو کـات تـا سـاڵی/ ١٩٥٣، سکرتێری حزب بوو لە یاداشتەکانی هیچ باسی رۆژنامە ئازادی ناکات، کەچی باسی کڕینی کەرەسەیەکی چاپ دەکات کە بە چل دینار کڕیویانە و باسی دەکـات کـە لـە سـاڵی/١٩٥٢ دا چـاپەمەنی حـزب گەیـشتۆتە ئـەو پـەڕی چـالاکی و لـەو سـاڵە کۆمەڵەیەك پەرتووك و نامیلکەیان چاپ کراوە وێرای بەیاننامـە حزبیـەکان٤) بـەڵام هـاوڕێ دڵـزار لـە نامیلکـەی ((پاشـکۆی بـیرە وەرییـەکانم)دا باسـی ئـەوە دەکـات کـە لەساڵانی ١٩٥٤ و ١٩٥٥ ڕۆژنامە ئازادی لە کەرکوك دا دەرکراوە. بەسەرپەرشـتی بـەڕێز کاکەیی فەلاح کە لەهەمان کات دا سکرتێری لێژنەی لقی کوردسـتانی حـزبیش بـووە ((و هاوڕێ دڵزار خۆشی ماوەیەك لـە سـاڵی/١٩٥٥ دا. لـەو ماڵـە ژیـاوە کـە چاپخانەی کۆمیتەی لق و کاکـەی فـەلاحیش هـەر لـەو ماڵـە ژیـاوەو . بـەهاوکاری هـەردووکیان مانگانـەی ئازادیـان دەردەکـرد و بەیاننامـەکانی تریـشیان چـاپ دەکـرد-٥-) و دیـارە ڕۆژنامەکـە لەسـەر دەسـتی کاکـەی فـەلاح و هـاوڕێ دڵـزار لـە ڕوی زمانـەوانی و ئەدەبیـەوە بـەرەو پـێش ڕۆیبـشتووە، چـونکە هـەردوکیان شـاعیر و نوسـەر بـوون، و کاکەی فەلاح کە ئەندامی ك.ن. حزبیش بو پیاوێکی بـە توانـاو لێهـاتووبوو. ئـەوەی دێتەوە یادم ئازادی لە ساڵی/ ١٩٥٦ دا، ڕۆڵێکی کاریگەری دەگێڕا. چونکە لەم ساڵەدا ، بە دەست پێشخەری هاوڕێ تێکۆشەرو هەمیشە زیندو (سـەلام عـادل) ڕێکخراوەکـانی حزب یەکیان گرتەوەو لە مانگی ئەیلولی هەمان ساڵیشدا. کۆنفرانسی دووەمی حـزب بەسـترا و لـەم کۆنفراسـەدا بەدواداچـوونەوەیەکی زانـستیانە بـۆ ڕێبـازو سیاسـەتی حزب کرایەوە. بە تایبەتی لە بارەی کێشەی رەوای گەلی کوردستان و بۆ یەکەم جار ڕێبازێکی زانستیانە بۆ ڕێبازو سیاسەتی حزب کرایەوە، بەتایبەتی لە بـارەی کێشەی رەوای گەلی کوردستان و بۆ یەکەم جار ڕێبازێکی زانستیانە لەبەر ڕۆشنایی مارکیزم لێنینزم لە بارەی کێشەی نەتەوەیی ئەم گەلە داڕێژرا، کە پوختەکەی بریتی بـوو لـە دانـنان بەماف بڕیاردانیچارەنووس لەلایەن گەلی کورد خۆیەوەو، بۆ ئەو سـەردەمیش دروشمـی ئۆتۆنـۆمی وەکـو چارەسـەرێکی کـاتی بەرزکرایـەوە. ڕۆژنامـەی ئـازادیش

بەڵگەنامەکانی کۆنفراسی بە درێژی بلاوکردەوە، ئەم یەکبوونەوەی ریزەکانی حزب و بەستنی کۆنفرانسی دووەمیش تەوژم و تینێکی قوڵی بە رێکخراوەکانی حزبدا بە تایبەتی بڕیاری حزب لە مەڕ کێشەی ڕەوای گەلی کوردستان. ئەم دوو هەنگاوە مەزنەش، لە کاتێکدا هاتن، کە بزافی ئازادیخوازی گەلانی عەرەب بە سەرۆکایەتی (جەمال عەبدوالناسر) لەگەرمەی جموجۆڵە دابوو. و لە هەندێ بۆچوونی دا لەگەڵ بزافی ئازادیخوازی کوردا هاوجووت بوون، بە تایبەتی لە دژایەتی کردنی پەیمانی سنتو کە ب ەپەیمانی بەغداش ناوی دەهێنرا، ئەو پەیمانەی بە پلەی یەکەم دژی مافەڕەواکانی گەلی کوردستان و بزافی ئازادی خوازانەکەی بوو، هێشتا لە بیرمە کە دوای هێرشە سێ قۆڵیەکەی، ئینگلیز و فرنسا و ئیسرائیل بۆسەر کۆماری میسر. لە پاییزی ساڵی/١٩٥٦دا، ئازادی لە لە ژمارەییەکی دا بە ناونیشانی (دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە) سەروتارەکەی بۆ دژایەتی ئەو هێرشە سێ قۆڵیە تەرخان کردبوو. لەم وتارەیدا پشتگیری گەلی کوردستانی، بۆ گەلی میسر و سەرکردایەتیەکەی دەربڕیی بوو، دەریخستبوو کە دوژمنی بزافی ئازادی گەلانی عەرەب ئیمپریالیزم و پەیمانی سنتو کە دوژمنی بزافی ئازادی گەلانی عەرەبە، بەڕژێمی پاشایەتی بەغداشەوە. هەر ئەمانەش دوژمنی راستەقینەی گەلی کوردستانن بۆیە پێویستە ئەم دوو گەلە تێکۆشەرەو بزافە ئازادیخوازەکانیان هاوکاری یەکتر بکەن. لە پێناو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سەنتو و روخاندنی ڕژێمی پاشایەتی لە بەغدا و پاکتاوکردنی بنکەکانی ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لە ڕاستی دا ڕۆژنامە ئازادی لەو سەردەمەدا. بلندگۆی هەزارو چەوساوەکانی کوردستانی عێراق و ئاڵای برایەتی گەلی کوردستان و گەلانی عەرەب بوو، لەسەر بنەمایی داننان بە مافە نەتەوەییەکانی هەر دوو نەتەوەو سەر لە نوێ ڕێکخستنەوەی ناوچەکەدا، لە ژێر ئاڵای ئازادی و دیموکراتی داکە هەندێ ماف بە پەلەی چینە هەژارو چەوساوەکانیش دابین بکرێن خەباتیش دژی ڕژێمی پاشایەتی و لە پێناو ڕوخاندنی یەکێك لە دروشمە هەرە بەرزەکانی بوو. لەو هەلو مەرجە

سەخت و دژوارەی عیراق و کوردستان شیلگیرانە داکۆکی لە خەڵکی کوردستان لە هەموو پارچەکان دا دەکرد، لە یادمە لەیەکێ لە وتارەکانی ئەو کاتەی ئازادی داکۆکی لە بزافێکی چەکداری لەو سەردەمەشدا کۆمیتەی لقی کوردستان دامەزرێندرایەوە و بەرێزخێڵی جوانرۆ کە بە شێکی ئەم خێڵە لە کوردستانی ڕۆژهەلاتدا جێ نشین کردبوو .بەوپی و دانگەی کە کورد بە گشتی نەتەوەیەکی ماف خوراو و چەوساوە بوون لەلایەن هەر چوار دەوڵەتی نۆکەرو کۆنەپەرستی ئەو سەردەمەدا. لەو سەردەمەشدا کۆمیتەی لقی کوردستان دامەزرێندرایەوەو بەرێز صالح حیدری کرایە بەرپرسی یەکەمی ئەم کۆمیتەیە و حمید عوسمانیش جێگری بوو، کاك صالح لە بارەی ڕۆژنامەی ئازادری لەو کاتەدا دەنوسێ. (( مالێکی حزبیمان دامەزراند لەگەڕەکی شۆڕیجە. ئەو گەڕەکەی زۆرینەی دانیشتوەکانی کوردبوون. و چاپخانەی لقمان هێنایە ئەو ماڵەو، خێزانی کاك سعید ناکاممان جێنشین کرد. چونکە سعید شارەزاییەکی باشی لە کاروباری نوسین و ڕێکخستن و چاپکردندا هەبوو. بەمەش بووە نوسەر لە ڕۆژنامەی ((ئازادی کوردستان))ی ئۆرگانی لقی کوردی حزبی شیوعی عێراق، ویرایی نوسین پیتەکانی ڕێك دەخست و ڕۆژنامەکەشی لە هەمان کات چاپ دەکرد٦)) ئەم کارەش تا ناوەڕستی ساڵی/١٩٥٧ درێژەی هەبوو. دیسان نەختێ گیروگرفت لە چاپ کردن و دەرکردنی ئازادی هاتە پێشەوە. لەبەر ئەو هۆیەیی کەلەسەرەوە باسمان کرد، دەرکردنی ئازادی تا دوای شۆڕشی١٤/تەمموز دوا کەوت. حزب هەر لە سەرەتای ساڵی/ ١٩٥٩ دا داوای کرد ڕۆژنامەی ئازادی بواری پێ بدرێ بە ئاشکرا دەربچێت چونکە دوای بەرپابوونی شۆڕش کۆمەڵێك ئازادی دیموکراتی بە هۆی شۆڕشەوە بە گەلانی عێراق دران، دوای ماوەیێکیش ڕێگا درا لەلایەن حکوموتی شۆڕشەوە بە گەلانی عێراق دران. ئەم زیارە دەربکرێ و ، حزب کاروبارەکەی ڕێکخست و هاوڕێ شەهید نافع یونس کرایە سەرنووسەری ڕۆژنامەکەو بریار درا کە لە شاری کەرکوکی مەڵبەندی دێرینی گەلی کوردان دەربکرێ ئەوە بوو چەند ژمارەیەکی لەوێ دەرچوو کە یەکەم ژمارە لە ١/ئایاری١٩٥٩

دەرچوو. لەگەڵ هاوڕێ نافع دەستەیەکی نوسین لە کۆمەڵە هاوڕێیەکی خاوەن بەهرە پێکهێنرا، لەوانەی ناوەکانم لە بیرە هاوڕێ ئەحمەد غەفور و مامۆستا عەمەر عارف قاپ رەش و هاوڕێ حەمەکەریم فەتحوڵلا بوون، بەلام بە هۆی رووداوە دڵتەزێنەکەی ١٤/تەمموز/١٩٥٩ بارودۆخی شاری کەرکوك ئاڵۆز بوو، بۆیە حزب دەرکردنی رۆژنامەکەی گواستەوە بۆ بەغدا. هەر هاوڕێ نافع یونیس بە سەرنووسەری مایەو دەستەی نوسینەکەی فراوان کرا، هاوڕێ دڵزار کە دوای گواستنەوەی ئازادی بۆ بەغدا خرایە دەستەی نوسین لەم بارەیەوە دەنووسێ ( کاك نافع یونس سەروتاری دەنووسی بەلام کوردییەکەی بە هێز نەبوو، بۆیە گەلێ جار، بە عەرەبی دەینوسی و کاك حەمە کەریم فەتحوڵلا بە کوردییەکی دروست ، دایدەڕشتەوە. مامۆستا گۆران لاپەڕەی شیعر و ئەدەبی دەنووسی و حوسێن عارف لاپەڕەی لاوان و فوتابیانی ئامادە دەکرد و کاکە حەمەی مەلا کەریمیش، مامۆستا گۆرانی لێ دەرچێ، یارمەتی هەموومانی دەداو فرە زیرەك و زیخ بوو٧)). دیارە هاوڕێ دڵزار خۆشی بەرپرسی دوو لاپەڕەی کرێکاران و جوتیاران بووە. بەلام هەروەکو هاوڕێ دڵزار دەنووسێ ( جێی داخەکە لە ڕۆژی ١/١٢/١٩٦٠ دا. هەفتەنامەی ئازادی بە بڕیارێکی عەبدولکەریم قاسم لە دەرچوون ڕاگیرا منیش گەڕامەوە کۆیێ٧یە). بەم شێوەیە ئازادی بۆ دواجار داخرا چونکە حزب ماوەیەك دەرکردنی ڕۆژنامەی ڕاگرت و لە ساڵی/١٩٦٢ بڕیاری دا ناوی ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان بکرێتە ڕێگای کوردستان. کە ئێستاش هەر بەم ناوە دەردەچێت. بەداخەوە هیچ ژمارەیەکی ڕۆژنامەی ئازادیمان لەوانەی لەسەردەمی پاشایەی بە نهێنی دەردەچوون دەست نەکەوت. بە لام نزیکەی پەنجا ژمارەی سەردەمی شۆڕشی١٤/تەمموزی نەمر ماوە لە ئەرشیفی ڕێگای کوردستان شایانی باسەکە لەو سەردەمە پەیام نێری هەفتەنامەی ئازادی بووم لە ڕواندز و کۆمەڵێ دەنگ و باسی ناوچەکە وکارم تێدا بلاوکردۆتەوە کە یەکەم تاقیکردنەوەدم لەکاری ڕۆژنامەوانیدا بوو (هەرچەند ماوەکە کورت بوو، کەوەکو باسمان کرد لە سەرەتای مانگی کانونی یەکەم/١٩٦٠ ئازادی بە

بڕیاری سەرۆك وەزیرانی ئەوسای عێراق داخرا٨١) عەبدولکەریم وەکو زانراوە هەر لە ناوەڕاستی ساڵی/١٩٥٩، لە ڕێبازی دیموکراسی هەڵگەڕایەوە و دەستی کرد بە بەربەرەکانی کردنی هێزە دیموکرات و پێشکەوتن خوازەکانی پێش ئازادی ڕۆژنامەی (الاتحاد الشعب)ی ئۆرگانی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقی داخست. ئەو ساڵو نیوەی کە ڕۆژنامەی ئازادی بە ئاشکرا دەردەکرا، کۆمەڵە ڕۆژنامەنوسێکی بە توانا و لێهاتووی وەکو گۆرانی بوێژی نوێخوازی کورد و کاکە حەمەی مەلا کەریم حەمەکریم فەتحوڵلا. لە هەموو ڕوییێکەوە پێشکەوتنی باشی بە خۆیەوە دیت، دەتوانم لەو سەردەمەدا کە ئەوساش ڕۆژنامەوانی، بە تایبەتی ڕۆژنامەوانی کوردی زۆرکەم بوو بڵێم، خزمەتێکی گەورەی دیموکراسیانەی پێشکەوتن خواز، بووە ئامرازێکی کارا بۆ بەرزکردنەوەی رادەی هزری جەماوەرێکی فراوان . بە تایبەتی لە نێو ریزی لاواندا. دەتوانم بڵێم ڕۆژنامەی ئازادی لە ماوەی ئەم ساڵ و نیوەیدا نەوەێکی نوێی گۆش کرد، بە بیروباوەڕی نیشتمان و نەتەوەپەروەری. هەر مرۆڤێکی ڕۆشنبیر لاپەڕەکانی ئەو ماوەیە ئازادی هەڵبداتەوە بۆی دەردەکەوێ، کە ئەم ڕۆژنامە تا چ ڕادەیەك بایەخی بە کەلەپوری گەلەکەمان داوە. چۆن بوێرانە لە دژی بیربۆچونی ڕەگەزپەرستی وەستاوەتەوە، کە بەداخەوە حکومەتی ناوەندی لە بەغدادا ڕێگای دابوو، کە هەندێ ڕۆژنامەی روو زەرد ئەم بیروباوەڕە ژەهراویانە بلاّو بکاتەوەکە بە ئاشکرا داوایان دەکرد گەلی کوردمان لەنێو بۆتەی نەتەوەیی عەرەبدا بتوێتەوە. هەر ئەم بیروباوەڕە کۆنەپەرستەش بووە یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول دا وەکو کاردانەوەیەك. ڕۆژنامەی ئازادی زۆر بەگەرمی بانگەوازی چارەسەری کێشەی نەتەوەی کوردی بە ڕێگای ئاشتیانەی- دیموکراسیانە بلاّو دەکردەوە، جێگای داخە عەبدولکەریم قاسم خۆی و بەشێك لە دام و دەستگای حکومەتەمەکە هەڵ خزابوونەسەر ڕێگای دیکتاتۆری و پشتگوێ خستنی مافە رەواکانی نەتەوەیی کورد کە دەکرا ئەو مافانە بەبێ شەڕ دابین بکرێن، بەلاّم دیارە کەللە ڕەقی سیاسی ئەو سەردەمە ڕێگر بوو لەبەردەم چارەسەری ئاشتیانەی ئەم

کێشەیە. بەم شێوەیە عێراق بە کوردستانەوە، بەرەو هەلومەرجی زەبروزەنگ ڕۆیشت و، زیانێکی گەورەی بە هەردوو گەلی کوردو عەرەب گەیشت و خوێنێکی زۆر ڕژا، بەروبوومی ئەم وولاتە دەوڵەمەندەبەفیڕۆ درا بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ کە چل ساڵ زیاترە. لەم ماوەیە دیکتاتۆری تاکە کەسی توانی ڕۆڵێکی کاریکەری بگێڕێ، تۆی بێ بڕوایی لە نێوان هەردوو گەلەکە بچێنێ. ئەو گەلەی عێراق کەلە بەسرا وە تا زاخۆ گۆرانی بۆ برایەتی و تەبایی و یەکسانی دەچڕی، ودانی بە مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان دادەنا. بە داخەوە ئەمڕۆ وەکو ئەوسا نەماوە، چونکە دیکتاتۆری خوێن ڕێژ بیروباوەڕی ڕەگەزپەرستی لەناو گەلی عەرەبی عێراق، بەهێزو پارە و پول و چەك بلآوەدەکردەوە. وەکو پێشتریش ئامارەم بۆکرد، ڕۆژنامەی ئازادی لە هەردوو سەردەمی دەرچوونی داکۆکی لە نەتەوەی کورد لە ئیران و تورکیا و سوریاش دەکرد. بۆ نمونە لە سەرەتا ساڵی/١٩٦٠ د، بەبۆنەی دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە دووی مانگی ڕێبەندان ژمارەیەکی تایبەتی دەرکرد و هاوڕێیەکی کوردستانی ئێران بەناوی دکتۆر ئەنوەری لێتۆژینەوەیەکی تێروتەسەلی لە بارەی ئەم تاقی کردنەوەیە ئامادەکردبوو، لەم ژمارەیەدا بلاوکرایەوەو، سەدان دانەی بۆ ناوەوەی ئێران ڕەوانە کرا، بە ڕێگای گوندی زینوێی سەرسنوری ئێران و ڕەنگە لە ناوچەکانی تریش لەم ژمارە چەند دانەیەك ڕەوانەکرابێ، بۆ ئەوەی کوردەکانی ئێران بیرەوەری ئەم تاقیکردنەوەی گرینگەیان لەیاد نەچێ. هەر لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا. کە تێکۆشەری ناسراوی گەلی کورردستانی ئێران (غەنی باوریان و هەڤاڵەکانی دادگایی دەکران، لەلایەن دامو دەستگاکانی ڕژێمی پاشایەتی گۆڕکراوی ئێران. ئازادی زۆر بە گەرمی داکۆکی لێکردن و داوای ئازادبۆ کردن گشتی جیهانی هان دا، بۆ ڕیسواکردنی ئەم ڕژێمە کۆنە پەرست و دژی گەلیە و راگرتنی ئەم دادگاییە ناڕەوایە، لە یادم نییە ئەگیینا لەو باوەڕەدام کە ئازادی داکۆکی لە مافە ڕەواکانی کوردستانی تورکیاو سوریاش کردووە. بەم بۆنەیەوە داوا لە وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کەردستان دەکەم. کە بایەخێکی باش بە هەردوو سەرنووسەر...

هەلکــەوتووی ڕۆژنامــەی ئــازادی بــدات بــەڕێزان نــافع یــونس و مــەلا شــەریف ڕەنگەڕێـژانی کـە دەتـوانم بڵێم یەکـەم ڕۆژنامەنووسـی سیاسـی بووەلـە کوردسـتانی عێراقـدا و مـاف بەسـەر هـەموو لایـەك هەیەکـە ڕێزلێنـانێکی تایبـەتی بـۆبکرێ. هەروەها بە پێویستی دەزانم ڕێزلێنـانێکی تایبـەتی بـۆ هاوڕێ نـافع یونـسی شـەهید ڕێـك بخرێـت کـە سـاڵ و نیویـك ڕۆژنامـەی ئـازادی بـەڕێوەبرد، و درێغـی نـەکرد لـە داکۆکی کردن لە مافە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کوردستان. وێڕایـی داکـۆکی کردنـی لـە چـینە هـەژارو چەوسـاوەکانی کوردسـتان/ کـەدام و دەسـتگاکانی حکومـەتی ئـەو سەردەمی بەغدا دەیچەوساندنەوە، مافە چینایەتیەکانی پێشێل دەکردن. لەمانـە بـۆ نمونــە پارێزگــاری ئەوســای هــەولێر(بــەدرەدین عــەلی) کــە کۆنــە ئەفــسەرێکی کۆنەپەرســتی ڕژێمــی پاشــایەتیبوو، تاســەر ئێــسقان دژی مافــە نەتــەوەی و چینایەتیەکانی گەلی کوردستان بـوو، هاوڕێ نـافع یـونس کـە ڕۆڵەیـەکی بەئەمـەکی ئەم شارەی هەولێرو هەموو کوردستان بوو . ماف ئەوەی بەسەر حکومـەتی هـەرێمی هەیە کە پەیکەرێکی بۆ بکرێ و لەیەکێك لەگۆڕەپانـەکانی شـاری هـەولێری خـۆڕاگر دابنـدرێ. بـەم بۆنەیـەش هـەزاران سلاو بـۆ یـادی ئـەم دوو کەلـە ڕۆژنامەنووسـەی کوردسـتان و چـینە هـەژاررو بەشمەینەتیـەکانی کوردسـتان و شـاری هـەولێر ڕەوانـە دەکەم.

فەتاح تۆفیق (مەلا حەسەن)

٢٠٠٥/٢/٢

**سەرچاوەکان**


١- هەڵبژاردە لە یادەشتەکانی صالح حیدری بە زمانی عەرەبی لاپەڕە-٣٧-

٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕە -٤١-

٣- یاداشتەکانی بەهائەدین نوری بە زمانی عەرەبی لاپەڕە-١٠٤-

٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕە-١٠٩-

٥ پاشکۆی بیردوەرییەکانی دلزار لاپەڕە -١٠-

٦- هەڵبژاردە لە یاداشتەکانی ساڵح حەیدەری بە زمانی عەرەبی لاپەڕە (٣١٢)

٧- پاشکۆی بیرەوەرییەکانی دلزار لاپەڕە-١١-

٨- هەمان سەرچاوە-١١- .


## ناوەندی بازرگانی رۆژهەلاتمان بۆ چیە؟!!

لەم دوایانە لەناو جەرگەی شاری هەولێری دێریندا، دەست کرا بە دروست کردنی ناوەندێکی بازرگانی زۆر گەورە. بەناوی ناوەندی بازرگانی رۆژهەلاتی ناوەراست. لەسەر رووبەرێکی فراوان بەپانتایی ((...ر.. مەتری دووجای، کە سێ سەد ملیۆن دۆلاری ئەمریکی بۆ تەرخان کرا. لەوانەیە ئەو مەبلەغە لەو پارەیە بێت کەلەلایەن کۆمەڵە دەوڵەت بەپیتاك دراوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی عیراق. کەکوردستان و شاری هەولێریش دەگرێتەوە، بە گوێرەی نەخشەسازی ئەم پرۆژە گەورەیە، ژمارەیەکی زۆر بالاخانە و ئەپارتمان و خواردنگە و هوتێل و گەراژ لە خۆی دەگرێ.

- دروست کردنی ئەم ناوەندە زل و شارستانیە، رۆڵێکی زۆر لە جوان ک دن و رێك وپێك کردنی شارە دێرینەکەمان دەگێرێ و لەوانەشە د ی بازرگانی لەم شارەو لە کوردستاندا بەگشتی بەرەو پێشەوەببات و زۆر کۆمپانیاو بازرگانی گەورە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا رووله شـ دك ان بکەن. بەمەش ناوبانگی ئەم شارە خۆشەویستە لەم هەر و لە جیهانیش زیاتر بناسری وەکو مەڵبەندێکی بازرگانی ئەماد ەموویان

پرسەگەلێکی گرینگ بۆ کوردستانی دواکەوتومان تۆماردەکەن، و جێگای بایەخ پێدانەن.

- بەلاّم لێرە پرسیارێك خۆی قوت دەکاتەوە، ئایا ئەم ناوەندە زەبەلاحە بۆ ئەمرۆی شاری هەولێر زۆر پێویستە؟!! بەتایبەتی ئەگەر بزانین زۆرخەلکی ئەم شارە هەزارو پەراگەندەی دێهاتەکانی ئەم پارێزگایەو خەلکی بەزۆر راگوێزراوی پارێزگای کەرکوك و ناوچەکانی دیکەی کوردستان پێویستیان بە پرۆژەی بەرهەمهێنەر هەیە. نەك پرۆژەی بازرگانی کەتوێژاڵێکی کەمی ئەم شارە کەلکی لێوەردەگرن!!!
- هەمووولایەکمان ئەو راستیە دەزانین کە کوردستان بەگشتی ماوەیەکی زۆر لە بایەخ دان بەلایەنی ئابووری لە بیرکرابوو ورژێم پیشەسازی لەم دەڤەرە دروست نەدەکرد. بۆ ئەوەی ئەو کۆمەلگای کوردەواریەی هەر بە کۆمەلگاییکی دەکارهینەر ((مستهلك)) و دوا کەوتوویی بمینێتەوە و چینی کرێکاری گەشە نەکات. بۆیە تائەمرۆش سیما و سەکوتی شاری جوتیاری پێوە دیارە، لەگەڵ ئەوەی لە رۆژی زۆری دانیشتوانی بومتە شارێکی گەورە. بەداخەوە دوای راپەرنییش پێش سیانزە ساڵ ئەم سیمایەی هەرماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی لەم ٣-٤ ساڵەی دوایی بایەخێکی باشی لە روی جوانکاری پێدراوە.
- تەنانەت دوای بریاری ((٩٨٦)) یش ئەوەندە روخساری شارەکە بەتایبەتی لەروی پیشەسازیەوە نەگۆراوە. بەهۆی مانەوەی ئابلۆقەی ئابوری لەسەر عیراق بەگشتی کە رێگر بوو لەبەردەم بوژانەوەی ئابوری بەتایبەتی لە بواری پیشەسازیدا. ویرای ئەو رۆتینیەی لەلایەن کاربەدەستانی U.N کاری پێدەکراو، وێرای ئەو گەندەڵیەی لەناودام و دەزگاکانی U.N لە عیراق و کوردستاندا هەبوو، سەرباری هەوڵ و کۆششەکانی رژێمی دیکتاتۆری کە دەیویست کوردستانی ئازاد کراو، وەکو پێویست کەلّك لەو

بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرنەگری. ئەم مەسەلانەی کە دوای ڕوخانی ڕژێمی دیکتاتۆری ئاشکرا بوون، ئەی ئێستا چ بیانوویێك بۆنەوە بدۆزینەوە، کە پرۆژە بەرهەم هێنەرەکان بایەخیان پێ نادرێ و بەڵکو هەر بیر لە پرۆژە جوانکاریەکان دەکرێتەوە. مەبەستمان ئەوەی نیە بڵێین پرۆژە بازرگانیەکان و جوان کاریەکان بایەخیان نییە. بەلام لێکۆڵینەوە ئابوریەکان هەمیشە گرینگی بە پرۆژە پیشەسازیە بەرهەم هێنەرەکان دەدەن، بەتایبەتی لەولاتێکی وێران کراوی وەکو کوردستان. کە ئەمرۆ زۆر پێویستی بەم جۆرە پرۆژانە هەیە، کە بوارنییە لەم وتارە بەدرێژی باسی لایەنە ئیجابیەکانی بکەم ئەمەو بەداخەوە واهەست دەکەم ئەم پرۆژانەی دەمێکیشە هەن زۆر کەم بایەخیان پێدەدرێ، ئەگەر نەڵێم دژایەتیان دەکرێ وەکو کارگەی جگەرەو هی تریش.

- لێرەداوای بۆ دەچم دەبێ ئەو پرسیارە بکەم، ناوەندی بازرگانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستمان بۆ چییە؟ ئەم جۆرە ناوەندانە زل و زەبەلاحانە لە ولاتانی پێشکەوتوو و گەشە ساندو پرۆژەی کەڵکداردەبن. بەلام لە ولاتانی کاولکراوی وەکو کوردستانی عیراق، دەتوانم بێ سڵ کردنەوە بڵێم کەلکێکی ئەو تۆی نییە!!! ئەمە سەرەرای هەترەکردنی ژمارەیەکی زۆری کاسب کارو دەست فرۆش و خەڵکی هەزار نەبی کەپێش دەست کردن بەم پرۆژەیە ئاگادارکرانەوە و هەندێ کاروکردەوەی کەمیان بۆ کراوە ژمارەیەکی زۆریان هێشتا هەر پەرتەوازەن و بەبێ کاری دەسورێنەوە.
- شارستانیەتی ئەم سەردەمەی ئێمە لەسەر بنەمای پیشەسازی گەشە دەکات بۆیەدەبێ بەرنامەیەکی ڕێکوپێك و لێکۆڵراوەمان هەبی کەلە لایەن کەسانی دڵسۆزو شارەزا نەخشەی بۆ بکێشرێ. ئەگەر دەمانەوێ ئەم وولاتەمان ئاوەدان بکەینەوە و ژێرخانی ئابووری زانستیانەی بۆ دروست بکەین بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی کورت بناخەی کوردستانێکی ئاوەدان و

گەشە سەندوو دابمەزرێنیین و بنیات نەرانی ئەم گەشەسەندنە کە چینی کرێکارە بایەخێکی باشی پێبدرێ خولی بەرزکردنەوەی ئاستی هونەری بۆ بکرێتەوە و زۆر لەمە زیاتر بایەخ بە پرۆژە پیشەسازییە بەرهەمهێنەرەکان بدرێ کە لە یەك کاتدا کێشەی بێکاری تا سنوورێکی باش چارە دەکات و لەلایەکی دیکەوە ئەوەندەی پشت بە هاوردنی کاڵای دەرەوە نابەستین کە دەبێتە هۆکاری چوونە دەرەوەی پارەو پولمان وێرای دانەمەزراندنی ژێرخانێکەی ئابووری پتەو بۆ ئایندەی وڵاتەکەمان.لە قۆناخی دووەم دەکرێ پرۆژەی بێ بەرهەم و جوان کاری بیریان لێبکرێتەوە.

- لەوانەیە ئەم جۆرە نەخشانەلەلایەن هاوپەیمانەکان دارێژرابێ چونکە ئەوان وەکو دەوڵەتی پیشەسازی گەشەسەندوو، نایانەوێ وڵاتانی پاشکەوتوو لە رووی پیشەسای بەرەو پێشەوە برۆین. تاکو هەمیشە بازاری دەکاربردنی کاڵای کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی ئەوان بین. بەڵام لێرە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کە ئایا رۆلی سەرکردایەتی کورد چییە لەم بوارەدا. ئایا دەبێ هەرچی هاوپەیمانەکان بەسەرماندا دەیسەپێنن. بەبێ چەندو چۆن مل کەچ بی؟.

**چاودێرێك**

٢٠٠٤/٦/١٠

# پێکهاتەی ئایینی و نەتەوەیی لەعێراقدا لەبارنییە بۆ نووسینەوەی دەستوور لەم قۆناخەدا

بێگومان دارشتنی دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ عێراقی نوێ ئەرکێکی زۆر پێویستە. چونکەعێراقیش وەکو هەموو دەوڵەتەکانی دیکەی سەر رووی زەوی، پێویستی بە یاسایەکی بنەڕەتی هەمیشەیی هەیە. کە هەموو یاساکانی دیکە وەکو سەرچاوەیەك سەیری بکەن لە کاتی دارشتنیاندا ئەو یاسا بنەڕەتییە ( دەستوور) ەی کە گەلانی عێراق چاوەڕێ دەکەن دەبێ دەستورێکی دیموکراتی فیدراڵی فرەحزبی مافی رەوا بۆ ئەم گەلانە رەنگی تیابداتەوە، و مافی مرۆڤ و سەروەری یاسا و دادی کۆمەڵایەتی و مافی ئافرەتان ومنداڵان بۆ ئەم گەلانە بەبێ جیاوازی دابین بکات، سەروەری دەوڵەتی عێراقی فیدرالی بەسەر خاك و ئاوو کانیەکانی عێراق دەستەبەر بکات. مافی نەتەوەی کورد کە ئەمڕۆ خۆی لە یەکییەتیەکی ئارەزومەندانەدا دەبینێتەوە. لە مافە ئیداری و رۆشنبیرەکانی نەتەوەکانی دیکە سەقامگیربکات.

بەڵام ئایا لەو هەل و مەرجە ئاڵۆزەوپڕ گرێ کوێرەیەی ئێستا لە عێراق، بەو پێکهاتە ئایینی و نەتەوەیە جیاوازەی وولاتەکەمان. بەو دوا کەوتنەی بەشێکی زۆری دانیشتوانی عێراق و دوای ئەو شێواندنە قوڵەیکەرژێمی دکتاتۆری گۆڕکراوی عێراق، لەماوەی چل ساڵ حکومرانی بەو بیروباوەڕە تۆتالیتایایە و رەگەزپەرستیەی، بوارێکی لە باری رەخساندوە بۆدارشتنی ئەوها دەستوورێك؟!! ئایا دەرەنجامی هەڵبژاردنی (کۆمەڵی نیشتمانی) بەتایبەتی لە ناوەراست و خواروی عێراق بارودۆخێکی دیموکراتیانەی وای هێناوەتە پێشەوە؟ کە هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراق چەندین ساڵ خەباتیان بۆ کردووە؟!! بە بۆچوونی من زۆر ئاستەمە لە کەش وهەوایەکی وا نا سەقامگیرو، لە ژێر کاریگەری ململانێیەکی نا دیموکراتی و نا شارستانی کە ئەمڕۆ لە عێراقدا لەگۆڕێ دایە و لە سایەی بزافێکی تیرۆرستی تا

سنورێکی بەرفراوان کە لەلایەن زۆرینەی دەوڵەتە دراوسێیەکانمان پشتگیریان لێ دەکەن و لەهەل و مەرجە هەرێمایەتیە تا لە بارەدا بەرامبەر دوا رۆژی عێراق و دەتوانم بڵێم هەڵوێستی نێودەوڵەوتیش وەکو پێویست یاریدەدەرنییە، بۆ دارشتنی ئەو دەستووردی کە گەلانی عێراق چاوەرێی دەکەن. وا پێشبینی دەکەن کە ئەم هەنگاوە، کۆتایی بەو بارودۆخە نا لەباردی عێراق بهێنێ و ئاسوودەیی و ئارامی بۆ سەرتاسەری وڵات بگەرێتەوەدو دوای دارشتنی دەستوور و بڕیار لەسەردانی لەلای جەماوەر و کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵبژێراو، بەرێوەبردنی هەڵبژاردنی تازەی کۆمەڵەی نیشتمانی و دامەزراندنی حکومەتێکی یاسایی. من وا هەست دەکەم لە ژێر سایەی هەل و مەرجی ئێستا زۆر قورسە کە داخوازیەکانی گەلانی عێراق هەموو یابەشی هەرە زۆری جێبەجێ بگرێ. چونکە تەرازووی هێزەکان لەسەر ئاستی ناوخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی مژدەی ئەم خەونە سەوز و سوورانە نادەن!!!

دوا پێکهاتنی حکومەتی کاتی لە کۆتایی حوزەیرانی / ٢٠٠٤ داو پاش پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەندامەکانی ( کۆمەڵەی نیشتمانیش) کۆمەڵانی فراوانی گەلەکەمان جۆرە بۆچوونێکی وایان بۆ دروست بوو. بەڵام ئەوە نزیکەی دە مانگە حکومەتی کاتی دامەزراوەو نزیکەی سێ مانگ بەسەر هەڵبژاردن تێپەریوە. هێشتا نەتواندراوە حکومەتێکی بنکە فراوان لە عێراقدا دابمەزرێ !!! ئایا ئەمە ئاماژە ناکات بەو راستیەی کە گیرو گرفتەکانی ئەم ولاتەی ئێمە گەلێ قوڵن و پاشماوەی رژێمی گۆڕکراو زۆروزەبەندن، کەوا کارێکی ئاسان نییە بە خێرایی چارەسەر بکرێن ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کەپرۆسەی ئازاد کردنی عێراق، بەدەستی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق نەبوو ، بەڵکو پرۆسەیەکی دەرەکی بوو بە پلەی یەکەم رژیمی دکتاتۆری بەغدای روخاند. بەبێ ئەوەی پێشەکی حکومەتێکی کاتی لە هێزە بەرهەڵستکارەکانی و چەکداری لە لایەنگیرانی ئەو لایەنەو بەرهەڵستکارانە دابمەزرێنێ؟! تەنانەت دوای روخانی رژێمیش هاوپەیمانەکان و نوێنەرانیان لە عێراق بە خێرایی هەوڵیان نەدا، بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کاتی لە

بەرهەڵستکاری عێراق بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات. بەڵکو تا دوچاری تیرۆر نەبوونەوە دەیانویست خۆیان کاروباری وڵات بەڕێوە ببەن. بەپێی نەخشەیەکی خۆیان ئەمریکاو ئینگلیز، بەڵام دەرکەوت کە نەخشەیەکی سەرکەوتوو نەبوو، ئەم وێرای چاوپۆشی کردنیان کە دام دەزگاو پیاوە تاوانبارەکانی رژێمی بەعس، کە بە گیانی خوێن ڕێژی لە ماوەی ئەو چل ساڵەی رابردوو پەروەردە کرابوون. ئەمانیش ئەو دەرفەتە زێڕینەیان زۆر باش بە هاو کاری هێزە تاریکستانەکان قۆستەوەدو ریزە لەیەك هەڵوەشاوەکانی خۆیان ڕێکخستەوە. ئەمە دوو ساڵە دڕندەترین تاوان بەرامبەر گەلانی عێراق و ژێرخانە ئابووریەی ئەنجام دەدەن.

دوای ئەم لێکۆڵینەوە کورتەی هەل و مەرجەکان دوای هەڵبژاردنیش ودوا کەوتنی پێك هێنانی حکومەت، لە ئاکامی ئەو مشت و مڕە درێژخایەنە کە هەواڵی رۆژنامەکان وای باس دەکەن کە هەندێ جار لە کەش و هەوایەکی توندوتیژو نادیموکراتیانە بەڕێوە دەچن. ئاماژە بە راستی بۆچوونەکەم دەکات کە پێم وایە نووسینەوەی دەستوورێکی هەمیشەیی دیموکراتی فیدرالی فرەحزبی و دابین کردنی یەکسانی بە هەموو لایەنەکان کەسایەتی خەڵکی کارێکی ئاستەمە و هێشتا کاتی نووسینەوەی ئەم دەستورە نەهاتووە ئەگەر بمانەوێ بە راستی دەستورێکی دیموکراتی – فیدراڵی هاوچەرخ بێت و هەموو ئاوات و ئامانجە دێرینەکانی گەلانی عێراق لە خۆ بگرێ و ببێتە هۆکاری دامەزراندنەوەی عێراقێکی ئاسودەو سەقامگیروگەشەسەندو. بۆیە من هەر لەسەرەتاوە وا هەست دەکەم کە ئەمریکاو بەریتانیا لەسەر بنەمایەکی لاواز دەیانەوێ هەندێ چاکسازی روکەش لەم وڵاتەی ئێمەدا بە ئەنجام بگەیەنن. دیارە ئەمە بەرژەوەندی ئەم دوو دەوڵەتە سەرمایەدارە چاو چنۆکە کە کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانیان دابین دەکات.

کارێکی حاشا هەڵنەگرە کە کۆبوونەوەی هێزە سیاسیە کوردستانیەکان لە لیستی هاوبەشدا، دەبێتە هۆکارێکی کاریگەر بۆ دەستەبەر کردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان بە فیدرالیزمێك بە مانای ( یەکێتیەکی ئارەزوو مەندانە)ی هەردوو

نەتەوەی سەرەکی عێراق کەعەرەب و کوردن. بەرەچاو کردنی مافە نەتەوەیە رەواکانی گەلانی دیکەی عێراق و کوردستانیش. بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزەش تەنیا رێگای پرەنسیپی هەماهەنگی ( توافق) چونکە ئەم ئەرکە بە زۆرینەو کەمینەی پەرلەمان چارەسەر ناکرێ.بەڵام پرەنسیپی هەماهەنگیش دەبێ هێزی گەلی لە دواوە بێت گوێڕەی گەلی کوردستان. بۆیە پێویستەیەکێتی گەلی کورد بە پلەی یەکەم بە هەموو توانایەك بپارێزرێ و قوڵتر بکرێتەوە. نەك لە نێوان هەردوو حزبی دەسەڵاتدار، بەلکو لەگەل هەمووڵایەن و حزبەکانی دیکە و کەسایەتیە نیشتمان پەروەرەکان. ئەمەش هەر بە سەر زارەکی نابێ بەلکە دەبێ رەچاویمافەکانیان بکرێ، و داخوازیە رەواکانی کۆمەڵانی خەڵك بایەخێکی زیاتری پێ بدرێ و گیرو گرفتەکانیان بە شێوەیەکی زانستیانەچارەسەر بکرێ و رێز لە راو بۆچوونەکانیان بگیرێ و دەزگاکانی میری بە خێرایی رێك بخرێنو لە کەسانی نا دڵسۆز و بەرتیل خۆر و نا شایەستە پاك بکرێنەوە.

فتاح توفیق ( ملاحسن )

# رۆڵی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو لە تەقاندنەوە و سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤/ گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨

بەرێز پ٠د٠شێرزاد نەجار لێکۆلینەودیەکی ئەکادیمیانەی لە باردی شۆڕشی ١٤ / گەلاوێژی ساڵی / ١٩٥٨ دا لە ژمارەکانی ١٨٥٣ ، ١٨٥٥ ، ١٨٥٦ / لە رۆژنامەی خەبات بلاو کردەود. بە رێزی بەشێوەیەکی زانستیانە هەل ومەرجی سەرهەڵدانی ئەم شۆڕشە مەزنەی لێك دایەوەو سەلماندی کە ئەم رووداوە گرینگە لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا شۆڕشێکی کۆمەلایەتی بوو نەك کودەتایەکی سەربازی، کە هەندێ لایەن دەیانەوێ بەم جۆرە پێناسەی بکەن٠

بە راستی د٠ شێرزاد لێکۆڵینەوەکی قووڵی ئەکادیمیانەی ئەم شۆڕشەی پێشکەش کردین لەبیرەوەری چل و حەوت ساڵەی داو، بە چڕو پڕی ئاماژەی بە هۆکارە بنەڕەتیەکانی بەرپابوونی شۆڕش کردەوەو رونی کردەوە کە شۆڕشەکە لە بەرژەوەندی چینە نیشتمانیە چەوساوەکانی گەلانی عێراق بوو٠ بەم کارەشی پەردەی لە رووی هەندێ لایەنی شاراوەی ئەم رووداوە سیاسیە هەڵدایەوەو بە پشت بەستن بە هەندێ سەرچاوەی دەرەکی و ناوخۆیی و دەستکەوتە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی رۆشنبیری ئەم شۆڕشەی بۆ گەلی عێراق خەبات گێڕو لایەن سیاسیە کانی ئەو سەردەمەی خستنە روو٠

بەلام هیچ تێخوێندنەوەیەکی مێژوویی بەتایبەتی دوای ئەو ساڵە دوورو درێژانەی مێژووی خەباتی گەلەکەمان، کە نزیکەی پەنجا ساڵە بەبێ کەم و کورتی نابێ ٠وێرای رێزم بۆ نوسینەکەی دکتۆر شێرزاد ، هەستم کرد بایەخێکی ئەوتۆی بە رۆڵی بەرەی نیشتمانی یەکگرتووی ئەو سەردەمە نەدابوو تەنیا یەك جار لە رستەیەکدا ناوی بەرەی هێناوە کە دەی نووسێ ( هەروەها داوای کۆتایی هێنانی

بەربەرەکانی سیاسی ناوخۆیی کرد بەرمیەکی یەکگرتووی پێکهێنا بۆ ئەوەی شۆڕش بتوانێت بگاتە ئامانجەکانی خۆی) لە راستیدا بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو پێش بەرپابوونی دامەزرا بە ماوەی پتر لە ساڵێك و ، رۆڵێکی زۆر کاریگەری لە خۆ ئامادەکردن هەبوو بۆ شۆڕش و کۆتایی هێنان بە رژێمی پاشایەتی کۆنەپەرست ٠دوای پێکهێنانی ئەم بەرمیە کە لەچوار حزبی ئەو سەردەمەی عێراق پێکهێنرا، کە بریتی بوو لە حزبی وطنی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراقی و حزبی ئیستقلال و حزبی بەعس، و بە گوێرەی حزبی دیموکراتی کوردستانیش رێگا بە حزبی شیوعی عێراق درا کە بەرمیەکی دووقۆڵی لەگەڵدا دابمەزرێنێ ئەم بەرە شۆڕش خوازە توانی رێکخراوەکانی ئەم حزبە لە ریزی سوپا دا بەیەك بگەیەنێ ورێکخراوی ئەفسەرە ئازادی خوازەکان پێکەوە بنێ کە ئەم رێکخراوەیە رۆڵێکی سەرەکی لە تەقاندنەوەی شۆڕش لە بەرەبەیانی ١٤ / گەلاوێژدا ببینێ٠ نەك هەر ئەمەش بەڵکو بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو بیرو هۆشی جەماوەری عێراقی بە کوردستانیشەوە بۆ ئەم گۆڕانکاریە مەزنە چاوەڕوانکراوە راکێشا٠ بۆ نموونە سەر کردایەتی حزبی شیوعی عێراق چەند مانگ بوو، ئەندام وجەماوەری خۆی بەو پێشبینیە گۆش دەکرد٠ کە رژێمی پاشایەتی نەمر نییە، بەڵکو رژێمێکی گەندەڵەو جەماوەری گەلەکەمان بە سەرکردایەتی بەرەی نیشتمانی لە توانای دا هەیە ئەم رژێمە بڕوخێنێ٠ سەرەرای ئەمەش کە سەرکردایەتی حزب پێش دوو رۆژ لە بەرپاکردنی شۆڕش هەواڵەکەی پێگەیشت یەکسەر بەیاننامەیەکی کورت و پوختی بۆ رێکخراوەکانی خۆی بلاو کردەوەو، پێراگەیاندن چاوەڕێ بن و خۆتان تەیار بکەن لەم رۆژانەدا رووداوێکی گرنگ لە عێراق سەرهەڵدەدا٠ لەمەش زیاتر هاوڕێ سکرتێری حزب ( سلام عادل)ی شەهید ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوت و دەوروبەری وەزارەتی بەرگری (دفاع) و ناوچە گرینگەکانی شاری بەغدای بەسەر کردەوە، نەوەك هەل و مەرجێکی نا ئاسایی لەم ناوچەیەدا بێ و ببێتە هۆکاری کۆسپ و

تەگەرەهێنانی بەردەم تەقاندنەوەی شۆڕش و بەرەبەیانی ئەم رۆژە پیرۆزە بەدەستی خۆی بروسکەی پیرۆزبایی بۆ سەرکردایەتی شۆڕش نووسی و رەوانەی کرد٠
وێرای ئەمانەش رێکخراوەکانی حزبمان و لایەنەکانی دیکەی بەرەهەر زوو شۆڕشیان لە باوەش گرت ویەکسەر دوای بلاوکردنەوەی بەیاننامەی یەکەم، خۆپیشاندانی گەورە گەورە لەبەغدای پایتەخت و شارو شارۆچکەکانی سەرتاسەری عێراق رێکخرا٠
لە شاری دیوانیە مەلبەندی (فرقە)ی یەکەمی ئەو سای سوپای عێراق کەفەرماندەکەی عمر علی ئەفسەری کۆنەپەرست و ئەلقە لەگوێی رژێمی پاشایەتی یاخی بوونی خۆی دەربڕی دژی شۆڕش٠ جوتیارەکانی ئەم پارێزگایە کەزۆربەیان لە کۆمەڵەی جوتیاران رێك خرابوون ، بەچەکەوە دەروبەری سەربازگەی دیوانیەیان گرت ویستیان پەلاماری مەلبەندی (فرقە) ی یەکەم بدەن ئەمەش ئەفسەرو دەرەجەدارەکانی سەر بە بەرەیان هانداو هێرشیان کردە سەر فەرماندەی (فرقە) و پەل بەستیان کرد و رەوانەی بەغدایان کرد٠ بەم شێوەیە بەهۆی وریایی جەماوەرشۆڕشەکان نەیان توانی هیچ جموجۆلەك بکەن ٠ ئەگینا کۆنەپەرست و نۆکەرەکانی رژێمی پاشایەتی وا بە ئاسانی خۆیان بەدەستەوە نەدەدا ٠
کەواتە بەرەی نیشتمانی یەکگرتووی ئەو سەردەمە رۆلێکی زۆر بەرچاوی هەبوو لە هێنانەکایەی هەل ومەرجێکی لەبار بۆبەرپاکردنی شۆڕش٠ ئەو بەرنامەیەش کە پ٠د٠ شێرزاد ئامازەی بۆکردودو دەنوسێ( رێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی بە سەرۆکایەتی (عبدالکریم قاسم) چەند ئامانج و پرنسیپێکی دانا دەتوانرێت وەکو پرۆژەیەکی تەواو سەیر بکرێت) لە راستیدا ئەم پرۆژە بەرنامەییەش هەر لەو خالانە وەرگیرابوو کە لەبەرنامەی بەرەی نیشتمانی یەکگرتووجێگیرکرا بوو، بەهەندێ دەستکاریەوە٠
یەکێك لەو خالانەی کە نەختێك سەرنجم لەسەری هەیە پ٠د٠ شێرزاد زۆر بە شان وز بالی سەرکردەی شۆڕش شەهید ( عبدالکریم قاسم) ی هەلداوە لەم بارەیەوە دەنووسێ (بێگومان ئەو بەرەیەش پێویستی بە کەسانێکی بە توانا و لێهانوو هەبوو

بۆ بەرێوەبردنی شۆڕش، ئەم جۆرە سیفەتانەش تەنها لە کەسایەتی عبالکریم قاسمدا بەدی دەکرا) راستە عبدالکریم قاسم توانی بە ئازایانە لەبەرەبەیانی رۆژی ١٤/گەلاوێژدا هێرش باتە سەر ناوەندی رژێمی پاشایەتی و لەماوەیەکی زۆر کورت دەستی بەسەردا بگرێ وئەورژێمە بۆگەنە بروخێنێ – بەڵام دوایی ئەم پیاوە نیشتمان پەروەرە پاکە نەیتوانیوەکو پێویست کارو باری وڵات بەرێوە ببات و سەرکەوتوانە شۆڕش بەرەو ئامانجە دیاری کراوەکانی خۆی پیادە بکات. هەر زوو خزایە سەر رێبازی تاکڕەوی و دکتاتۆری و بە تەنیا خۆی دەیویست هەموو کاروبارەکان بگرێتەدەست و یاری لەسەر پەتی راگرتنی هەماهەنگی لە نێوان لایەنگرە راستەقینەکانی شۆڕش و نەیارو دوژمنەکانی شۆڕش بکات. لەم رێبازەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ، هەر لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر شۆڕشدا پشتی کردەهێزە دیموکراتەکانی عێراق و دوژمنەکانی هێنایە پێشەوە و هەموو ئەو ئەفسەرانەی لە ساڵی یەکەم دەرکرابوون یا خانەنشین کرابوون، گێڕانەوە سەر کاری پێشوویان و پایەو شوێنی گرنگیان پێسەپێرا. بە پێچەوانە ئەفسەرە شۆڕشگێڕو کەسایەتییە نیشتمان پەروەرو دڵسۆزەکان دوورخرانەوە هەندێکیان لە گرتووخانەکان بەندکران.

گەلی کوردستان و حزب و لایەنە کوردستانیەکان کە رۆڵێکی باڵایان هەبوو لە پاراستنی شۆڕش لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا، لە پیلانەکانی کۆنەپەرست و داخ لە دڵەکان بە تایبەتی لە پیلانەکەی (شەواف) لە موسڵدا هیچ داخوازیەکی رەوایان جێبەجێ نەکرا، بەڵکوکەوتنە دژایەتی لایەنە کوردستانییەکان و گەلی کوردستانیان پاڵ پێوەنا بۆ بەرپا کردنی شۆڕش. ئەمەش بووە هۆکاری رێگا خۆش کردن لە بەردەمی دژەشۆڕشیەکان و لەگەڵ ئەوەی حزبی شیوعی عێراق و هێزە دیموکراتیەکان کۆششێکی زۆریان کرد بۆ ئەوەی کێشەی رەوای گەلی کوردستان بە رێگایەکی ئاشتیانەی دیموکراتییانە چارەسەر بکرێ ( عبد الکریم قاسم) بایەخی بەم کۆششەنەدا و هەر سوور بوو لەسەر رێبازی رێگای عەسکەرییانەدا. تا

کودەتاچیەکانی هەشتی شوباتی رەشی شووم هەلەکەیان قۆستەوە و شۆڕشی ١٤ / گەلاوێژی پێشکەوتن خوازیان سەرنگوم کردو عبدالکریم خۆی و پۆلە ئەفسەرێکی نیشتمان پەروەری دڵسۆزیان بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە و بەدادگایی کردنی سەختەکاری روکەشانە گوللە باران کردو بزافی دیموکراتخوازی عێراقیان لە ناو گۆمی خوێندا نقوم کرد دوای ماوەیەکی کورتیش پەلاماری کوردستانیان دایەوبە شێوەیەکی نامرۆڤانەی دڕندانە کوردستانیان وێران کرد .

بەم شێوەیە دەتوانم بڵێم کە عبدالکریم وەکو سەرکردەیەکی سیاسی و بەرێوەبەرێکی کاروباری دەوڵەت سەرکەوتوو نەبوو و نارەزوە نەخۆشەکەی بۆ کورسی حوکمرانی هەلی خزاندە سەر رێبازی تاکرەوی و لە پرنسیپەکانی دیموکراتی دوورکەوتەوەو نەیتوانی ئەو ململانێیە توندو ئالۆزە دژی ئیمپریالیزم ز کۆمپانیاکانی نەوت و کۆنەپەرستی ناسیونالیزمی عەرەبی کوێرانە سەرکەوتوانە بەرێوە ببات.

فتاح توفیق (ملاحسن)

٢٠٠٥/٥/٢٢

**ليس الكورد اقلية قومية!!!!!**

كتب الاستاذ كريم مروة مقالا ، نشر في العدد الاول سنة / سبعين بتاريخ ٧/اب/ ٢٠٠٤ في جريدة طريق الشعب٠ بعنوان القومية العربية والاقليات القومية العراق مثالا٠ تطرق الى معاناة شعبنا الكوردي في العراق٠ من قبل القومية الكبيرة اي القومية العربية واكد بان هذه القومية الكبيرة (لم تستطيع ان تتعامل بشكل صحيح مع الاقليات القومية في بلدانها)

انا احترم الاستاذ كريم مروة كثيرا باعتباره كاتبا تقدميا ماركسيا و اهتم جدا بما يكتب٠ وقد حظيت مرة بلقائه في مقر اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي في شقلاوة عندما جاء الى كوردستان ضمن وفد من المثقفين والكتاب العرب للاطلاع عن كثب على تجربة شعبنا٠ وشكره على دفاعه عن شعبنا الكوردي في المقال المشار اليه اعلاه، وكذلك في مقالته الطويلة بعد عودته الى لبنان والتى كانت بصدد الدفاع عن شعبنا الكوردستاني وخاصة المناطق التي كانت الى ذلك الحين ، تحت سيطرة النظام الدكتاتوري الفاشي في بغداد٠

ولكن هذا الاحترام والشكر لم يمنعاني من مناقشة بعض افكاره التي وردت في المقال الانف الذكر٠ ةخاصة اعتباره الكرد في العراق اقلية قومية فقد ورد في نص هذا المقال (الا ان المشكلة في العراق لا تنحصر في الاكراد٠ بل هي تشمل جميع الاقليات القوميى من تركمان وكلدان وشركس ويزيديين وصابئة لكن الاكراد هم من الاقدم ةالاكثر عراقة في تاريخ المنطقة كلها٠ والاكثر عددا بالنسبة للاخرين من الاقليات في العراق) ففي هذه الفقرة يعتبر الكرداقلية

قومية الى جانب مجموعة من الاقليات ليس للبعض وجود في العراق مثل الشركس • ويبدو ان الاستاذ كريم مروة يرى ان هذه الاقليات لا تتمتع بحق التعبير عن ذاتها وعن هويتها الثقافية والقومية• فقد ورد في بالنص ( بل حتى فيما هو ابسط حق هذه الاقليات بان تعتبر بحرية عن ذاتها• عن هوتها الثقافية والقومية)• اود ان اذكر الاستاذ كريم بان الكرد في العراق يشكلون امة ولهم جميع مقومات اىمة بموجب الصفات والمميزات التي حددها المارئسية – اللنينة التي يؤمن بها الاستاذ• وهو اقلية قومية بل امة كاملة المواصفات • وان هذا ليس راي الشخصي بل ان الكونفراس الثاني للحزب الشيوعي العراقي الذي عقد في سنة / ١٩٥٦ قبل ما يقارب نصف قرن • قد اقر بان الكرد يشكلون امة• ولهذا يحق لهم تقرير مصيريهم بانفوسهم وتقرير المصير يعني ام الاتحاد الاختياري مع شعب العربي في العراق واما الانفصال وتشكيل دولة مستقلة • وقد اختار الكرد بموجب قرار البرلماني الكردستاني في ٤/ تشرين الاول / ١٩٩٢ الحل الاول وهو الاتحاد الاختياري في ظل دولة ديموقراطية في العراق • ومنذ سقوط صدام حسين الدكتاتوري في سنة الماضية ، يناضل الشعب الكردستاني وقواه السياسية في سبيل تثبيت هذا الحق• ولكن مما يؤسف له لحد الان لم يثبت هذا الحق بصورة قانونية و لم يتم تطبيقه في عراق ما بعد الدكتاتورية بشكل واضح • ان اقلية قومية تعبير سياسي يعني به القومية التي ليس لها وتعيش على وطن قومية اخرى• وهذا ما تريد الاحزاب القومية العربية تطبيقه على الامة الكردية في العراق • باعتبارها اقلية قومية تعيش على ارض وطن شعب او امة اخرى وهي حسن نظريتهم القومية العربية • في حين تؤكد جميع الوثائق التارخية بان الشعب الكردي عاش على ارض وطنه كردستان منذ

الاف السنين وحتى قبل الوصول الاخوة العرب الى جنوب ووسط العراق • واحب مرة اخرى ان اذكر الاستاذ الكبير كريم مروة بان احدى احتماعات الاحزاب الشيوعية في البلدان العربية في اواسط الثمانينات القرن الماضي اقرت حق التقرير المصير للامة الكردية في العراق ومعرف ان حق التقرير المصير خاص بالامم وليسللاقليات القومية هذا الحق لكونها لاتملك وطناتمارس عليه حق التقرير المصير • واود ان اشير الى ان الامة الكردية في العراق لها منذ اكثر من عشر سنوات حزب شيوعي مستقل وبموافقةحزب الشيوعي العراقي، باعتبارها امة ولها قضية قومية يجب حلها بموجب قرارات الامم المتحدة التي ايضا تعترف بحق التقرير المصير لجميع الامم كبيرها وصغيريها • وللعلم فان الشعب الكردستانفي العراق جزء من الامة الكردية المجزاة باضد من ارادتها وان كردستان المقسمة بين دول هي وطنالامة الكردية•

ولدي ملاحظة اخرى على مقال الاستاذ كريم مروة وهي اعتباره الايزديين حين الايزدية جزء من الامة الكردية وهم اقلية دينية وليس اقلية قومية كما ذهب اليه الاستاذ الكبير • وان ذكره لبعض الاقليات القومية كالشركس مثلا ليس دقيقا فليس في العراق اقلية باسم الشركس بل هناك اقلية عددية باسم الاشوريين الذين هم والكلدان من شعوب بلاد ما بين النهرين الاصلاء•

وفي الختام ارجو للاستاذ كريم مروة العمر المديد والانتاج الوفير في مجال الكتابة والتاليف والدفاع عن المظلومين في البلدان العربية وفي مقدمتهم الامة الكردية التي لاقت اضطهادا قوميا بشكل وصل الى درجة ابادة الجنس في العراق على يد النظام البائدولم يلق اي انصاف من جانب المفكرين والكتاب العرب حتى هذا اليوم الا حق من قبل عدد قليل منهم واحو ان يكون الكاتب الكبير قد اعتبره

الاكراد اقلية عددية في العراق وليس التعبير السياسي الذي يعني بالاقلية القومية التي ليس لها وطن خاص بها٠

فتاح توفيق(ملاحسن)
٢٠٠٤/٩/١١

## متى يتم معالجة قضية تعريب كردستان ؟!!!!

لايخفى على احد من ابناء الشعب العراقي بكرده وعربه وقومياته الاخرى بان رالنظام الدكتاتوري المقبور، قد مارس سياسة تعريب مناطق واسعة من كردستان الى جانب سياسة التطهير القومي٠ وخاصة في محافظة كركوك واقضية خانقين و مندلي وجلولاء وسعدية في محافظة ديالى ، بالاضافة الى اقضية شيخان وسنجار وبعض النواحي التابعة لمحافظة الموصل ، حتى وصل الامر بالنظام الى تعريب قضاء مخمور في محافظة اربيل٠ واتبع اسليب بشعة في اجبار الاكراد على التخلي عن قوميتهم الكوردية، وشمل التعريب والتطهير العرقي ابناء القومية التركمانية والكلدو – اشورية٠ من نافلة القول ان الاستلاء على بيوت ةالاموال المنقولة وغير المنقولةربناء اية قومية، واكرههم على تغير قومتهم ٠ جريمة انسانية لا تغتفر وتعتبر جريمة دولية تتحمل هيئة الامم المتحدة و مجلس الامن لمعالجة الاثار المدحرة لهذه الجريمة النكراء٠ لان العيش في موطن اية قومية وامتلاك المباني والارضي الشخصية حق طبيعي من حقوق اي انسان٠ وقد نصة عدد القوانين و قرارات هيئة الامم المتحدة على صيانة هذه الحقوق كونها ضمن ما يعرف بحقوق الانسان٠ وفي حالةقيام اية حكومة او جهة متنفذة يخرق هذه القرارات٠ فان من واجب هذه الهيئة و خاصة مجلس الامن استنكار هذا الخرق بشدة وفضحة ومن ثم معالجة اثارة عندما تتوفر الظروف الملائمة لمعالجة و بالسرعة الممكنة٠ وبعد ان تم اسقاط النظام الدكتانوري الفاشي قبل اكثر من عام توفرت فرصة سانحة لسلطة التحالف، ان تقوم بمعالجة هذه الجريمة الدولية التي لا مثيل لها عصرنا٠ التي توصف من قبل دول التحالف وغيرهم بانه عصر المجتمع المدني وحقوق الانسان والديموقراطية ةتحرر

الشعوب المضطهرة • فاين موقف صلطة التحالف من هذه الادعاءات التي لا تكف عن نشرها ليل نهار • فبعد ثلاثة عشرة شهرا على سقوط النظام لم يجر معالجة اثار التعريب في كردستان الا على نطاق ضيق جدا، ولاتزال العوائل التي جلبها النظام من وسط وجنوب العراق واسكنتها عنوة على ارضي كردستان و التركمان في نفس مدينة كركوك واطرافها وفي القصبات الاخرى وريفها• تعيش في بيت الاكراد والتركمان او في البيوت التي بنتها لهم النظام المباد على ارض كردستان وعلى حساب اموال الشعب العراقي•

في الوقت الذي كان يعاني ابناء العرب والطرد و التركمان والكلدو – اشوريين من جوع حقيقي ويرى بام عنينة كيف تصرف موارد النفط المستخرجة من اراضي ابائه واجداده على شراء الاسلحة المحرمة دوليا وعلى مرتزقة النظام من الداخل والخارج•

ويبدوا ان ابناء كركوك واطرافها الذين شردوا من مناطق سكانهم وتمت مصادر املاكهم وبيتهم واراضهم الزراعية ومياههم العزبة قد ملكهم اتلياس من عدم مبادرة سلطة التحالف ومن عدم الحاح مجلس الحكم على الاسراغ في معالجة اثار اثار التعرف ةهمت مجلس الامن عن هذه الجريمة التي لها اثار نفسية سيئة ليس لدى كبيرة من ابناء شعبنا الكردستاني الذين كانوا شهودا على مالاقاه اعداد كبيرة من ابناء جلدتهم من غذاب جسدي ومشاكل الحياة والسكن بعد ترحيلهم عنوة اما الى الصحاري الجنوبية والى كردستان دون ان تقدم اية مساعدة لهم تعينهم على العيش – اقول بعد ان سيطر عليهم الياس قاموا بتنظيم مظاهرة سلمية في صباح ٥/٥/٢٠٠٤ في مدينة اربيل لان اعدادكبيرة منهم يعيشون في هذه المدينة وضواحها• وتوجه المتظاهرون الى برلمان كردستان وقدموا

اليـه مـذكرة تتـضمن مطـالبهم العادلـة التـي اكـدت علـى الاسـراع باعـادتهم الـى مـدنهم و قـراهم و دفـع مبلـغ ( ٤ )الاف دولار لكـل عائلـة كـسلفة لكـي يبنـوا مـساكنهم. كمـا طالبـت المـذكرة اعـادت الموظفين والعمـال الاكراد الذين فصلوا من وضـائفهم بغض النظر عن انتماء اتيهم السياسية واعادة من تم توظيفهم في منـاطق كردستان الاخرى الى كركوك واطرافها. وقد قابلهم ممثلي الكتلـة الصفراء و الخـضراء ووعـدهم بتقـديم مـذكرتهم الـى جهـات المـسوؤلة . وفـي احدى فقرات المذكرة طالبت المتظاهرون بالاسراع في اعـادتهم الـى مـدنهم ومنـاطق سكانهم قبل اجـراء انتخابـات العامـةفي العـراق قبل ٣١/ ١ / ٢٠٠٥ والجـدير بالـذكر ان مجلس الحكـم قـد اصـدر فـي بداية هذه الصفة قرارا بضرورة معالجـة قضية التعريب عن طريق اعادة جميع العوائل الكردية المرحلة قسرا الى منـاطقهم و تعويضهم عن الاضرار التي لحقت بهم جراء هذا الترحيل الاجباري. والعمل علـى اعـادة العوائـل العربيـة التـي جلبهـا النظـام الـى مدينـة كركـوك واطرافها ووزعت عليهم الارضي الاكراد وبيت لهم البيوت واشقق السكنية فـي كركوك وز المدن الاخرى وقدمتلهم مساعدات وهبـات كثيـرة. مـن اجـل تغيـر طبوغرافيـة محافظـة كركـوك والمنــاطق الكردسـتانية الاخـرى. واكـد قـرار مجلـس الحكـم علـى اعـادة تلـك العوائل العربية على حساب الدولة وتقديم قطـع الاراضـي سكنية لهم لكي يبني من ليس لة سكنى بيتا لعائلته و لكن حركـة سلطة التحـالف لتنفذ هذا القرار الكحيم المجلس الحكم بطيئـة جدا ان لم نقل بانهـا معدومة . ونرجوا ان لايكون هذا البطء متعمدا حيث يبدو من بعض تصرفات سلطة التحالف عدم الاعتراف بكردستانية محافظة كركوك و الاقـضية والنـواحي الاخـرى التابعـة لمحافـضة ديالـة و تكريـت و الموصل. لان عدم معالجة هذه القضية الملتهبة بسرعة ممكنة سوف

تكون لها نتائج سلبية جدا على الامن و الاستقرار في اقليم كردستان وعلاقته بالدولة المركزية في بغداد ٠ علية لا يسعنا الا ان نضم صوتنا الى اصوات مرحلي كركوك وغيرها و معالجة هذه المعضلية قبل تسلم السلطة الى العراقيين قبل ٣٠/ حزيران / ٢٠٠٤ كما هو قرار ٠

فتاح توفيق (ملاحسن)
١٠ / ٥ /٢٠٠٤

## متى يتم تفعيل لجنة تطبيع الاوضاع في كركوك؟!!!

ماورد في المادة – ٥٨ - من قانون ادارة الدولة العراقية للفترة الانتقالية يعتبر اساسا جيدا، لمعالجة الوضع الاستثنائي في محافظة كركوك وخاصة في مدينة كركوك٠ ولكن حكومة السيد علاوي اهملة هذه المادة ولم تقم باية خطوة ايجابية لتطبيع الوضع في هذه المدينة واطرافها٠ وقبل اجراء الانتخابات في العام الحالي يوم ٣٠ / كانون الثاني / ٢٠٠٥ هددت الاحزاب الكردستانية بمقاطعة الانتخابات التي تجري انتخاب اعضاء مجلس محافظة كركوك ، اذا لم تبادر الحكومة بتطبيع الاوضاع في كركوك٠ وعلى اثر ذلك جرت تدخلات من جهات المعنية من اجل معالجة هذه المفضلة الدستورية٠ وقام وفد كوردي على مستوى عال بزيارة بغداد ، وتم التوصل الى اعطاء وعود مكتوبة من قبل جهات عديدة بتطبيع الاوضاع في كركوك بعد اجراء الانتخابات ، وبنا على ذلك وافقت الاطراف الكردستانية على مشاركة في انتخاب مجلس محافضة كركوك٠

وقد جرت الانتخابات في موعدها وحازت قائمة التاخي الكردستاني على معضو مقاعد هذا المجلس٠ وبعد تاخر طويل عقدت الجمعية الوطنية العراقية اولى جلستها فؤ اةائل شهر نيسان الفائت وتم انتخاب رئيس الجمهورية و نائبيه، وبعد فترة حازت وزارة السيد ابراهم الحعفري على ثقة الجمعية الوطنية٠ وقبل ايام قدمت البرنامج الوزاري للحكومة وكان ابناء الشعب الكردستاني ينتظرون ان يشمل هذا البرنامج تطبييع الاوضاع في كركوك٠ وتفعيل اللجنة التي كانت قد شكلت برئلاسة حميد مجيد موسى وتوضع تحت تصرف هذه اللجنة الامكانات المالية وغيرها لكي تباشر عملها٠ ولكن مع الاسف لم يرد في اتلبرنامج الذي قدمه السيد الجهفري امام الجمعية الوطنية ما يشير الى تفعيل هذه الجنة مع اعلان التزامه ب(قانون ادارة الدولة الموقتة) ٠ وقد اثار ذلك ردود افعال سلبية

على ذلك، خاصة بعد صدور تصريحات سلبية من بعض المسؤلين٠ لذا يشعر شعبنا الكردستاني بقلق شديدعلى مستقبل كركوك٠ والان وبعد مضي اكثر من شهر على تشكيل وزارة السيد الجعفري، من المفروض ان يتم تفعيل لجنة تطبيعالاوضاع في كركوك وتوضع تحت تصرف كل الامكانات الضرورية لمباشرة في عملها، وهي ليست بالمهمة السهلة بل تحتاج الى جهود كبير٠ وتنتظر ان يعترض عملها كثير من المشاكل و العقبات٠ لان هناك جهات متعددة سياسية وغير سياسية لاتريد اعادة تطبيع الاوضاع في هذه المدينة واطرافها٠ ولكن لايمكن ان يعود الامن والاستقرار الى هذه المحافظة بصورة عامة و مدينة كركوك بصورة خاصة، اذا لم يتم تطبيع الاوضاع فيها٠ وفي المادة – ٥٨ – من قانون ادارة الدولة المؤقتة برنامج واضح لتطبيع الاوضاع٠ هذانا ناحية اما من ناحية اخرى فان ازالة النتائج السياسية العنصرية التي اتبعها النظام الدكتاتوري السابق، اصبحة مسالة وطنية وانسانية من الدرجة الاولى ٠ وكان من المفروض معالجتها في فترة مجلس الحكم او على الاقل في الفترة التي كانت حكومة السيد علاوي تدير الاعمال البلاد٠ وحاليا يجب معالجتها قبل اجراء الاستفتاء على الدستور الدائم واجراء الانتخابات في نهاية هذا العام٠ لان ابناء الشعبين الكردي والتركماني قد تجمل كثيرا جراء السياسة الموعلة في الشةفينية في كركوك وغيرها من مناطق كردستان حيث طبق النظام وباكثرالاساليب بربرية ودموية سياسة التعريب القسري والتطهير العرقي امام انظار الراي العام العربي ةالاسلامي والدولي ، الذي ظل ساكنا عن الجرائم البشعة٠ ومما يؤسف له فان هناك ايضا ولحد الان اطرافا سياسية عراقية وجهات عربية ودولية تحاول الابقاء على هذا الوضع الماساوي٠ ولايدلهذا الاعلى التواطوءمع بقايا النظام الدكتاتوري ، التس تبذل قصاري جهودها لاعادة عجلة التاريخ الى الوراء٠

